رۆمان

# گێلەپیاو



عەزیز نەسین

وەرگێڕانی :کامیل محمد

چاپی چوارەم



**پێناسی کتێب**

**ناوی کتێب: گێلە پیاو**

**نووسینی: عەزیز نەسین**

**وەرگێڕانی: کامیل محمد قادر**

**بابەت: ڕۆمان**

**دیزاینی بەرگ: ئیبراهیم ساڵح**

**چاپخانە: چوارچرا**

**ژمارەی دانە: ١٠٠٠ دانە**

**ساڵی چاپ: چاپی چوارەم ٢٠١٨**

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە سپاردنی (١٧٨١) ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە**

**پێشکەشە بە:-**

* بەدایکی خۆشەویستم کە ژیان جگە لەماندو بوون و نەهامەتی هیچی دیکەی پێ نەدا.

* بەهاوسەرو منداڵەکانم، کە لەئێستادا خۆشی ئەبەخشن بەژیانم.

* بەهاوڕێیانی سەردەمی منداڵیم، کە بە بینینیان دڵم ئەکەشێتەوە.

* بەهەموو ئەوانەی خوێنەری کتێبەکانی نەسینن و نەسینیان خۆش ئەوێ.

با زۆر لەسەر ئەوە نەچین چۆن کەوتمە بەندیخانەوە، هەر چۆنێ بوو قۆڵبەست کرامو تا بەخۆمدا هاتمەوە بە پلیکانەکاندا دەیانبردمە خوارەوە. بەدەم ئاخو ئۆفکردنەوە وێنەیان گرتمو پەنجە مۆریان پێ کردم، پاشان وەك زەرفی زبڵ کە ژنان لەبەر دەرگا دەیدەنە دەستی زبڵڕێژی کۆڵان بەندەیان هاویشتە زیندانەوە!

نازانم ئێوەش ئەم دیمەنتان دیتوە؟ جاران منداڵی لاسارو بزێو پشیلەیەکیان دەهاویشتە نێو تورەکەیەكو ماوەیەك بە حەوادا هەڵیان دەسوڕاند، پاشان پشیلەیان لەتورکەکە دەردەهێنا مشکێکیان لەبەردەمی دادەنا، پشیلەی بەستەزمان هێندە وڕو گێژ بوو تا ماوەیەك مشکەکەی بەدی نەدەکردو ئاگای لێی نەدەبوو!!

ئەو رۆژەی چوومە دالانی زیندانەوە کتومت خۆمم وەك ئەو پشیلەیە دەهاتە بەرچاو، هێندە وڕو کاس بووم تەنانەت قسەی ئەو دوو سێ کەسەی لەدەورم بوونو دڵنەواییان دەکردم نەدەبیست.

بەڵام چونکە بنیادەم لەهەمبەر ڕووداوەکاندا گەلێ نەرمەو خێرا چۆك دادەدا، منیش خێراتر لەوەی بیرم لێ دەکردەوە گۆڕانکاریم بەسەردا هات.

بەتایبەت ڕوداوێك هاتە پێش بەو ڕوداوە زیاتر گۆڕام.

نوقمی خەمو پەژارەو دەردی خۆم بووم، وەك منداڵی هەتیو دەستەو ئەژنۆ ماتو مەلول لەپڕ هەراو زەنا لەدالانەکە بڵند بوو، زۆرێك لەزیندانیان بەرەو دەرگای دەرەوە ملیان دەنا. هەندێکیان بەپێکەنینو گاڵتەو گەپ، هەندێکی دیکەیان بەتوانجو پلارەوە شتێکیان دەوت،

لەنێوانیاندا من وشەی "گێل، گەمژە" تێگەیشتم، دەرکەوت زیندانیەکی نوێ دێنن کە بەزۆربەی زیندانیەکانی ئەوێ ئاشنایەو هەریەکەو شتێ دەڵێ:

- کوڕینە "گێل" یان هێنا.

- ئۆووی، بڕوانە سەرو سیمای!

- بۆتە چ کەسێك!

- هێشتا پێخەفەکەی کۆ نەکراوەتەوە گەڕایەوە!

- بەمە دەڵێن پیاوی تەواو!

- سەیری کاکی ئەندازیاری ساختەچی!

خەمو مەراقی خۆم بیر چۆوە، منیش وەك ئەوان چوومە بەر دەرگا، چاوەڕێ بووم تا بزانم ئەم "گێلە"ی وا ئەمانە هەستی خۆیانی بۆ دەردەبڕن باشتر ببینم.

" سولەیمان دایکی خۆفرۆش" بەدەنگێکی پڕ لە توانجەوە وتی:

- با بزانین ئەم جارە چی کردووە!

"مراد ورچ خنکێن" لەدواوە وەڵامی دایەوە:

- یان بۆتە قایمقام! یان خۆی کردۆتە پارێزگار!

"گێلە" هێشتا نەگەیبوە جێ‌و "باوە زەکەریا" خەریکی پشکنینی گیرفانەکانی بوو، بەتوانجێکەوە وتی:

- سەگباب، کوێرا ڕۆشتی کوێرا گەڕایتەوە؟

"گێلە" بەو نالەبارییە تایبەتیەی خۆیەوە قاقایەکی کێشا:

- بەخوا ناتوانم بەرگەی دوریی ئێوە بگرم!!

یەکێ لەمەئمورەکان لە پشتی مێزەکەیەوە قیڕاندی:

- بلیتی هەردوو سەری کڕی بوو!

"باوە زەکەریا" پشکنینەکەی تەواو کرد. کاتێ کیفی پارەکەی کردەوە

بەمۆڕەیەکەوە وتی:

– ئەمە هەمووی سەد لیرەو دە پانزە قروشێکە!

– هەر ئەوەندەیە.

– کوڕی سەگ، ئەویتریت لەکوێ حەشار داوە؟

– بەخوا هەر هێندەیە.

– دیارە ئەمجارە هیچت بۆ لەداو نەکەوتووە!

"باوە زەکەریا" کیفی پارەکەی دایەوە دەست گێلەو بردییە ژوورەوە!

گەر کەسێ ئاشنای گێلە نەبوایە دەیوت پیاوێکی تەواو پیاوە. بەپاڵتۆیەکی توکی وشترو دەسکێشی چەرمو چاکەتو پانتۆڵی ڕەشو جوتێ پێڵاوی بریقەدارەوە هەر لە ملیۆنێرەکان دەچوو.

هەر کەچوە ژووری بەندیخانەوە لەگەڵ هەموو کوڕەکان تەوقەو هەواڵپرسی کردو پاشان وەکو کەسێکی خانەخوێ، ڕێك چوە ژوورەوەو جلەکانی لەبەر خۆی داکەندو چوە حەمام!!

منیش هەروا لەقوژبنێك دانیشتبوومو لەم دیمەنەم دەڕوانی، گەلێ ئارەزووم بوو بزانم بۆ بەم بنیادەمە دەڵێن گێلە، بەلام سەرم لێ دەرنەدەکرد.

گێلە وەك زاوایەکی لادێیی بەساف و لوسییەکەوە لەحەمام هاتە دەرەوە، لەکاتێکا بەئاماژەی سەر لەقاندن هەواڵپرسی لەکوڕەکان دەکرد ڕێکەو ڕاست بەرەو چایخانەی زیندان ڕۆشت. وەکو موگناتیسێ ڕامکێشێ لەخۆمەوە بەرەو چایخانەکە ڕۆشتم، گێلە لەکۆڕی کوڕەکاندا دانیشتبوو، سەری قنج ڕاگرتبوو بەویقارێکی تایبەتی خۆیەوە چای دەخواردەوەو چیرۆکی دوو سێ ڕۆژی ئازاد بونەکەی خۆی بۆ دەگێڕانەوە. لەپڕ چاوی بەمن کەوت نازانم چی لەمندا بەدی کرد بەڕیتمێکی تایبەتو ئەدەبێکەوە بانگی کرد:

– کاکە فەرموونە ئێرە.

هەموو زیندانیان لێم ورد بوونەوە، منیش وەکو منالْ غەریبیم دەکرد لەسوچێکەوە وەستا بووم دەستو پێی خۆم وون کردبوو. گێلە قایمتر وتی:

– فەرموو، کاکە! لێرە هەموو برای یەکترین... تەشریف بفەرموو... بۆچی غەریبی دەکەی؟

ویستم بگەڕێمەوە بۆ شوێنەکەی خۆم، بەڵام کوڕەکان دەستیان گرتمو بردمیانە بەردەمی گێلە. بەڕیتمێکی فەرماندەرانە قیڕاندی:

– قەدری، چایەکی جوانی بۆ بێنە.

پاشان ڕوی تێکردم.

– تۆ تازە هاتویتە ئێرە؟

بەهێمنی وەڵامم دایەوە:

– بە...لیّ!

یەکێ لەکوڕەکان بە پێکەنینەوە وتی:

– هێشتا نمەکی زیندانی نەکردووە!

کوڕەکان پێکەنینو گێلەش بەچاوە بچوکەکانی مۆڕەیەکی لیّ کردنو لیّی پرسیم:

– ئیشتان چییە؟

من بێدەنگ بووم، یەکێکی دیکە وەڵامی دایەوە.

– ڕۆژنامە نوسە!

گێلە، بە چاوێکی کڕیارانەوە سەرتاپامی تەنیو پاشان لەگەڵ ئەوان سەرگەرمی قسە کردن بوو.

کاتی نانی شێوان، گێلە بردمیە ژوورەکەی خۆیو دوو بەتانیو سەرینێکی لەهاوڕێکانی بۆ وەرگرتم.

بەکورتی هێندە دڵنەوایی کردم کە ئێش و ئازاری زیندانم لەبیر چوەوە. کاتێ دوو جگەرەی شازو بۆنخۆشی داگیرسان دانەیەکی دایە دەستم، منیش خێرا پرسیم:

– تۆ بۆچی زیندانی کراویت؟

– لەسەر "کوتێل"[١] گیراووم!؟

من واق بووم، گێلە دایە قاقای پێکەنین و وتی:

– بەڕاستیمە، هەموو بەدبەختی و چارە ڕەشیم لەچەن تیکەیەك "کوتێل"ەوە دەستی پێکرد!

دەمێکە تۆڵەی ئەو کوتێلەم لێ دەکرێتەوە. پێنج شەش ساڵێکە خۆم ونکردوە و هەر ڕۆژو هەر هەفتەیەك لەکەوڵێکدا دەر ئەکەوم. ئێستەش لەگەڵ تۆ دانیشتووم خۆیشم نازانم من کێم. ڕۆژێ بوومە پشکنەر، دەمێ بوومە پزیشك، ماوەیەك ئەندازیار، بەکورتی هەرچی تۆ بڵێی بوومە ئەوە بێجگە لەخۆم. گەر کەسێ لەپشتمەوە بانگم بکا عەلی، ئەحمەد، محمەد، حەسەن. من وادەزانم لەگەڵ منیەتی چونکە سەد ناوم هەیە.

بەواق بونێکەوە وتم:

– یانی چی!؟

– وەڵامی ئەم پرسیارەی تۆ گەلێ قورسەو دەبێ پێشەکیەکی درێژی بۆ ساز بکرێ، بەکورتی چارەنوس بنیادەم ژێرەو زەبەر دەکا. کەس نازانێ سبەی چی لێ بەسەر دێ، بزانە بەڕێگەیەکدا ڕێ دەکەین. لە پڕ قاچمان لەبەردێك هەڵدەنوتێ یان دەکەوینە جۆگەیەك هەرئەمەش وادەکا لەکارەساتێکی گەورە پارێزراو بین، بەیانی لەماڵ دەردەچین و دوای یەکێ لەکارەکانی خۆمان دەکەوین، لەڕێگا توشمان دەبێ بەتوشی برادەرێك و دەمانباتە جێیەك لەوێ عاشقی کچێکی جوان دەبین و

---

[١] کوتێل: تێکەڵەی گۆشتی قیمەو پەتاتە، وەك شفتە لەڕۆندا سوور دەکرێتەوە.... و

زەماوەندی لەگەڵ دەكەین. بە بڕوای تۆ دەكرێ چی بەم شتە بوترێ، ها، گەر قاچمان لە بەردەكە هەڵنەكەوتبایەو نەكەوتینایەتە جۆگەی ئاوەكەو ئەو برادەرەمان نەدیتبایە ژیانمان شەقڵێكی دیكەی دەگرت.

بەسەرهاتی منیش وێنەی یەكێ لەم شتانەیە، كە لەبەر خواردنی چەن دانەیەك كوتێل ڕەوتی ژیانی گۆڕیم.

لەم پێشەكیە خەریك بوو بێزار دەبووم، حەزم دەكرد زووتر بەسەرهاتی خۆی بگێڕێتەوە!

گێلە مژێكی بەكوڵی لە جگەرەكەیداو وتی:

– ئەو سەردەمە من قوتابی ناوەندی سەربازیی بووم.

لەپڕ بێدەنگ بوو، چاوی بڕییە بنمیچەكە، سیمای دەریدەخست لە بیركەوتنەوەی ئەو یادەوەرییە گەلێ ئازار دەكێشێ، هەناسەیەكی هەڵكێشاو بەهێمنی وتی:

– لەو ماوەیەدا چیم بەسەر هات و لەكوێوە هاتمە كوێ. بەداخەوە گەنجی و هەرزەكاریی داوێنگیرم بوو. بەدەستی خۆم قوڕم كرد بەسەر خۆمدا، گەر بزانی لە قوتابخانە چەن قوتابیەكی زیرەك بووم، هەموو ساڵێ یەكەم یان دووهەم دەبووم، لەوەرزشدا بێ وێنە بووم، كۆتا ساڵم بوو، دوای مانگ و نیوێك دەچوومە كۆلێژی سەربازیی.

ئەو دەمە نۆبە ئێشكمان هەبوو، هەر شەوەی یەكێ لەقوتابیەكان دەبوو ئێشكچی بێت، یەكێ لەئەركەكانی ئێشكچی چاودێری دابەشكردنی خۆراك بوو، هەركاتێ بەرنامەی خواردنێكی خۆش لەئارادا بوایە هەرچۆنێ بوایە هەوڵمان دەدا یەكێ لەهاوڕێكانمان ئێشكچی بێت.

لەنێوماندا یەكێ هەبوو بەناوی "چنگڵ شاهین" هەر كاتێ نۆبە ئێشكی ئەو بوایە هەمومانی تێر دەكرد، بەڵام من بەپێچەوانەی هەموو كوڕەكانەوە لەم بەشەدا بێ دەسەڵات بووم. هەركاتێ ویستبام قاپێ

چێشت لە ئاشپەزخانە لوش بدەم، هێندە دەپەشۆکام و ڕەنگم تێک دەچوو ئارەق بەگازەرەی پشتمدا دەهاتە خوارەوە، هەر بۆیە هەموو کوڕەکان ناویان نابووم گێلە، هەرکاتێ تاقەتیان هەبوایە سەریان دەخستە سەرم و پێیان ڕادەبواردم. شەوان کاتی خەوتن یەکێ بەتانی لێ دەفڕاندم و یەکێ شۆرتی لەپێم دادەکەند، بورهان شەیپور گوپی پڕ لە ئاو دەکرد و دەیپرژاندە سەرو چاوم. بەکورتی هێندە ئازارییان دەدام، بڕیارمدا منیش وەک ئەوان بکەم. شەوێکیان کە نۆبە ئێشکی من بوو کوڕەکان زۆریان لێ کردم لەئاشپەزخانە خواردنی زیادەیان بۆ بێنم.

ئەمەش هەمان ئەو کارە بوو، کە من لێی دەترسام وتم:

– کوڕینە ئەمشەو "هەقی باڵیۆز" ئەفسەری ئێشکەو ناتوانم ئەوە بکەم، بێت و بزانێ باو باپیرم لەگۆڕ دەردێنێ.

بەڵام، ئەوان لێم نەگەڕان "هەرکەسە کەیفی خۆتە"

"ئەگەر دەترسی قسە بکە."

سەرەنجام ڕۆنیان دا لەبن پێم و دەشمزانی هەقی باڵیۆز پیاوێکی سەختگیرو ناڕەسەنە، هەرچۆن بوو چووم بەرەو ئاشپەزخانە. هەقی باڵیۆز لەو ئەفسەرە قەدیمانە بوو هەرچەن خوێنەوارییەکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام چونکە پیاوێکی کردەو بەئەزمون بوو، هەموو کوڕەکان وەکو سەگ لێی تۆقی بوون.

ڕوخسارێکی سەیری هەبوو، لەسەر ڕومەتی کۆنە برینێکی گەورە هەبوو، دەموچاوی بەسامتر کردبوو، لەئاکاری ناشیرین بەتایبەت قاقا لێدانی قوتابیەکان زۆر ڕقی هەڵدەسا. هەمیشە ئامۆژگاری دەکردین:

"سەرباز دەبێ هەمیشە نێوچەوانی سێبەر بکات."

ئەو هیچ کاتێ لەقوتابیەکانی نەئەدا، بەڵام وای بەحاڵێ ئەو کەسەی لێی تورە بوایە. ساڵێ دوسێ کەڕەت حاڵەتی توڕەبونەکەی دەگرت،

هەرکەسێکیش بکەوتبایەتە بەر ڕق و قینی ئەوا ئازای ئەنامی دەشکاند.

جارێکیان بورهان شەیپوری، کەوتە بەر فەلاقە، داماوە وەکو تۆپ لەم دیوار بۆ ئەو دیوار هەڵدەبەزییەوە، کاتێ کەوتەوە سەر زەوی تا ماوەیەك هۆشی نەبوو.

بۆچی ئەم هاوڕێیەت ناوی بورهان شەیپوری بوو؟

گێلە بەدەنگێکی بەرز پێکەنی وتی:

هەر یەکێ لەئێمە ناوێکی هەبوو، هەرناوێك و هۆکاری تایبەتی خۆی هەبوو. بورهان شەیپوریش هەمیشە گوێ قوڵاغی شەیپوری نانخواردن بوو.

وچانێکی گرت و وتی:

ئەفسەرەکەمان شتێکی باشی هەبوو، ئەویش تەمبێی هەر کەسێکی بکردبایە لەکۆتایی ساڵدا بەهەر فێڵ و تەڵەکەیەك بوایە لەتاقیکردنەوە دەریدەچاند، بەم کارەش هەقی تێ هەڵدان و فەلاقە کردنەکەی بۆ دەکردەوە.

"ساڵح شەمع" لەدەرسی جەبردا تەممەڵ بوو، هەمیشە سەری دەخستە سەر جەنابی ئەفسەر تاکو فەلاقەیەکی بکات و لەتاقیکردنەوەدا دەری بهێنێ بەڵام هەقی بالیوس فێڵی لێ نەدەکرا. ساڵح شەمع لەدواوە خۆی لێ حەشار دەداو وەکو کارژەلە دەیباڕاند، بەڵکو ئەفسەر تووڕە بێ، بەڵام ئەو هیچ گوێی پێ نەدەدا.

ڕۆژێکیان ئەفسەر تووڕە بوو، ساڵح شەمع لەخۆشیدا حاڵی نەبوو. وابزانێ ئیسلە لێدانێ ئەخوات و سەری ساڵ دەرچونی مسۆگەر دەبێ. بەڵام ئەفسەر ئەمجارەش لێی نەدا. گوێچکەی گرت و بردییە ئەمبارەکەو دەرگای لەسەر داخست، ئێمە هەموو لەو دیوی دەرگاوە وەستابوین دەمانویست بزانین چ باسە؟

بچوکترین دەنگی لێوە نەدەهات، یەکێ لەکوڕەکان وتی: "پێم وایە کوشتی."

پاش چەن خولەکێ سالْح هاتە دەرەوە، چاوەکانی هەڵاوسا بوون، لێمان پرسی چی بووە؟ بەدەم گریانەوە وتی:

"هەرچیم کردو کۆشام لێی نەدام."

گێلە دوو جگەرەی دیکەی پێکرد:

– بەم خەسڵەتانەی باسم کرد، دەربارەی ئەم ئەفسەرەو بۆ بەدبەختیم ئێشك گرتنی من کەوتبویە ئەو شەوەی ئەو ئەفسەری ئێشککگر بوو. ئەگەر دەیزانی من لە ئاشپەزخانە خواردنی زیادە لوش دەدەم، قوڕی دەکرد بەسەرمدا.

بەڵام چارەیەك نەبوو، نۆبە ئێشکم وەرگرت، هاو ئێشکەکەم گەنجێ بوو بەناوی "بەصری کەتفی" بۆیە ئەو ناوەمان لێ نابوو چونکە لەکاتی توڕەبوندا شانی چەپی هەڵدەتەکان. بەصری کەتفی یەکێ بوو لەتەمەڵ و تەوەزەلەکانی زەمانە، هەر چۆنێ بوو ژوورەکانمان خاوێن کردەوە، بڕیارماندا ئەو ئاگای لە بەشی ناوخۆیی بێت منیش خەریکی ئاشپەزخانە بم لە بارتەقایدا من شەش دانە کوتولە سەرانەی پێ بدەم و لەسەر ئەمە ڕێکەوتین، هەر کەسەمان چوینە سەر کاری خۆمان.

وەك دەڵێن هەرچی دارو بەردە بۆ پیاوی لارو شەلە، هێشتا خۆر نەنیشتبوو دنیا تاریکی نەکردبوو هەواڵیان هێنا یەکێ لەئەفسەرە گەورەکان هاتووە بۆ پشکنین.

بەپەلە کوڕەکان چونەوە پۆلەکانیان، منیش گەڕامەوە ئاشپەزخانە، ئەو ئەفسەرە گەورەیە لەپایتەختەوە هاتبوو، چونکە زۆر ماندوو بوو، هەروا بە سەر پێوە چاوێکی خشاندو بڕیار درا ئەو شەوە پشوو بدات و سبەی پشکنینەکانی تەواو بکات.

کەمال زەنگۆڵە هاتە لام وتی:

– دەزانی مارشاڵ چەن لەتۆ دەچێ، سەرەتا باوەڕم نەکرد، بەڵام دوایی کە شاهین و بورهان شەیپورو چەن برادەرێکی دیکە دانیان بەوەدا نا زانیم پێم ڕانابوێرن.

تەنانەت یەکێ لەئەفسەرەکان لێی پرسیم: تۆ خزمامەیەتیت لەگەڵ مارشاڵ هەیە؟ ئەم قسانەش هێندە دوودڵیان کردم، حەزم دەکرد هەر بەو شەوە بڕۆم مارشاڵ ببینم.

کەڕەنای ئامادەبوون لێدراو هەموو قوتابیان لەحەوشە کۆ بوونەوە.

سەرۆك "تەحسین" ی بانگ کرد.

سەرۆکی ئێشکگرەکان بێنە ئێرە.

من بەپەلە چوومە پێشەوە، وتی: "کارەکانت ڕێك و پێکن؟"

– بەڵێ، گەورەم.

– باشە، خێرا نان ئامادە بکەن.

دوای نانخواردن مەنجەڵێکی پڕ لە کوتولەم هەڵگرت و بەرەو ژووری کوڕەکان بەڕێ کەوتم، دڵنیابووم لەوەی ئەفسەری ئێشك خەوتووە، بەڵام هەر پێشبینیم کرد بەبن دیوارەکەدا دەڕۆشتم دەمویست لەدەرگای ئەودیوی بەشە ناوخۆییەکەوە بچمە ژوورەوە.

ئەم دەرگایە زۆر ڕێگەی هاتوچۆی کوڕەکان نەبوو، بەخەیاڵیشمدا نەدەهات بەو درەنگانەی شەو کەسێکم توش ببێت، بێ ئاگا لەوەی گۆڕینی ئەو ڕێگەیە ڕەوتی ژیانم دەگۆڕێ.

ئەگەر بەهەمان پلیکانەی بەردەمی بالاخانەکەو لای بەشە ناوخۆییەکەوە ڕۆشتبام ئێستە لەجیاتی دزێکی کارامە منیش بۆ خۆم ژەنراڵێك دەبووم.

گێلە بێدەنگ بوو، خەمێکی قووڵ سیمای تەنی، هەر وەك کیژۆڵەیەك

بوکەڵەکەی لێ سەنرابێ، بوغز گەروی گرت، منیش بۆ دڵنەوایی کردنی وتم:

- هەرکەسەو چارەنوسێکی هەیە! ئایندەش بەدەستی خۆمان نییە. بەڵام دیار بوو گێلە ئەم قسانەی پێ پەسەند نەبوو، چاوەکانی بریسکانەوەو سەرێکی هەڵبڕی قسەکانی بکات. منیش کەبینیم باسەکە گەشتۆتە شوێنێکی ناسك پێش دەستیم کردو وتم:

- باشە، دواتر چی ڕویدا؟

کاتێ گەیشتمە ڕاڕەوەکە، بینیم یەکێ بەرەو ڕووم دێ، کوڕەکان هەقیان نەبوو دوای کەڕەنای خەوتن لەژوورەکانیان وەدەرکەون، زانیم ئەو یەکێکە لەئەفسەرەکان‌و بەتایبەت لەجیرە جیڕی پێڵاوەکانی زانیم بالیۆزە.

بەجۆرێ سەرم لێ شێوا وەك مشکێك چاوی بە پشیلە کەوتبێ لەجێی خۆم وشك بووم، ساتێکی مەترسیدار بوو، گەر نەقیب بە مەنجەڵە کوتولەوە بیدیتبام مەرگم حەڵاڵ بوو.

لەو حاڵەتی گێژی‌و نائومێدیەدا، بەخیاڵمدا هات ئەو دەرگایەی لەتەنیشتیەوە وەستا بووم بیکەمەوە، بە پەلە خۆم بە ژووردا بکەم‌و دەرگا لەخۆم دابخەم، دەنگی پێی نەقیب نزیکتر دەبویەوە کە گەیشتە بەردەمی دەرگاکە وەستا.

جەرگ‌و هەناوم پسا: "خوایە ئەگەر منی دیتبێ‌و بێتە ژوورەوە چارم چییە؟" هەرچی دوعایەکم لەبەر بوو خوێندم‌و فووم بە خۆمدا کرد، کە لەدەستی نەقیب قوتار ببم.

دوعاکەم گیرا بوو پاش کەمێ نەقیب ڕۆشت‌و بەچەن هەنگاوێ لێم دوورکەوتەوە.

کەمێ بەخۆدا هاتمەوە پێنج دانگی هەستەکانم وەکار کەوتنەوە،

دەنگی پرخە پرخێکی سەیر هاتە گوێم، تا ئەو کات لەبەر شپرزەیی خۆم ئاگام لێ نەبوو، ئاوڕێکم دایەوە بینم یەکێ لەسەر چەرپاکە خەوتووە، دەستێ جلی ژەنراڵیش دراوە بەنیشتۆکی نزیك چەرپاکەوە.

ئاهێکی سارد لەناخمەوە هەڵقولا، ئەی نەگبەتیی چەن بەلایەکی گەورەیت لەکۆڵ بنیادەم نابیتەوە.

پرخ و هوڕەکەی وەکو دەنگی کۆرسێکی مۆسیقای چل کەسی وا بوو، کە جڵەوی لەدەستی ڕێبەری ئۆرکستراکە دەرچوو بێت.

گوێم نا بە دەرگاکەوە ویستم بزانم جەنابی نەقیب بەرەو کام لا رۆشتووە، دەشمزانی سەرێك لەبەشی ناوخۆیی دەدات و حەتمەن دوای چەن خولەکێکی دیکە دەگەڕێتەوە، منیش دەبێ هێندە لەم ژوورەدا بمێنمەوە تاکو نەقیب کارەکانی تەواو دەکاو دەگەڕێتەوە ژووری خۆی.

زەندەقم چوو بوو، خوایە نەوەك ژەنراڵ بێدار بێتەوە؟ نەکا نەقیب لەکاتی گەڕانەوەیدا سەرێك لەم ژوورەیش بدات؟!

بەئەسپایی مەنجەڵەکەم لەسەر نیشتۆکەکە دانا، لەو نەگبەتیە لەبەرز بونەوەو نزم بونەوەی لێفەکەی ژەنراڵ پێکەنینم دەهات.

کاتێ ژەنراڵ هەناسەی دەدایەوە، لێفەکە بەئەنازەی دەپانزە سانتیمەترێ بەرز دەبویەوە، کاتێ هەڵیدەمژیەوە وەکو میزەڵانی کوون بوو لەپڕ فش دەبویەوە.

نازانم چ نەگبەتیەك بەرۆکی گرتبووم، بەخەیاڵمدا هات جلەکانی ژەنراڵ لەبەر بکەم، لەدڵی خۆمدا وتم گەر نەقیب سەرێ لەم ژوورە بدات و من بەجلی ژەنراڵەوە ببینێ نازانێ مەسەلە چییە، وادەزانێ ژەنراڵ نەخەوتووەو خەریکی خوێندنەوەیە.

بەپەلە جلەکانم داکەندو جلەکانی ژەنراڵم لەبەر کردو کڵاوەکەم لەسەر کردو جلەکانی خۆمم خستە ژێر نیشتۆکەکەوە.

خەریکی ڕێککردنی کڵاوەکە بووم، نەقیب هێواش و لەسەرخۆ دەرگای کردەوە سەرێکی کێشایە ژوورەوە. لەدیتنی من جۆرێ سڵەمیەوە، دەرگاکەی بەرداو سەربازانە سڵاوێکی لێ کردم. دەرگا هێندە بەتوندی داخرا زرمەی گەیشتە ئەو سەری ڕاڕەوەکە.

"ئەی دادو بێداد ئەم نەگبەتیە چۆن چارە بکەم."

– ئەمرێکتان هەیە.

دەمم بوبو بەتەڵەی تەقیو، گەر زۆر لەسەری برۆشتینایە هەم ترسی ئەوەم هەبوو بمناسێتەوە، هەم ترسی خەبەر بونەوەی ژەنراڵیشم هەبوو، بەئاماژەی سەر دەست تێم گەیاند لەدەرەوە کاری پێویستم هەیەو خێرا هاتمە دەرەوە بەرەو ئەوسەری دالانەکە کەوتمە ڕێ و نەقیبیش هەروا بەدەم سڵاو کردنەکەیەوە بەدوامدا.

مەپرسە چ حاڵێکم هەبوو، ئەقڵم لەکار کەوتبوو هەموو جوڵەکانم خۆ نەویستانە بوو، جەنابی نەقیب کە زانی ژەنراڵ پێویستی بەپێشاوە.

بەدالانەکەدا بەرەو ئاودەستەکە ڕایکرد، دەرگای خستە سەر پشت:

– قوربان ئێرەیە!

هیچ گوێم پێ نەداو بەخێرایی چوومە پێشەوە، بۆ ئەوەی باشتر ئەو بەسەرهاتە بێنیتە بەرچاوی خۆت، باسی نەخشەی قوتابخانەکەت بۆ دەکەم، بینای قوتابخانەکە لە ناوەڕاستی چوار دیواردا دروست کرا بوو، شێوەی شەش پاڵوی هەبوو لەسەرانسەری هەموو بەشەکانیدا دالانی گەورە گەورە هەبوون، لەهەر چوار لایەوە بەپلیکانەی کورت دەچونە دەرەوە.

لەهەردوو بەری دالانەکان ژووری قوتابیان بوو، کە نەقیب بینی من بەرەو ژوورەکان دەچم وایزانی بەو شەوە خەریکی پشکنین دەبم. وتی:

– قوربان تەشریف دەبەنە بەشی ناوخۆیی؟

نەمدەزانی چی پێ بڵێم و چۆن لەدەستی قوتار بم؟! دەمزانی بێت و لەداوی بکەوم، ئەوا دەردێکم پێ دەدات تاماوم لەنەخۆشخانە بکەوم.

"خوایە خۆت خاوەنی ڕەحمیت." بەدەم ڕۆشتنەوە خەریکی نەخشە کێشان بووم چی بکەم.

لەو دالانەدا بێجگە لەئێمە کەسی دیکەی تێدا نەبوو، دەمزانی کوڕەکان یان خەوتوون یان خۆیان کردووە بە خەوتوو.

لەم دالانەوە تێپەڕین و بەرەو دالانی دەستە چەپ باماندایەوە، هات بەخەیاڵمدا، کاتێ گەیشتینە بەردەمی ژوورەکەی خۆمان بەپەلە خۆم هەڵدەمە ژوورەکەو لەژێر بەتانیەکەمدا خۆم قایم کەم، بەلام ئەوەش بێسوود بوو، کوڕەکان بێدار دەبونەوەو گەنترو پەنتر.

"خوایە چی بکەم خۆ ناشکرێ لەم دالانەدا تا بەیانی من بێم و بچم."

لەناکاو بیرۆکەیەکم بۆ هات، چۆنە سەر لەنوێ بگەڕێمەوە ژوورەکەی ژەنراڵ و دەرگا لەسەر خۆم داخەمەوە! لەوێ لەکۆڵم دەبێتەوە. ئەمە نەخشەیەکی باش بوو. بەدالانەکەدا ڕۆشتم و دووبارە گەڕامەوە بۆ دالانی یەکەم و بەرەو ژوورەکەی ژەنراڵ.

دەرگای ژوورەکەی ژەنراڵم کەمێ کردەوە، بەلام وەك ماران گەستە سڵەمیمەوە، دەرگاکەم پێوەدایەوە، ژەنراڵ لەخەو بێدار بوو خەریکی خواردنی کوتولە بوو، ئاگای لەمن نەبوو ئەگینا باوانی لەگۆڕ دەردەکردم.

نەقیب باڵیوز دووبارە کەوتەوە شوێنم، منیش بەڕێگەی خۆمدا گەڕامەوە، دیسان نەقیب دەرگای ئاودەستەکەی کردەوە، من خێراتر بووم ئەویش هەروا، من خێراتر هەنگاوەکانم هەڵدێنایەوە نەقیبیش خێراتر.

لەپڕ نازانم لەچ شتێ کەوتە گومانەوە، دەستی هێنا شانم بگرێ. من

وەك ماسی لە ژێر دەستی خزیم و تێم تەقان، من ڕام دەکردو نەقیبیش بەدوامدا، بەدەم ڕاکردنەوە جلەکانی ژەنراڵم لەبەر داکەندو تورم هەڵدان. لەم فەرتەنەیەدا کوڕەکان هاتنە دەرەوە لەبەردەم ژوورەکانیان یەکێ دەیوت:

– ژەنراڵ چی کردووە نەقیب ڕاوی دەنێ؟

یەکێکیتر دەیوت:

– ژەنراڵ و نەقیب یاری مشك و پشیلە دەکەن.

هەر پارچە جلێکم لەبەر دادەکەندو فڕێم دەدا نەقیب بۆی دەچەمیەوە هەڵی دەگرتەوە، تا سوکایەتی بەجلەکانی ژەنراڵ نەکرێت ئەمەش وای کرد مەودایەکی زۆر پێشی بکەوم.

لەترساندا هێندە شڵەژا بووم بیری ئەوەم نەبوو، تا پێڵاوەکانم دانەکەنم پانتۆڵەکەم لەپێم دەرنایەت. بەدەم ڕاکردنەوە قۆپچەی پانتۆڵەکەم ترازاندو پانتۆڵ خزایە سەر پێیەکانم، بەڵام لەبەر پێڵاوەکانم لە دەرلینگم ڕەت نەدەبوو، هەر بۆیە لەپەو ڕوو کەوتم. ئەویش کە بەڕاکردنێکی بەتاو بەدوامەوە بوو، لێم هەڵکەوت و سێ چوار مەترێ ئەولاتر زرمەی لێ هەستا.

بە هەر کولەمەرگیەك بوو پانتۆڵەکەم لەپێم داماڵی، تاکو نەقیب ویستی هەستێتەوە من بەرەو لایەکی دیکەی داڵانەکە بۆی دەرچووم. کە بەشۆرتەکەوە ڕامکرد وەك ڕەشەبا خۆم کرد بەژوورەکەی خۆماندا و خۆم هەڵدایە نێو پێخەفەکەی خۆم و بەتانیەکەم لەسەر خۆم قایم کرد.

دوای چەن خولەکێ، نەقیب لەکاتێکا جلەکانی ژەنراڵی بەدەستەوە بوو خۆیکرد بە بەشی ناوخۆییدا، هەر لەبەر دەرگاکەوە هاواری کرد:

– ئەوە کێ بوو؟

دەمزانی کوڕەکان ئاشکرام ناکەن، بەڵام ئۆقرەم لەبەر بڕا بوو.

نەقیب دووبارەی کردەوە:

– خێراکەن قسە بکەن.

بەڵام، کەس ورتەی لێوە نەهات، وەك بڵێی هەموو خەوتبن! نەقیب سێ بارەی کردەوە، هەمووومان ڕەفتاریمان باش دەناسی هەرکەس لەگەڵیدا ڕاستگۆ بوایە تاوانەکەی هەر چەن گەورە بوایە دەیبەخشی! بەڵام ئەگەر درۆی لەگەڵ کردبایە ئەوە تا هەتایە لەکۆڵی نەدەبویەوە.

چەن کەرەتێ ویستم لەژێر بەتانیەکە بێمە دەرەوەو دروست بڵێم من بووم، بەڵام تاوانەکەم مایەی بەخشین نەبوو، بۆیە زیاتر سەرم دەئاخنیە بن بەتانیەکەو دەکۆشام هەناسەش دەر نەدەم.

نەقیب چەن جنێوێکی تەڕو پاراوی گەیاندە گۆڕی باوو باپیری ژەنراڵی ساختە، پاشان بۆ دۆزینەوەی تاوانبار دەستی کرد بەپشکنینی پێخەفەکان.

بەندی جەرگو هەناوم پسا، سەرتاپێم دەستی کرد بەلەرزین، زیاتر خۆم لەژێر بەتانیەکە گرمۆڵە کرد، لەچەرپاکەی تەنیشتمەوە "باسر بێ مێشك" خەوتبوو. نەقیب لێی پرسی:

– تۆ بینیت کێ بوو؟

باسر، بە دەنگێکی بەرز وەڵامیدایەوە:

– نا، گەورەم نەمبینی!

بۆ نەگبەتیم نەمتوانی بوو پێڵاوەکانم داکەنم و لە بەدبەختی قاچێکم لە بەتانیەکەوە دەرچو بوو، بووم بەتەڵەوە. نەقیب قاچی گرتم و توند ڕایکێشا.

– هەستە بزانم کوڕە، تۆپیو!

بەتوێی فانیلەو شۆرتێکەوە لەژێر بەتانیەوە هاتمە دەرەوە. کوڕەکان لەتاو پێکەنین نەیاندەتوانی خۆیان ڕاگیر بکەن.

نەقیب نەڕاندی:

– جلەکانت لەبەرکە.

– جلم نییە.

– یانی چی؟ ئەی جلەکانت کوا؟

– لەژوورەکەی ژەنراڵ بە جێ ماون!

چاوەکانی نەقیب لەهەژیمەتی توڕە بوندا تەسك بوبونەوە هاواری کرد:

– قوڕ بەسەرت! مەگەر ژووری ژەنراڵ شوێنی خۆ گۆڕینە!؟

ورتەم لێوە نەدەهات، چاوم بڕی بوە زەویەکە، چاوەڕێی سەختترین سزا بووم!

نەقیب، بەهەموو هێزی خۆی تفێکی تێ کردم.

– تفففف! وەرە بەدوامدا!!

ئەم فەرمانەی هێندە مەحکەمو سەربازیانە دەرکرد، بۆنی مەرگی لێ دەهات.

هیچ چارەیەك نەبوو، ئاوڕێکم دایەوە، نیگایەکی نائومێدیم لەکوڕەکان بڕی، کە سەریان لەبەتانیەکانیانەوە دەرکێشا بوو، بەچاوی بەزەییەوە لێیان دەڕوانیم، لەدرەگا چوومە دەرەوە تا بزانم چ چارەنوسێك چاوەڕێمە.

چەن دنیایەکی سەمەرەیە چەن خولەکێ پێشتر نەقیب سلاوی سەربازانەی بۆ دەکردم، ئێستەش ناچارم من دوای کەوم.

یەکڕاست چوینە ژوورەکەی نەقیب، لەسەدا سەد دەمزانی بەقەستی کوشتن لێم دەدات، بیرم کردەوە لێی بپاڕێمەوەو داوای لێبوردنی لێ بکەم، بەلام ئەم کارە بێ هوودە بوو، چونکە شارەزای ئاکارو ڕەفتار بووم، تا لێی بپاڕێمەوە زیاترم لێدەدات، وێڕای ئەوەش پاڕانەوە لەسەرو

سەکوتم نەدەوەشایەوە.

خوا خوای ئەوەم بوو لەکاتی لێداندا لەهۆش خۆم بچم و زۆر ئازار نەچێژم.

پاڵم دابوو بەدیوارەکەوە نەقیبیش تاوێك بەنێو ژوورەکەدا ئەمسەرەو سەری کرد، لەپڕ هەڵگەڕایەوەو مۆڕەیەکی لێ کردم، مۆڕەکەی هێندە زبرو دڕندانە بوو، تا ناوقەدی وشك کردم.

"بریا زوتر فەلاقەی دەکردم و ڕزگار دەبووم"

نەقیب، فاسیلەی نێوانمانی بەدوو هەنگاو تەی کرد، دەستە قورسەکانی وەکو کوتەك هەڵێنایەوە بەڵام فریای داهێنانەوەی نەکەوت، بەپەلە لەدەرگا درا بێ ئەوەی نەقیب مۆڵەتی هاتنە ژوورە بدا ئەفسەری ئێشککگر بەشپرزەییەوە خۆی کرد بەژووردا و بەبرزکانەوە وتی:

– گەورەم... ژەنراڵ... ژەنراڵ.

باڵیۆز هەقی کەسێکی هێمن بوو، تا ئێستا کەس نەیدیتبوو شپرزە بێت، کەچی ئەمجارە هەر بەبیستنی ناوی ژەنراڵ هێندە پەشۆکا زمانی لاڵ بوو:

– ژەنراڵ چی؟ چی بووە؟

باڵیۆز هەقی نەیهێشت ئەفسەری ئێشککگر قسەکەی تەواو بکا، وەکو گوللە دەرچووە دەرەوە.

دەنگی هاتوچۆی کۆمەڵێك لەسەر پلیکانەکان و داڵانەکەوە دەبیسرا، نەمدەزانی چی بکەم خوایە هەر لێرە بۆستم تاکو نەقیب دێتەوە؟ یان بڕۆمەوە ژوورەکەی خۆم؟ یان منیش دوای ئەوان بکەوم؟ ترسی ئەوەم هەبوو هەرچیەك بکەم نەقیب زیاتر دەهری ببێ.

کەمێ وەستام پاشان لەدەرگاکەوە سەرێکم کێشایە دەرەوە، چاوێکم بەداڵانەکەدا گێڕا، بینم هەندێك دەچن بەنێو یەکداو لەملا بۆ ئەولا

رادەکەن.

چوومە نێو دالانەکەوە، بە پلیکانەکانەکاندا سەرکەوتم، دکتۆری تەنگە ئەستور بەدالانەکەدا ڕایدەکرد، دەیەویست خۆی بگەیێنێتە ژوورەکەی ژەنراڵ. منیش بەدوای ئەو کەوتم، لەژوورەکە دیمەنێکم بینی خەریك بوو لەپێکەنیندا بقرتێم.

ژەنراڵ بەتوێی کراس و دەرپێیەکی سپییەوە لێی کەوتبوو، ورگی بەقەدەر دەهۆڵێ هەلاوسابوو دەینالاند.

نەقیب کە چاوەڕێی دکتۆر بوو، کاتێ منی بینی گوێ گرتم و ڕایکێشامە دالانەکەوە.

– بۆ هاتویتە ئێرە باوك...

– جلەکانم لێرەیە! لەژێر نیشتۆکەکە لێم بەجێ مابوون.

نەقیب جلەکانی فرێدا بەسەرو چاومدا.

– بڕۆ ملت بشکێنە سبەی وەرەوە کارم پێتە.

خوا ماڵی ژەنراڵ ئاوا کات، بە نەخۆشکەوتنی منی لەدەستی نەقیب ڕزگار کرد. هەرچەند نیوە شەویش بوو، هەموو کورەکان بەخەبەر بوون و چاوەڕێی ئەنجامی کاری من بوون.

هەموو دەورەیان لێدام و هەر کەسەو شتێکی لێ دەپرسیم؟

– چۆن بوو؟

– تێی هەڵدایت؟

– بەچی لێی دایت؟

– هیچ، بەخوا شانسی خۆم بوو، ژەنراڵ نەخۆش کەوت و منیش ڕزگارم بوو.

بورهان شەیپوری وتی:

– ژەنراڵ بۆچی نەخۆش کەوت؟

- نازانم.

دواتـر هـەموو بەسـەرهاتەكەم بـۆ كوڕەكـان بـەتێرو تەسـەلی گێڕایـەوە هێندە پێكەنین تا توشی ژانەسك بوون.

بەیانی كە بێدار بوومەوە، هـەموو كارەساتی دوێنـی شـەوم بیر چوو بویەوە، لەدوای مەشقی بەیانیان سەعاتێ پشوودانمان هەبوو.

هاوڕێكـانم هـەر یەكـەو سـەرگەرمی كارێـك بـوون‌و منـیش خـەریكی نوسینی نامەیەك بوو بۆ باوكم.

دایك‌و باوكم لـە "قەیسـەریە"ی یـەكێ لەشارەكانی توركیا نیشتەجێ بوون، پێشتر باوكم لەنوسینگەی سوپادا كاری دەكرد بـەڵام دەمێك بوو خانەنشین كرا بوو.

بێجگـە لـەمن حـەوت منالّـێ دیكـەی هـەبوو، چـونكە مـن لەهـەمویان گـەورەتر بـووم، چـاویان لەدەسـتی مـن بـوو، كـە هەرچـی زووتـرە مـن پێبگەم‌و بەخێویان بكەم!!

بـاوكم مانگانـە سـەد لـیرەی بـۆ دەنـاردم، دەشمزانـی هەرچـەن بـڕە پارەیەكی كەمە بەڵام بۆ ئەو زۆر سەختە.

بۆیـە هـەرجارێ نامـەی بۆ دەنـاردم، ئامۆژگارییـەكی زۆری دەكـردم كـە ئاگام لەخۆم‌و وانەكانم بێت‌و ئاكارو ڕەفتارێكی خوازراوم هەبێت.

منـیش وەڵامەكـەیم بـەدورو درێـژی بـۆ دەنوسـیەوە، دڵنیـام دەكـردەوە شـەوو ڕۆژ خـەریكی خوێنـدنم، بـۆ دەرچـونیش لەتاقیكردنـەوە هـەولێكی زۆر دەدەم‌و تەنانـەت چـەندجارێك بـۆم نوسـی بـوو دڵنیـا بێـت لـەوەی لـە تاقیكردنەوەی كۆتایی ساڵدا یەكەم دەبم.

نامەكەم خەریك بوو دەهاتە كۆتایی، نوقمی نوسین بـووم، لـەپڕ هەسـتم بەچـزەیەك كـرد لەپـشتە ملمـەوە وەك ئـەوەی زەردەواڵـە پێـوەی دابم، بـە پەلە دەستم گەیاندە پشتەملی خۆم‌و "زررم زللەیەكی قایمم لەخۆمدا!"

تریقـەی پێکـەنینی کوڕەکـان بـەرز بویـەوە، تێگەشـتم سـاڵح شـەمع لەتەنیشت چەرپاکەوە سیمێکی بۆ پشتە ملم درێژ کردووە.

ئەو باوەمان هەبوو، هەرکاتێ کەسێ لەکارێکی خۆیدا قووڵ ببوایەتەوە هاوڕێکانی سەریان دەخستە سەرو ماوەیەك پێدەکەنین‌و رایان دەبوارد.

بـەڵام نـازانم ئـەو رۆژە مـن بۆچـی هێنـدە کەللـەیی بووم، وەکو شـێرێك بێـچویان لـێ سـەند بـێ، لـەجێی خـۆم هەڵبەزیمـەوەو پـەلاماری سـاڵح شەمعمدا.

دەنگی هاندان‌و بیکوتە بیکوتەی کوڕەکان بەرز بویەوە:

– دەی گیانەکەم!

– ئافەرین پاڵەوان!

– بیخنکێنە!

ساڵح، لەپێشا کەمێ پێکەنی‌و بەڵام دواتر زانـی مـن بەڕاسـتی دەمـەوێ لێی بدەم خۆی لێ توند کردمەوە. لەناوەڕاستی ژوورەکەدا تێك بـەربوین، چونکە ئەو لـەمن بەشـان‌و کەفەڵتر بـوو بەدەسـتە کەتـەکانی گـەروی گـرتم هێندەی گوشیی هێڵنجم دەهات!

کوڕەکـان لـەو دەنگـە تایبەتـەی لـەقوڕگم هاتـە دەرەوە بـەجۆرێ قاقایـان لێدەدا دەنگیان دەگەیشتە دالانەکەی دەرەوە.

من لەتین‌و تاوی توڕەیی وەك شێت‌و هارم لێ هـاتبوو، بەهـەموو هێـزی خۆم ساڵحم کێشا بە دیوارەکەدا.

ئێستا من بـراوە بـووم، دووان لـەکوڕەکان خـەریك بوون منیـان هـان دەدا، لـەم کاتـەدا یـەکێ دەیویـست دەرگاکـە بکاتـەوە بـەڵام سـاڵح پـاڵی دابوو بەدەرگاکەوە نەی دەهێشت بکرێتەوە.

من خـەیاڵم لای دەرگاکـە بوو، سـاڵح پـێ لەقەیـەکی لێدام‌و هـەردوکمان وەك درەختـی دەم گەردەلول لەناوەڕاستی ژوورەکەدا تەختی زەوی بوین.

من بەپشتدا کەوتبووم سالح چۆکی دادابویە سەر سینەم، لەسەرو شان‌و روخساری سالحەوە دەمو چاوی توڕەو تۆسەنی نەقیب بالیوزم بینی کە هاتە ژوورەوە.

هەراو زەنای کوڕەکان بەجارێ بێدەنگ بوو، من دەمویست هەستمەوە بەلام سالح کەئەمەی نەدەزانی نەیدەهێشت.

لەم بێنەو بەردەیەدا سالح پانتۆڵەکەی گرت‌و رایکێشاو بەجارێ قۆپچەی پانتۆڵەکەم کرانەوەو تەواو لەپێم داکەنرا!!!

نەقیب بەنوکی پێلاوەکانی شەقێکی وەها مزری لەسالح هەلدا وەك تەپالە بەزەویدا بلاو بویەوە.

سالح ئاوڕێکی دایەوە هەر کە نەقیبی بینی لەسەر سینگی من هەستا، منیش قۆپچەکانم بەستنەوەو هەستامەوە سەر پێ.

نەقیب گوێی سالحی گرت‌و وەکو جلی شۆراو بایدا، زانیم کاری سالح خەریکە گەن دەبێ وتم:

– گەورەم!

وتی: چییە؟

سەرم داخست‌و بەئەستەمێك وەلامم دایەوە:

– سالح بێ تاوانە، ئەو خەریکی دەرس‌و دەوری خۆی بوو، من تەشقەلەم پێ کرد.

نەقیب گوێی سالحی بەرداو بەرەو من هات.

– تۆ هیچ کاتێ نابیتە بنیادەم؟

ورتەم لێوە نەهات، چاوەڕوانی ئەوە بووم ڕاست‌و چەپێکم بکات.

بەلام ئەو کارەی نەکرد، لەکاتێکا ددانەکانی جیڕ دەکردنەوە وتی:

– وەرە بەدوای مندا.

نەقیب بەرەو دالانەکە چوە دەرەوە، منیش وەك مەحکومێك بیرێتە پای

سێدارە، هێواش و لەسەرخۆ بەدوایدا رۆشتم. مەگەر خودا بۆ خۆی بزانێ بەدەم ڕێگاوە چ حاڵێکم هەبوو. هیچ کاتێ بەو تووڕەییە نەمدیتبوو.

کە چوینە ژوورەکەی نەقیب دەرگاکەی قایم داخست وتی:

– بۆچی وات کرد؟ دوێ شەو دەستە گوڵێکت دا بەئاودا، ئەمەش ئاکاری ئەمرۆت؟

من هەر وا مات و بێدەنگ بووم، نەقیب قیڕاندی:

– بۆچی لاڵ بویت؟

– چی بڵێم؟ بەدبەختی بەرۆکی گرتووم.

– ئاخر بۆچی وادەکەی کوڕی خۆم؟

لە وشەی "کوڕم" واق بووم، ئەوە بۆ یەکەمجار بوو کە نەقیب بەمجۆرە لەگەڵ کەسێ بدوێ، هێواش سەرم هەڵبڕیی و سەیرێکم کرد چاوەکانی فرمێسکیان تێزا بوو، کەمێ بەخۆمدا هاتمەوە وتم:

– شەیتان زەفەری پێ بردم نەمزانی!

– دوێ شەو شەیتان زەفەری پێ بردی، ئەی ئەمڕۆ چی؟

نەمدەزانی چ وەلامێك بدەمەوە، ئەو زۆر بەشێنەیی وتی:

– من هەوڵێکی زۆرمدا بەڕێوەبەری قوتابخانە قایل بکەم ببورێ، بەلام مەخابن سەری نەگرت، بۆیە لەقوتابخانە دەرکرایت!

سەرم گێژی خواردو پەردەیەکی ڕەش بەرچاوی گرتم، وەك ئەوە بوو بنمیچی ژوورەکەم بەسەردا بڕمێنن، چیتر قسەکانی نەقیبم نەدەبیست، هەرچی دەوت ئاگام لەخۆم نەبوو.

لەناکاو دامە پڕمەی گریان، ئەویش بوغز بەربینی گرتبوو بەدەنگێکی نوساوەوە وتی:

– تۆ ئەفسەرێکی باشت لێ دەردەچوو، بەلام مەخابن ژەنراڵ بە مەسەلەکەی زانیوەو چیتر پینە ناکرێتەوە.

ڕەنگە چارەنوسیشت هەروای هێنابێ، بڕۆ کەلوپەلەکانت کۆ بکەرەوەو ئامادەی وەرگرتنی نامەی دەرکرانەکەت بە.

گەڕامەوە بۆ لای هاوڕێکانم، هەموو لەبیستنی مەسەلەکە نیگەران بوون هەر یەکەو بەجۆرێ دڵنەوایی دەکردم، ئەگەر بڕیار بێ کەسێ پلەکەی بەرز بکرێتەوە، لانیکەم دوو سێ هەفتە دەخایێنێ تاکو پێی ڕادەگێنن، بەڵام بڕیاری دەکردنی من، دوو سێ سەعات زیاتری نەخایاند، هەموو کارەکان خێرا ڕێکخرا، هاوکات دایك‌و باوکم چاوەڕێ بوون، کوڕەکەیان مانگ‌و نیوێکی دیکە بچێتە کۆلێژی سەربازی، خەت‌و مەتیان لێ کردمەوەو لەقوتابخانەی سەربازی وەدەریان نام.

ئێمەی بنیادەم ئەوەی بەخەیاڵماندا نایەت بەسەرماندا دێت.

لەم ساتەدا گێلە هێندە دڵی پڕ بوو، نەیدەتوانی لەقسەکانی بەردەوام بێت.

جگەرەیەکی لەگیرفانی دەرهێناو دایگرساندو کەمێ بێدەنگ بوو.

لەدالانەکەوە دەنگی قەدری بەرز بویەوە:

– دەبەنگ! هەر بەرەکەی پێنج سەد لیرە دێنێ.

یەکێ لەولاترەوە وەڵامیدایەوە:

– من بەدوسەد دار کڕیارم گەر کەس نەیکڕی لەخزمەتتدام!

دەرگای قاوشەکەی ئێمە بەدەنگێکی وشك کرایەوە، قەدری بەشێوەیەکی سوکایەتی پێ کردنەوە ئەو پاڵتۆیەی بەسەر دەستیەوە بوو بۆ گێلەی فڕێدا.

– سەد لیرەی زیاتر پێ نادەن.

گێلە حەزی نەدەکرد من لەم مەسەلەیە بزانم، گەلێ نیگەران بوو بەکەمتەرخەمیەوە وتی:

– داینێ برام، زیاتر بەکەڵکی خۆم دێت!

قەدری لچێکی لێ هەڵقورچان:

- باشترە "ترش"ی لەسەر هەڵخەیت.

پاشان دەرگاکەی توند پێوەدایەوەو رۆشتە دەرەوە.

گێلە بەنیگەرانیەوە وتی:

-ئەمانە بێ رەوشتن، هەموویان نەخۆشن، چونکە چەن رۆژێ زیاتر نامێنمەوە، ویستم پاڵتۆکەم بفرۆشم، هەستم بەنیگەران بوونەکەی گێلە کردو ویستم بابەتەکەی پێ بگۆرم.

- لەوە گەرێ، بابێینەوە سەر باسەکەی خۆمان.

- بەڵێ، دایکو باوکم چاوەرێ بوون کورەکەیان بەجلی ئەفسەری سەربازییەوە بگەرێتەوە، چاویان بەجوانی رونـاکی چاویان بکەوێ، کەچی تەنانەت دەستێ چاکەتو پانتۆڵیشی نییە!!

لەم کاتەدا نانیان هێنا، منو گێلە ژەمە خواردنمان نەبوو، یەکەم شەوی هیچ زیندانیەك هیچ ژەمەو خواردنو نانێکی نییە.

گێلە پێشنیاری کرد بچینە چایخانەی زیندانو لەوێ شتێك بخۆین، من داوای لێبوردنم کرد، چونکە نە ئیشتهای خواردنم هەبوو نەدڵیشم خواردنەکانی ئەوێی دەبرد، گێلە چوە دەرەوەو چەن خولەکێ منی بەبیرو خەیاڵی ئاڵۆزەوە بەجێ هێشت، کاتێ گەرایەوە خەریك بوو بەچیلکە شقارتە بێخی ددانەکانی پاك دەکردەوە، دەیویست خۆی وا بنوێنێ نانێکی چەورو گۆشتی خواردووە، بەلام دڵنیابووم بە خۆفشێن بوو هیچی نەخواردبوو.

داوای دوو قاوەی کردو وتی:

- دوای نانخواردن قاوەیەك خراپ نییە، منیش حەزم بەخواردنەوەی قاوەیەك دەکرد تاکو دەمارەکانم بحەوێنمەوە. گێلە، دەستی کردەوە بە گێرانەوەی بەسەرهاتەکە:

- دیارە دایکو باوکم بەم هەواڵە زۆر نارەحەت بوون، بەڵام بەهەر داماویەك بوو پێیان بەجەرگی خۆیاندا ناو دەڵنەوایی منیان کرد:

"خۆ ئاسمان نەڕوخاوە، خۆ هەموو کەسیش نابنە ئەفسەر، دەتوانی کارێکی دیکە بدۆزیتەوە، کاسبی ئەمڕۆ لەهەموو شتێ باشترە."

منیش هیچ چارەیەکم نەبوو، دەبوو هەر بڵێم وایە، بەخۆمم وت: "ئێستا لەقوتابخانەی سەربازی دەرکراوم، دەبێ لەقوتابخانەی ژیان دیپلۆم وەرگرم."

بڕیارمدا لەماڵی باوکم بێمە دەرەوە، تاکو لەقوتابخانەی ژیان خوێندنەکەم تەواو نەکەم نەگەڕێمەوە بۆ ناو خێزانەکەم.

بەم بڕیارەوە دوو سێ ڕۆژ دواتر بارگەی سەفەرم پێچایەوەو بەرەو ئەستەمبوڵ بەڕێ کەوتم.

ڕۆژێکی بەهاری بوو، درەختەکان تازە چرۆیان کردبوو، شار دیمەنێکی نایابی هەبوو، ماوەیەك بەشەقامەکاندا پیاسەم کرد. دەمویست کارێك بدۆزمەوە ئیتر هەرچی بێت، بیستبووم هەندێك لەهیچەوە بووبونە هەموو شتێ. مەگەر من چیم لەوانە کەمترە؟ ئەگەر نەبومەتە ژەنراڵ هیچ نەبێ دەتوانم ببمە ملیۆنەر! بە بەردەمی باڵاخانەکاندا تێدەپەڕیم، لەدڵی خۆمدا دەموت ڕۆژێ دەبێ ئەمانە هەمووی ماڵی تۆ دەبن!.

هەروا دەستم لەگیرفانم نابوو، بە فیکە لێدان بەکۆڵانو شەقامەکاندا دەڕۆشتمو بیرم لەئاییندەی نادیاری خۆم دەکردەوە، لەبرسا دڵم دەلەرزی، بەڵام ورەم دایە بەر خۆم، بۆ مسۆگەر کردنی سەرکەوتن دەبێ بەرگەی هەموو نارەحەتیو ئازارێ بگریت.

گەشتمە بەر دوکانێکی گەورەی قەرەباڵغ، هات بەدڵمدا بچمە بەردەمی کابرای خاوەن دوکان بڵێم کارێکم پێ بدە، کەچی خێرا پەشیمان

بوومەوە "مەگەر ئەمانە بەکەسێکی نەدیوو نەناس کار دەدەن؟"

بەم حاڵەشەوە چوومە بەردەم چێشتخانەیەکی گەورە، ویستم بەخاوەنەکەی بلێم کارێکم پێ بدە، ئیدی هەر کارێ بێ، قاپ شۆریی بێ، گەسك لێدان بێ، کاشی سڕینەوە بێ، هەر هێندەی زگم تێر بێ، بەڵام قاچم لەدووم نەدەهات.

دوو سەعات لەبەر دەمی جامخانەدا وەستام، لەچێشتو خواردنەکان ورد دەبومەوە، هەر کە دەمویست بچمە نێو چێشتخانەکەوە ئەژنۆم دەشکا، هەرچۆنێ بوو پێم بەجەرگی خۆمداناو بڕیارمدا: "هەرچی دەبێ با ببێت."

چوومە ژوورەوە، شاگردێك بەدەنگی بەرز وتی:

– فەرموو.

خوا کوێرت کات: "چ ئەمرێك بفەرمووم!"

شاگردەکە دووبارەی کردەوە:

– حەزت لەچییە؟

"سوپ، کەباب، کفتە، بریانی...."

شاگرد ناوی خواردنەکانی بۆ دەژماردم، منیش نرخەکانیم لەلیستی سەر مێزەکەوە هاوتای گیرفانم دەکرد، تەنها سەدو هەفتا قروشم پێ بوو.

لەبەر ئەوەی دەمێ بوو وەستا بووم وتم:

– جارێ سوپێکم بۆ بێنە، دواییش نەفەرێك کفتە لەگەڵ قاپێ شیرینی.

دەمویست ورگم تێر بکەمو بۆ پارەکەیشی پەك ناکەوێ.

کاتێ نانم خواردو ورگم بەچاکی تێر بوو، کەوتمە بیری ئەوەی چی بکەم؟ هەقی نانخواردنەکەم حەو هەشت لیرەیەکی دەکرد، منیش نەك هەر ئەو پارەیەم پێ نەبوو بگرە چاکەتو پانتۆڵەکەیشم ئەو نرخەی

نەدەکرد!

ماوەیەکی زۆر دانیشتمو چاوەڕێ بووم بەڵکو چێشتخانەکە چۆڵ بێ، کاتێ هەموو ڕۆشتن شاگردەکە هات بۆلام، دڵە خورپێم گرتو دەستم کرد بەدوعا خوێندن "خوایە بەگەورەیی خۆت ئابڕوم بپارێزە."

لەلێدانو فەلاقە کردن ترسم نەبوو، بریا بەبێدەنگی چینێك شەقیان تێ هەڵدەدامو مەرەخەسیان دەکردم بەڵام کوا؟

شاگردەکە لەبەر دەمی مێزەکەدا وەستاو وەك ئەوەی بۆنی شتێکی کردبێ بەتەوسەوە وتی:

– قوربان دەمانەوێ چێشتخانەکە داخەین.

– بەڵام من چاوەڕێی کەسێکم پارەم بۆ بێنێ.

شاگردەکە بەجۆرێ پێکەنی، لە سەد جنێوی تەڕو تازە خراپتر بوو. دوو سێ کەڕەت سەری بەملاولادا ڕاوەشاند، دیار بوو لەمجۆرە تەڵەکەبازیانەی زۆر دیتبوو، گورگی باران دیتوو بوو. چاوەڕێ بووم ڕاستو چەپ دوو سێ زللەی مزرم تێسرەوێنێ.

بەڵام، ناپیاوە ئەو کارەی نەکرد. دەستی کێشا بەمێزەکەمدا سەرێکی لێ هێنامە پێشەوە وتی:

– سەعات، ئەنگوستیلەو قوتوی جگەرەش وەردەگرین.

ئەمجارەیان نۆبەی من بوو پێ بکەنم..

– ها... ها... ها...!

نەگبەتە نەیدەزانی سەرتاپام پارەی نانخواردنەکە ناکات.

بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتم:

– برا، ڕاستو ڕەوان ئەمەیە پارەو شتی بەقیمەتو هیچ شتێکم پێ نییە.

دەماری لاملی وەك خەنجەر قیت بوونەوە، قیڕاندی بەسەرمدا:

– کەوایە ناماقوڵیت فەرموو هاتویتە ئێرە.

– واللە من هاتبووم کارێ بدۆزمەوە، تۆ زۆرت لێ کردم نان بخۆم.

– چاکی لێ دەزانی! بۆچی ئێرەماڵی پورتە؟

بەهێواشی وتم:

–مەردی خوابە ئابڕوم مەبە، سبەی دوو سبەی پارەکەت بۆ دێنم.

– چیمان بۆ دێنی کوڕی باش، گەر هەموو رۆژێ دوان سیانێکی وەك تۆمان بۆ بێت سەری تێ دەنێین.

– بەڵێن دەدەم من وەکو ئەوانە نیم، ئامادەم لەجیاتی ئەوە کارتان بۆ بکەم، کابرا کەزانی تازە من نانم خواردووەو کارلە کار ترازاوە وتی:

– هەستەو وەرە تا فێرتکەم نانی مفتو خۆڕایی چۆن تامێکی هەیە.

وەك بەرخی دەستەمۆ کە دوای خاوەنەکەی دەکەوێ دوای کەوتم، نەمدەزانی چ تەڵەیەکی بۆ ناومەتەوە، دڵم وەك سەماوەر هاتبوە جۆش.

"خودایە... تۆ بڵێی توشی گێرەو کێشەیەکم بکا؟"

لەوسەری چێشتخانەکەوە چوینە ژوورێکی تاریك‌و بۆگەن، بۆنی گۆشتی ماوەو کۆن وڕو کاسی کردم.

دوو سێ کەس لەو دیوی وەجاخەوە خەریکی ئامادە کردنی خواردنی موشتەریکان بوون، شاگردەکە بردمیە بەردەمی پیاوێکی قەڵەو خەریکی تەسلیم کردنی برنج‌و گۆشتی ئاشپەزخانەکە بوو وتی:

– کاکم نانی خواردووەو پارەی پێ نییە بیدات، دەیەوێ لەجیاتیان کار بکات!

خاوەن چێشتخانەکە لە بەژن‌و باڵام ورد بویەوە، پاشان کۆمەڵێ قاپ‌و قاچاخی پیس‌و نەشۆراوی نیشاندام وتی:

– زووکەو خەریکبە، بەخەیاڵی خۆت لێرە لەسەر دۆشەکی تـوکی قوو دەخەوی زەویەکەش خاوێن بکەوە ئەنجا دوایی قسەت بۆ دەکەم.

دڵخۆش بووم کارەکە بەخۆشی کۆتایی پێ هات، بڕیارمدا بە جۆرێ دەرگای باخی سەوزی خۆمی نیشان بدەم خاوەن چێشتخانە بمخاتە سەر کار.

هەموو قاپ و قاچاخەکانم بە جوانی شۆرد بریقەیان دەدایەوە. زەوی ئاشپەزخانەکەم کردە ئاوێنە، بنیادەم خۆی لەخشتەکانیدا دەبینی.

بۆ چارەڕەشی ئەو ڕۆژە لای ئێوارەکەی لۆریەك برنجیان هێنا، منی بەدبەختیش بۆ ئەوەی خۆم بنوێنم کە لە زۆربەی کرێکارەکان کارامەترم، وێڕای ئەو کفت و کۆڵوارییەی خۆم فەردە برنجەکانم بەکۆڵ بە چواردە پلیکانەدا سەر خست و لەئەنبار لەسەر یەکم دانان.

دەمەو خۆراوا بوو دنیا خەریك بوو تاریك دەبوو، چیتر کارێك نەمابوو نەیکەم، چوومە لای خاوەنی چێشتخانەکەو وتم:

– قوربان کارەکان تەواو بوون.

بەپێکەنینێکەوە سەرێکی کردم و بەدەنگێکی قەبەوە وتی:

– ئافەرین، نانی نیوەڕۆت حەڵاڵ بێت، زۆر باش ئیشت کردووە.

– مەمنونم قوربان، ئەگەر مەیل بفەرموی هەمیشە ئامادەم لێرە کار بکەم.

وەك ئەوەی جنێوێکم پێ دابێت، خاوەن چێشتخانەکە پێکەنینەکەی قوتتدایەوەو چاوی لێ زەق کردمەوە:

– ئا، بۆ ئەمە بوو وەکو سەگ کلکە لەقێت ئەکرد، ناشێ تامی خواردنەکەی نیوەڕۆ لەبێخی ددانتدا مابێتەوە؟

– قوربان، من ئامادەم هەرکارێ تۆ بفەرموی ئەنجامی بدەم.

– ئەوانەشی کە لێرەن زیادن، بەخێر بێیت و خوات لەگەڵ.

ماندوێتیەکەت سەیرێکی سەرو چاویم کرد، لەناخی دڵمەوە سەد جنێووم بۆ نارد.

"مەخابن، بۆ ئەو خۆ ماندوکردنە بێ هودەیەم، تفففف، بێ شەرەف."

لەچێشتخانە وەدەر کەوتم، بەشەقامەکاندا دەستم کردە پیاسە کردن.

"خودایە، خوای گەورە، بۆ کوێ بچم؟ چی بکەم، شەو لەکوێ بخەوم؟"

هەر بەدەم پیاسە کردنەوە رێم کەوتە کۆڵانێک‌و لەلای کارگەیەکی گەورەی بیناسازیدا خۆم دیتەوە.

نزیکەی دوو سەد تا سێسەد کرێکارو وەستا دەستیان لەکار هەڵگرتبوو، وەکو مێشەنگ بەدەوری حیسابدارەکەدا ئاپورەیان دابوو، هەراو زەنایەکی زۆریان نابۆوە.

ماوەیەکی زۆر وەستام لێیان ورد بوومەوە، هەر لەبیرم نەمابوو دەبێ زوتر بیر لەکارێک بکەمەوەو شوێنێک بۆ خەوتن بدۆزمەوە.

کرێکارەکان پارەکانیان وەردەگرت‌و بە پێکەنینەوە بەرەو ماڵ دەرۆشتنەوە.

له دڵی خۆمدا وتم: رەنگە لێرە کارێک بدۆزمەوە. رێکەو راست چوومە ئەو ژوورەی ئەندازیارو وەستا باشیەکانی لێ بوو، لێرە چیتر وەکو چێشتخانەکە نەبوو، شاگردێك فەرمووم لێ بکاو کارێکم پێ بسپێرێ.

لەم بینایە دوو دەستە کرێکار کاریان دەکرد، دەستەیەك بەرۆژ دەستەیکی دیکە بە شەو، هەر ئەو کاتەی دەستەیەك پارەیان وەردەگرت‌و دەرۆشتن لەدەرگایەکی دیکەوە کرێکارانی شەو دەهاتنە ژوورەوە.

لە نوسینگەکە هەموو سەرقاڵی کار کردن بوون، هیچ کەسێ سەری هەڵنەدەبڕیی سەیرێکی من بکات، ماوەیەك وەستام نەمدەزانی بەکامیان بڵێم من بۆ کار کردن هاتووم.

لەم کاتەدا ئۆتۆمبێلێکی مۆدێل بەرز لەبەر دەمی نوسینگەکەدا وەستا، تێکڕای ئەندازیاران‌و کارمەندان خرۆشان‌و لە پشتی مێزەکانیانەوە

بەرزە پێ وەستان.

شۆفێرەکە بەپەلە دەرگای ئۆتۆمبێلەکەی بۆ کردەوە، پیاوێکی کەشخەی تەمەن پەنجا ساڵ دابەزیو هات بۆ نوسینگەکە.

ئەندازیارانو وەستاکان سەریان بۆ دانەواند، یەکێکیان کە لە سەرۆکیان دەچوو هاتە پێشەوەو نەخشەیەکی گەورەی لەسەر مێزە گەورەی ژوورەکە ڕاخستو دەستی کرد بە لێکدانەوە بۆ میوانە تازە هاتوەکەیان.

من هەر وا ڕاوەستا بووم، چاوم تێ بڕیبوون. لەپڕ ئەو پیاوە سەری هەڵبڕیو سەیرێکی کردم وتی:

– تۆ، چ کارەیت؟

– هیچ؟!

– چۆن هیچ؟

– عەرزم کردیت، هیچ .

– هیچ....

– ئەی لێرە چی دەکەی؟

– هیچ ناکەم.

کابرا زۆری پێ ناخۆش بوو، وایزانی پێی ڕادەبوێرم، ڕوی کردە سەرۆك ئەندازیاران وتی:

– ئەمە کێیە؟

ئەویش وەك جنۆکەی چاو پێ کەوتبێ بە واق بونێکەوە ماوەیەك چاوی تێ بڕیم.

منیش کە هەستم کرد خەریکە کار گەن دەبێ بەترسو لەرزێکەوە وتم:

– جەناب، هاتووم کارێکم پێ بدەن.

کابرای سەرۆکی هەمووان وتی:

– چ کارێك دەزانی؟

– هەر کارێك بێ.

– ها؟ دیارە هەتیوێکی سوكو خوێڕیت کە ئامادەی کردنی هەر کارێك بیت!

سەرم داخستو ورتەم نەکرد.

وتی:

– خوێندەواریت هەیە؟

– بەڵێ.

ڕوی کردە سەرۆك ئەندازیاران و وتی:

– ئەمە بخەنە شوێنی وەسڵ نوسەکەی پێشوو، لەکوڕێکی خراپ ناچێ!

– فەرمانتە قوربان.

سەرۆك ئەندازیاران ئاماژەی بۆ یەکێکی دیکە کردو ئەویش چپاندی بەگوێمدا:

– وەرە بەدوامدا.

کاتێ هاتینە دەرەوە لەخۆشیاندا خەریك بوو شاگەشکە دەبووم. بەدوای ئەم کابرایەوە بەسەر خشتو چەوو لمدا باز بازێنم بوو. کاری دەستەی شەوانە دەستی پێ کردبوو، خەریك بوون بەخلۆکەی گەورە چیمەنتۆی ئامادە کراویان هەڵدەکێشا.

نەفەرێك لەسەر تاقێك وەستا بوو، فەرمانی بە کرێکارەکان دەدا. ئەو کابرایەی کە منی بردو بمناسێنی بەوەستاکە، هەر لەخوارەوە هاواری کرد.

– وەستا حەسەن ئەمە ئاغا ناردویێتی، وەستا حەسەن بێ ئەوەی

ئاوڕێك بداتەوە وتی:

– دەبێ چ كارێك بكات؟

– بیخە هەمان شوێنی وەسڵ نوسەكەی جاران.

هەروا كە سەری هەڵبڕی بوو فەرمانیدا وتی:

– ها، زۆر باشە، با بێت خەریكی كاری خۆی بێت! چاوساغەكەم گەڕایەوە بۆ نوسینگەو منیش چوومە لای وەستا حەسەن. وەستا تەنانەت سەیرێكی نەكردم وتی:

– تا ئێستا ئەمجۆرە كارانەت كردووە؟

دەمزانی بێت و ڕاستی بڵێم وەرم ناگرێ، بۆیە بەبێ سێ و دوو وتم:

– بەڵێ، چەن ساڵێ ئەم كارەم كردووە.

–زۆر باشە، كەواتە ئەركی خۆت دەزانی، هەر شتێ دێتە نێو كارگەوە وەسڵێكی بۆ دەنوسیت و دەینرێتە لای ئەنباردار.

– بەڵێ دەزانم.

پاشان وەستا لەناكاو قیڕاندی:

– هەی سەگباب، ئەو قاڵبەت بەهەڵە هەڵگرت، ئەوە شوێنی ئەو قاڵبە نییە.

پاشان بەدەم فەرماندانەوە بەسەر كرێكارەكاندا وتی:

– باش لەحیساب دەزانی؟

– بەڵێ قوربان.

– دەبێ لیستی كرێی كرێكارەكانیش هەر خۆت بینوسیت!

– بە سەر چاو.

دووبارە بەسەر كرێكارەكاندا قیڕاندیەوە:

– هەی كوڕی كەر، قاڵب ژمارە چوارت خستە كوێ، بڕۆ ئەو بەرەوە نەكەویت. تۆش وریابە هەڵە نەكەیت.

چونکه ئاوڕی نەدایەوە نەمتوانی تێ بگەم لەگەڵ منێتی یان فەرمان بەسەر کرێکارەکاندا دەکات.

وتم:

– لەگەڵ منتان بوو؟

– بەڵێ کوڕی خۆم کار بەشاوڵ بکە.

وامزانی شاوڵ ناوی یەکێی لەکرێکارەکانە وتم:

– بەچاوان، هەرچی بفەرموون ئەنجامی دەدەم.

– لەگەڵ تۆم نییە، هێی لەگەڵ تۆمە، ئەو تەنافە بگێڕە، تۆ دەبێ حسابی تێکڕای ئەو کەرەسانە بکەیت کە دێنە ئێرە، بەولایەدا نا، هەتیو بەملایدا بگێڕە.

خەریك بوو شێت دەبووم، سەرم لەقسەکانی دەر نەدەکرد، وتم:

– چی بگێڕم بەم لایەدا؟!

– لەگەڵ تۆم نییە، تۆ دەبێ حسابی چیمەنتۆو خشتو گەچ بەجیا جیا ڕابگریت.

– هێی کوڕە، ئەو خلۆکەیە ڕاکێشە، لە لایەك هاتووەکان دەنوسیو لایەکی دیکە ئەوەی دەچێتە دەرەوە، لەولایە نا کوڕە.

– ئەی لە کامە لای بنوسم؟

بۆ یەکەمجار تورە بوو ڕووی کردە لای منو وتی:

– بۆ لەتۆ زیاتر ئێرە کەسی دیکەی لێ نییە؟

– ببورە وامزانی لەگەڵ منت بوو!

– نا، برۆ زوتر دەسبەکاربە.

نەمدەزانی بۆ کوێ برۆم، خوایە دوای ئەم هەموو کلۆڵیە ئەمە چۆن کارێك بوو من دەستم کەوت.

وەستا حەسەن ڕوی کردە لای کرێکارەکان خەریك بوو فەرمانی

بەسەردا دەدان.

– قاڵبـە باتۆنـەکان بێننـە خـوارەوە، هـەتیو هێـشتا هـەر ڕاوەسـتاوی؟ دووبـارە نەمـدەزانی لەگـەڵ منێتـی یـان لەگـەڵ کرێکارەکـانێتی. هـەروا بێدەنگ وەستا بووم.

وەستا حەسەن قیڕاندی:

– زووکە ملت بشکێنە، بڕۆ خەریکبە.

وتم:

– بچم بۆ کوێ؟

– برۆ بۆ ئەنبار دەفتەرکان وەربگرە لەبیناکە.

بەڕێ کەوتم بڕۆم دەنگی وەستا حەسەن بەرز بویەوە:

– گێلی گێژ، دەتەوێ بۆ کوێ بڕۆی؟

گەڕامەوە بزانم بۆچی جنێووم پـێ دەدات، کەچی لەگـەڵ کرێکارەکـانی بـوو. چـوومە ئـەنبارو خـۆم بەئەنباردارەکـە ناسـاند، ئـەویش قاقایـەکی بەرزی لێداو وتـی:

– کێ تۆی ناردوە بۆ ئێرە؟

– وەستا حەسەن.

– تۆی بردە لای ئەو؟

– ئاغا.

– تۆ خزمی ئاغایت؟

خۆزگە زمـانم لاڵ بوایـەو وەڵامـیم نەدابایـەوە، ئەگـەر ئـەم زمانـە خـاوەن تۆپیوە کەمێ بەولادا بسوڕایە، درۆیەکم لـەقازانجی خـۆم کردبایـە ئێـستە ڕۆژو ڕۆژگاری من جۆرێکی دیکە دەبوو، منی گەمژە ڕێكو ڕاست وەڵامـم دایەوە:

– نـا، بابە. بـەزەیی جوڵاو فەرمانیـدا کـارێکم پـێ بدرێ، هەرکـە گوێی

لەمە بوو خێرا سیمای تێکچوو ڕیتمی گۆڕا، بەسوکایەتی کردنەوە وتی:

– بڕۆ بۆ ئەوێ لە ڕەفەکە دەفتەرەکانت هەڵگرەو خەریکی کاری خۆتبە.

دەفتەرکانم هەڵگرتو بەلام لەو خەت خەتێنە هیچ سەرم دەر نەدەچوو.

وتم:

– ئەم دەفتەرانە چین؟

بەتوانجێکەوە وتی:

– بەخوا جوانە بزانە لەگەڵ کێ تێکەوتوین، کوڕی باش وابزانم تازە لەقوتابخانە دەرچوی! گوێم بەتوانجەکانی نەدا وتم:

– نا، دڵنیابە من تەواو سەرم لەم حیسابو کیتابە دەردەچێ؟

دەفتەرکانم خستە بن دەستمو هاتمە دەرەوە:

"خوایە گیان چیم بەسەر دێت؟"

چۆن بوو ئەمانە بێ ناسراویی کاریان پێدام... ناشێ فێڵیکم لێ بکەن بەڕاست بۆچی موچەیەکیان بۆ دیاری نەکردم؟ ئەمەش لەولاوە بۆستێ چۆن باوەڕیان پێ کردم؟

خەریکی سێو دووی ئەم بیرو خەیاڵە بووم، وەك کەسانی مەستو سەرخۆش دڵم دەشێواو سەرم گێژی دەخوارد، هەستم کرد ئەم کاسەیە بێ ژێر کاسە نییە، خوایە بەگەورەیی خۆت ئاقیبەتی گشت لایەك بەخێر بگێڕیت.

دووبارە چوومە لای وەستا حەسەن، ئەو هەروا بەگەرمو گوڕییەوە خەریکی دەرکردنی فەرمانی سەیرو سەمەرە بوو، وچانێکم گرتو لەدەرفەتێکدا کە وەستا حەسەن بێدەنگ بوو وتم:

– قوربان، ئێستا دەبێ چی بکەم؟

دیسان بێ ئەوەی ئاوڕێکم لێ بداتەوە وتی:

– لە بەیانیەوە دەسبەکاربە، سەعات حەوت و نیو دەبێ لێرە بیت ئاگات لەخۆت بێ هەڵنەخلیسکێی.

لەخۆمەوە سەیرێکی بەر پێی خۆم کرد هیچ شتێ لە ژێر پێمدا نەبوو لێی هەڵخزێم، تێگەشتم دیسان لەگەڵ کرێکارەکانێتی.

نەمدەزانی چارم چییە، شوێنێکم نەبوو تا سبەی پشووی لێ بدەم، هەروا کە مەتەقم لەخۆم بڕی بوو وەستا حەسەن قیڕاندی:

– چییە بۆ وەستاوی؟

نەمئەزانی لەگەڵ منێتی یان لەگەڵ کرێکارەکان، دەشترسام پرسیارێك بکەم.

وەستا حەسەن توندتر قیڕاندی:

– لەگەڵ تۆمە گەمژە!

بە ترس و لەرزێکەوە وتم:

– شوێنێکم نییە بۆی بچم.

زۆر تورە بوو، ئاوڕێکی لێ دامەوە ئەوە بۆ یەکەمجار بوو سەیرم بکات لەژێر لێوەوە وتی:

– لەگەڵ تۆم نەبوو لەگەڵ کرێکارەکانمە.

پاشان بەدەم ئاوڕدانەکەیەوە وتی:

– بڕۆ لەزمانی منەوە بە ئەنباردار بڵێ جێیەکت پێ بدات لێی بخەویت.

تێگەشتم ئەمجارەیان لەگەڵ منێتی، بەو دەفتەرانەی لە بن دەستم نابوون گەڕامەوە لای ئەنباردارو ئەویش بە چاوێکی پڕ لە سوکایەتی کردنەوە ئاماژەی بۆ دالانێکی تاریك و درێژ کرد وتی:

– برۆ لەوێ لەتەنیشت کرێکارەکانەوە بخەوە.

ئەو شوێنەی نیشانیدام دالانێکی شێدار بوو، دە پانزە کەسێك لە

کرێکارەکان هەر یەکەو دوو سێ پارچە دارو تەختەیان دانا بوو لەسەری ڕاکشا بوون، دەنگی پرخ و هوڕیان مێشکی بنیادەمی دەبرد ئەتوت سازەکانیان کۆك دەکەن.

"خودایە، من بەهەموو ژیانم لەسەر دۆشەکی گەرم و نەرم خەوتووم چۆن لێرە بخەوم؟"

لەلایەك سەرماو لەلایەکی دیکەوە دەنگی پرخ و هوڕی کرێکارەکان هێندە بێزاریان کردم تا بەیانی ساتێ خەو نەچوە چاوەکانم.

بەو حاڵە لە بەیانیەوە دەسبەکار بووم، کاری من ڕاگرتنی حسابی چەو و لم و چیمەنتۆو ئەو جۆرە کەرەسانە بوو، کە لە ئەنبارەکەوە دەدرانە وەستاکان، بۆ هەر یەکێکیان دەفتەرێکی تایبەتم هەبوو. بێجگە لەنوسینی جۆری کاڵاو چەشنەکانیان لەگواستنەوەی فەردەو کیسە چیمەنتۆو گەچ و ئەو جۆرە شتانەدا هاوکاری کرێکارەکانم دەکرد.

وێڕای ئەمانەش دەبوو لیستی کرێکارەکان وەربگرم ڕۆژانی شەممە کرێکانیان پێ بدەم. بەهەر کولەمەرگیەك بوو کارەکانم دەکردو وردە وردە لەکارەکانمدا سەر ڕاست دەبووم و کەسەکانم دەناسی. ڕۆژی شەممە هەقی ئەو هەفتەیەیان پێ دام کە ڕۆژی دوو لیرەو نیو بوو، هەر کەسێکی دیکە لەجیاتی من بوایە دوکەڵ لەتەوقی سەرییەوە دەردەچوو، بەڵام من گوێم پێ نەدا لەدڵی خۆمدا دەموت: "بەو زوانە دەبیتە خاوەنی نیوەی موڵکی ئەم شارە." بڕیارمدا هەر لەو پارەیە ڕۆژانە پەنجا قرۆش پاشەکەوت بکەم. شەوانە دەڕۆشتمە سەربان و پارە وردەکانم هەژمار دەکردو لەوێوە لەدیمەنی شار ورد دەبومەوەو نەخشەم دەکێشا.

سێ هەفتە بوو لەوێ کارم دەکرد، پاشکەوتم گەشتبویە چواردە لیرەو هات بەخەیاڵمدا حەو هەشت لیرەیەك بۆ دایکم بنێرم و باسی حاڵی خۆمی بۆ بکەم. بۆیە ڕۆژێ دەمەو عەسر چومە لای وەستا حەسەن و نیو

سەعاتێ مۆڵەتم لێ خواست.

وەستا هەر لەدوورەوە کە چاوی پێم کەوت ڕوی خۆی وەرگێڕاو لەگەڵ کرێکارەکان کەوتەوە هاوارەو قیڕە؟

– کوڕە ئەو ئاسنانە چەن سانتی مەترین؟ سیمەکان توند ببەستن! چیت دەوێ؟ تێگەشتم قسەی ئاخریی لەگەڵ منی بوو فریای وەلامدانەوە نە کەوتم دیسان لەگەڵ کرێکارەکان تێ هەڵچویەوە.

– کوڕە ئەو ئاسنە جوان بابدە... سەری ئاسنەکە بقرتێنە، دە بڵێ بۆ قسە ناکەی؟

خەریك بوو قسە بکەمەوە وەستا نەیهێشت دەم بکەمەوە.

هێندە توڕە بووبووم وەك داربی دەلەرزیم، بەپەلە چوومە بەردەمی قسە بکەم بەلام دووبارە پشتی تێ کردمەوە، خەریك بوو کار لە کار بترازێ خوا ڕەحمی کردو ئەنباردار بانگی کردم:

"وەرە تەختە هاتووە وەریان بگرە."

لۆریەکی پڕ لە تەختە لەبەر دەمی ئەنباردا وەستا بوو، قۆنتەراتچیەکە لەتەنیشتەوە وەستا بوو. بەڕاکردن چووم دەفتەرکانم هێنا... قۆنتەراتچی بەپێکەنینێکی تایبەتەوە هاتە تەنیشتمەوە وتی:

– وەسڵی ٢٤ مەتری شەش گۆشەم بۆ بکە... من لەکاردا زۆر بەدیقەت بووم چونکە نەمدەویست ڕەخنەیەکم لێ بگرن و دەرمبکەن. وتم:

– مۆڵەت بدە با پێوانەیان بکەم.

قۆنتەراتچی ئێقێکی هاتەوە:

– پێوانەی چی؟ تۆ هاتوی یاسامان بۆ دابنێی، خێرا وەسڵەکەم بۆ بکە درەنگە، پەنجەکانی بەجۆرێکی تایبەت لێك گیرکردن مەبەستی لە بەرتیل دان بوو.

من خۆم لەگێلی داو وتم:

– پێوانە کردن شتێکی ئەوتۆ نییە، هەر ئێستە تەواو دەبێ، پاشان بێ ئەوەی تەماشای سەرو سەکوتی بکەم دەستم کرد بەپێوانە کردن.

قۆنتەراتچی کە زۆر پێی ناخۆش بوو وتی:

– دیارە تۆ باوەڕت بە ئێمە نییە؟

– خوا نەخواستە بۆچی باوەڕم پێتان نییە؟

– ئەی بۆچی پێوانەی تەختەکان دەکەی؟

– چونکە دەبێ من تەسلیم بە ئەنباری بکەم.

کابرا، چەقۆت لێ بدایە خوێنی لێ نەدەهات بەتوانجێکەوە وتی:

– کێ ئەم هەتیوە لوسکەلەیەی هێناوەتە ئێرە؟

من وەڵامم نەدایەوە. دوای پێوانەکردنی تەختەکان. ١٨ مەتری شەش گۆشە واتە شەش مەتر کەمی هێنا.

قۆنتەراتچی بەتوڕییەوە چوە لای ئەنباردار. من دەمویست سەرلەنوێ بەدیقەتەوە پێوانەی بکەمەوە، ئەنبارداروقۆنتەراتچی پێکەوە هاتن بۆ لام، ئەنباردار بەزمانێکی شیرین و دۆستانەوە وتی:

– بۆچی هێندە خۆت ماندو دەکەی؟ وەریان بگرەو وەسڵی بۆ بکە.

سەرم هەڵبڕی چاوم بڕییە چاوی ئەنبارداره‌کە.

– وەسڵی چی بۆ بکەم شەش مەتری شەش گۆشەی کەمە.

– هەڵەت کردووە حەتمەن تەواون.

– باشە لێگەڕێ دەیپێومەوە.

– نا خۆت ماندو مەکە.

– ئاخر ٢٤ مەتر نییە، ئەو کەمەی لەکێ وەربگرمەوە؟

– من قبوڵمە.

لەقسەی ئەنبارداره‌کە مات بووم:

– واتا تۆ وەسڵی ٢٤ مەترم پێ دەدەیت؟

- بەڵێ.

ڕاستیشی دەکرد، ئەوساش هەرچیەکی لێ وەرگرتبام هیچ هەق و حسابێکی نەبوو، هەرچیم بووتبایە ئەو قبوڵی دەکردو وەسڵی بۆ دەکردم، دیارە ترسێکی لەوان نەبوو، کە تەواوە بەڵام ئەمەیان چی؟

قۆنتەراتچی دەلیرەی بۆ ڕاگرتم:

- وەرە بابە بیگرە، هێندە گەورەی مەکە، تۆ گەلێ زوو ددانت دەرهاتوون.

ئەنباردار قاقا پێکەنی و بەقۆنتەراچیەکەی وت:

- بەخوا کوڕێکی زۆر چاك و گوێڕایەڵە.

من هەروا واق بووم، تەماشای ئەوانم دەکرد.

قۆنتەراتچی هەروا دەستی ڕاگرتبوو، ئەنباردار ئاماژەیەکی بۆ کردم:

- ئاغا، دەستی ڕاگرتووە، لێی وەربگرە.

من کەمێ کشامەوە دواوە:

- زۆر سوپاس، من بەرتیل وەرناگرم.

لەپێوانەکردن بەردەام بوومەوە، ئەنباردار چپاندی بەگوێی قۆنتەراتچیەکەدا:

- ڕەنگە دە لیرەی پێ کەم بێت کە وەرینەگرت.

قۆنتەراتچی بە بۆڵە کردنەوە وتی:

- دیارە گەلێ لە ئێمەومانان زیرەکترە.

ئەمجارە دە لیرەی دیکەی خستە سەر.

- ها، بگرە دیارە درەنگ هاتویو دەتەوێ زوو بڕۆی!

- من پارەم ناوێ لێگەڕێ بەوردی پێوانەکان بکەم.

- هەتیو، خراپ دەشکێتەوە بەسەرتدا.

دووبارە گوێم پێ نەداو خەریکی پێوانەی خۆم بووم. ئەمجارە

قۆنتەراتچی بەقین و تورەییەکی بەتینەوە وتی:

– چیتر هەرچیت بەسەر دێت لەچاوی خۆتی بناسە!

پاشان هاواری کرد:

– وەستا حەسەن ... چەن خولەکێ تا ئێرە وەرە.

وەستا حەسەن بەپەلە هاتە بەر دەمی، قۆنتەراتچی وەکو سەگێکی نیشان بدات ئاماژەی بۆ کردم:

– ئەم ئەنتیکەیەتان لەکوێوە هێناوە، مەگەر قاتیی بنیادەم بوو؟

وەستا حەسەن دووبارە پشتی تێکردمەوە وتی:

– مەگەر، کارێکی خراپی کردووە؟

دڵنیا بووم وەستا حەسەن هیچ لە مەسەلەکە نازانێ ئەگەر تێ بگات ئەوا لایەنی من دەگرێ ... گۆڕی بابی قۆنتەراتچی هەڵدەتەکێنێ.

ویستم بەوپەڕی شانازییەوە باسی مەسەلەکە بکەم بەڵام، قۆنتەراتچی قسەکەی پێ بڕیم:

– نازانم مەبەستی چییە؟ هێندە تەشقەڵەمان پێ دەکات؟

وەستا حەسەن هێشتا هەر پشتی لە من بوو وتی:

– بۆچی ئەو تەختانە وەرناگریت؟

– زۆریان کەمە، ١٨ مەتری هێناوە، داوای وەسڵی ٢٤ مەتر دەکات.

وەستا حەسەن بەجدیەکەوە وتی:

– مەیوەستێنە خێرا وەسڵەکەی بۆ بنوسە.

بەخەیاڵی خۆم چونکە پشتی لە من بووە لەقسەکانم تێ نەگەیشتووە بەرزتر وتم:

– وەستا ئەو برە کەمەی چی لێ بکەم؟

– پەیوەندی بەتۆوە نییە، تۆ تەسلیمی ئەنباری بکەو وەسڵی ٢٤ مەتر وەربگرە.

وەکو کەسێکی سەرخۆش سەرم گێژی دەخوارد نەمدەتوانی لەقسەکانیان بگەم، گومانم نەبوو لەوەی موویەك لەم ماستەدایە. بەلاّم بە زیانی کێ دەشکێتەوە ئەمەیانم نەدەزانی. حاڵەتێکی سەیرم هەبوو، منێك تا ئێستا هەر کاتێ ناوی دزیم ببیستبایە مۆرەغەی پشتم ئارەقی دەکردو کوڕەکانیش هەر لەبەر ئەمە ناویان نابووم گێلە، ئێستا دەبێ خۆم ببمە شەریکە دزی خەڵکی و واژۆی قەواڵەکەشیان بۆ بکەم.

– وەستا، بەرپرس دەبمو ناتوانم.

– بەرپرسی چی؟ تۆ وەسڵی هەر چەن بنوسیت هێندەش لەئەنبار وەردەگریتەوە.

– وەستا، ئەی ئەو شەش مەترە کەمە چی لێ دێت؟

هێندە تورە بوو وتم ئێستا دوو سیخورمەم تێوە دەژەنێ.

– ناینوسم، ویژدانم ڕێم پێ نادات فێڵ بکەم.

وەك بڵێی ئەمجارە زۆر لەبەر دڵی گران بوو کەمێ دەنگی نزم کردەوە:

– کوڕەکەم چ پەیوەندییەکی بەتۆوە هەیە؟ خۆ لەکیسەی کەس دەرناچێ، ٢٤ مەتر هاتووە، ٢٤ مەتریش دەردەچێت، ئەمە زیانی لەکوێدایە؟

وتم:

– ناتوانم وەسڵی بۆ بکەم.

– هەتیو لەکەلەی شەیتان دابەزە، دەرت دەکەم.

– منیش دەچمە لای ئاغاو سکالاّ دەکەم.

– ئێستا ئاغایەکت پێ نیشان دەدەم حاڵیت بکات.

وەستا حەسەن و قۆنتەراتچی بەپەلە بەرەو ژووری ئەندازیاران ڕۆیشتن، ئەنباردار وەکو کەسێ لەسەر تەرمی باوکی وەستابێت سەری نابوو بەلارەوە لەبەر دەرگای ئەنبار وەستا بوو، کاتێ ئەوان ڕۆیشتن

وتی:

– کارێکی باشت نەکرد بەقسەی وەستا حەسەنت نەکرد بیست لیرەشت لەکیسی خۆتداو لیرەش دەرت دەکەن، بنیادەم نابێ هێندە کەللەشەق بێ، ئەو داماوەش ناچارە بیکات بەقورگی هەموانداو پیاوێکی دەستو دڵ فراوانیشە کە بیست لیرەی بەتۆ دەدا.

وتم:

– باشە کێ زیانی ئەو تەختانە دەبژێرێت؟

– هیچ کەسێ.

– شتی چاك بڵێ بابە گیان چۆن شەش مەتر تەختە دیار نامێنێو کەسیش زیان ناکا؟

– تەنها کەسێ زیان دەکا ئەویش تۆی کە هەم بیست لیرەکەت لەکیس خۆتتدا هەم دەریش کرایت.

لەم کاتەدا کرێکارێك هات وتی:

– ئاغا کاری پێتە!

– زۆرم پێ خۆش بوو، ئێستە هەموو شتێ دەردەکەوێو ئاغاش خۆشحاڵ دەبێ بەوەی گەنجێکی دەسپاکی وەك من لەم کۆمپانیایەی ئەودا هەیەو بەرژەوەندی ئەو دەپارێزێ، بێگومان موچەکەم بۆ زیاد دەکاو وردە وردە ڕێگەی سەرکەوتنم بۆ واڵا دەبێ! بەبزەیەکەوە چوومە ژوورەکەی. وەستا حەسەنو قۆنتەراتچی لەوێ بوون، ئاغا بەمۆڕە کردنەوە وتی:

– بۆچی وەسڵی ئەودارانە نانوسیت؟

– قوربان ١٨ مەتری هێناوەو وەسڵی ٢٤ مەتری دەوێ...

ئاغا زۆر بەهێمنی وتی:

– باشە، چ پەیوەندیەکی بە تۆوە هەیە؟ تۆ وەسڵی بۆ بکەو. تەسلیمی

ئەنباری بکەو وەسڵی ٢٤ مەتریش وەر بگرە! زۆرم پێ سەیر بوو خەریك بوو شاخم دەردەکرد، ئەرێ... خۆ ئەمیش هەروا دەڵێ! تفێکم قووتدایەوە وتم:

– ئاغا وابزانم نەمتوانی بەجوانی مەسەلەکەت عەرز بکەم، ١٨ مەتر تەختەی هێناوە ٦ مەتر کەمەو داوای وەسڵی کەمەش دەکات...

– تێ دەگەم کوڕم... وەك تۆ گێل نیم، پێم وتی بەتۆ چی، وەسڵی بۆ بکەو بابڕوات.

دووبارە نەمتوانی باوەڕ بکەم ئەم کارە عەیبێکی نییە.

– مۆڵەت دەدەن زیاتر ڕوونی بکەمەوە؟

ئاغا قیڕاندی:

– زۆر چەنەبازی دەکەی کە دەڵێم وەسڵی بۆ بکە بڵێ بەچاوان. لەم کاتی وڕو کاس بوونەمدا هیچ نەمابوو ملی پیاکەم خێرا وەخۆ کەوتمەوە وتم: "قوربان ئاخر..."

ئاغا پێکەنینی بەو گێلی و نەفامیەی من دەهات.

– بڕۆ لەخۆڕا کارەکان دوامەخە وەسڵی ٢٤ مەتر بنوسەو دواتر هیچ نابێ.

– گەورەم شەش مەترە کەمەکەی چی لێ دێت؟

ئەمجارەیان ئاغا بەتوڕەییەوە نەڕاندی :

– کەرە، بە تۆ چی، مەگەر تۆ هاتوی بۆ فزولیی کردن، تا ئێستا کەسی وەك تۆ شێتو پەتەڕیم نەدیتوە...

پاشان ڕوی کردە وەستا حەسەن وتی:

– ئەم کەرەتان لەکوێ هێناوە؟

– ئێمە نەمان هێناوە خۆتان ناردوتانە!

– من؟ کەی؟ ئەو وەسڵ نوسەی پێشوو زۆر کوڕی باش بوو.

قۆنتەراتچی تا ئەو کاتە بێدەنگ بوو هاتە گۆ وتی:

– ئەمیش تا ئێستا هێندە نارەسەن نەبوو، نازانم ئەمرۆ بۆچی جنۆکە لە کەللەیداوە!

بەم قسەیەدا تێگەشتم تا ئێستا کلاویان لەسەر ناوم چەو و لەو چیمەنتۆیان بەزیاد حساب کردووە.

ئاغا وتی:

– ناوت چییە؟

– فەرید.

– تا پۆلی چەندت خوێندووە؟

– تا پۆلی شەشی ئامادەیی.

– بۆچی تەواوت نەکردووە؟

– چونکە فێری درۆ کردن نەبووم هەموو بەسەرهاتی خۆم هەر لە سیر هەتا پیاز بۆ گێڕایەوە.

ئاغا وتی:

"ها... دیارە زۆر سەگو سەگباب بوی وا لەقوتابخانە دەریان کردوی، پاشان ڕوی کردە وەستا حەسەن.

– کێ بەئێوەی وتووە ئەم دزە نەدیوو نەناسە دامەزرێنن!! ئەمە کەی جێی متمانەیە؟ ویستم شتێ بڵێم بەلام ئاغا نەیهێشت.

– بڕۆ ونبە لەبەر چاوم تۆ شایانی کارکردن نیت.

– قوربان ئاخر...

هاواری کرد:

– وتم، بڕۆ ونبە تا بەر شەقم نەداویت...

زانیم چیتر شوێنی وەستان نییە، بەرەو ئەنبار گەڕامەوە تاکو کەلو پەل و جلەکانم کۆ بکەمەوەو بڕۆم بەدوای کارێکی دیکەدا بگەڕێم.

ئەنباردار وتی:

– چی بووە؟

– دەریان کردم.

– تۆ بەم کەللەشەقیەتەوە ناتوانی لەهیچ شوێنێ کار بکەی!

بەئەنباردارم وت:

– پرسیارێکم هەیە، کاتێ هەر شتێك دێتە ئەنبارو دەردەچێتەوە ئەگەر هەق‌و حسابێکی نەبێت بۆچی منتان دامەزراندووە؟

ئەنباردار قاقایەکی لێدا وتی:

– هەبونی کەسێکی وەسڵ نوس هەر بۆ ڕوکەشە.

وتم:

– لەشتێکی دیکەش سەرم دەرنەچوو، ئاغا دەیوت: ئێمە پیاوی جێی متمانەمان دەوێ. کەسێ هەموو شتەکان بەکێشانەو پێوانە وەربگرێ کەی جێی متمانەیە؟

ئەنباردار وتی:

– پێم ڕادەبوێری یان بەڕاستی دەتەوێ ڕاستەقینە بزانی؟

– بەخوا دەمەوێ ڕاستی بزانم.

– پیاوی جێی متمانە ئەوەیە بەبێ پرسی لەخۆی بەرەو ژوورتر هیچ کارێ نەکات، لەو کاتەی ئەم بینایە دروستکراوە تا ئێستا نۆ وەسڵ نوسیان گۆڕیوە هەشت دانەیان دز بوون تۆیش بەهۆی گەمژەییەوە لەکارەکەت دەرکرایت!

– دەبێ بمبوریت پرسیارێکی دیکەم هەیە؟.

– بپرسە.

– لەم گێرەو کێشەی ئەو داروتەختانەی منیان لەسەر دەرکرد کێ باجەکەی دەدات؟

– هیچ کەسێك.

– خەریکە شێت دەبم ئەی ئەو ٦ مەترە تەختەیە چی لێ دێ؟

لەو کاتەدا دەنگی وەستا حەسەن لەدوامەوە بەرز بویەوە هاواری کرد:

– هێشتا نەڕۆشتوی؟ خێرا کەلوپەلەکانت هەڵگرەو ونبە لەبەرچاوم!

بەئەنبارداەکەی وت:

– خێرا ئەم سەگە بکەنە دەرەوە!

کراس و بیجامەکەم لەرۆژنامەیەکەوە پێچاو خستمە بن دەستم و هاتمە دەرەوە. بێ ئەوەی بزانم بۆ کوێ دەڕۆم ملی کوچەو کۆڵانم گرت و لەلایەك بیرم لەکڵۆڵی و دەربەدەریی خۆم دەکردەوە لەلایەکیش هەر ئەوەم لێك دەدایەوە ئەو شەش مەترە تەختەیە بۆ کوێ دەچێت!

چەن ساڵێ دوای ئەوە وەڵامی پرسیارەکەم بۆ ڕوون بوویەوە، ئەوەی لەو بەینەدا زیانی دەکرد تەنیا دەوڵەت بوو، ئاغای قۆنتەراتچی گەورە بوو، ئەم بیناو شوقانەی بەقۆنتەرات لەدەوڵەت وەرگرتبوو.

تێکرای ئەو پێویستیانەی دەهاتە ئەنبارو وەسڵیان بۆ دەکرا، حسابیان لەسەر دەوڵەت بۆ دەکراو پارەشیان وەردەگیرا، کاکی قۆنتەراتچی سەردەستەی دزەکان بوو، هاوکات قایلیش نەبوو هیچ کەسێ هێندەی نوکە دەرزیەك لەو هەموو دزی و گەندەڵیەی ئەو بدزێتەوە. دوای چەن ساڵێ تێگەیشتم دزە گەورەکان دزی بچوك وەبەر دێنن، بەڵام بێت و لەو بڕەی بۆیان دیاری دەکەن زێدەتر بدزن ئەوا جێی متمانە نین.

لەدالانەکەوە دەنگی ئەفسەری ئێشك بەرز بویەوە:

بچنەوە ژوورەکانی خۆتان.

ژاوە ژاوی زیندانیەکان بەرزتر بویەوە، دەنگی خشپە خشپی قاچی هەندێکیان بەتایبەت دەکۆشان پێڵاوەکانیان بەزەویدا بخشێنن دەنگێکی

بێزارکەریان بەگوێی بنیادەمدا دەدا.

یاڵلا خێراکەن دەمەوێ سەرژمێرتان بکەم.

بـۆ سـاتێك ژاوە ژاوەکـە نـەما، هـەموو زیندانیـەکان چـوونەوە قاوشـەکانیان، ئەفـسەری ئێـشك و بەنـدیوان هاتنـە ژوورەکانـەوە دوای ئەوەی سەرژمێری هەموویان کرد، بەندیوان بەتوانجێکەوە دەیوت: –خوا هەمووتان ڕزگار بکات!

ئەفـسەری ئێـشك کاتـێ هاتـە نێـو ژوورەکـەی ئێمـەوە لـەدیتنی گێلـە قاقایەکی بڵندی کێشا.

– پیرۆزە جوان یەککەوتون دەڵێی بۆ یەکتریی تاشراون!

گێلە سەرێکی هەڵبڕیی:

– چی بکەین بەگم ... دەبێ هەرچۆنێ بووە ژیان بەڕێ بکەین.

بەندیوان بە زمانلوسیەکەوە وتی:

– ئاگات لەم کاکەیە بێت نەیڵی نارەحەت بێ ئەنجا پەتت بانەکەوێتە سەر ئاو خۆت ئەزانی کاکم ڕۆژنامە نوسەو ڕۆژنامە نوسەکانیش بەڵێ. ها ها!! ها ها!!

لەبری ئەوەی قسەکەی تەواو بکات جۆرە پێکەنینێکی کردو من بۆم تەواو کرد وتم:

– لاپرسن! "فزولن".

– ببورە، من جورئەتی ئەوە ناکەم.

ئەفسەری ئێشك و بەندیوان ڕۆشتنە دەرەوە بەجێیان هێشتین.

گێلـە، لەسـەر چـەرپاکەی ڕاکـشا چـاوی بڕییـە ئـەو تابلۆیـەی بەدیوارەکـەوە هەڵواسـرا بـوو بەخـەتێکی نـاخۆش نوسـرا بـوو "خوایـە ڕزگارم بکە." لە دەریای بیرکردنەوەدا نووقم بوو.

دڵـم نـەهات ئـەو فەزایـەی لـێ تێـك بـدەم منـیش ڕاکـشام و کەوتمـە

خەیاڵەوە.

لە نێوانی خەون و بێداریدا بووم، دەنگی هاوارێکم بیست و ڕاچەنیم، لەجێگەکەم هاتمە دەرەوە بینیم دەنگی گێلەیە، تومەز خەونێکی ناخۆشی دیتوەو ڕاچەنیوەو قیژاندویێتی.

خۆیشی ناڕەحەت بوو لێم پرسی:

– چی بوو؟

– هیچ، خەوێکی ناخۆشم بینی و زۆر ترسام.

بۆ ئەوەی ناڕەحەتی لەبیر ببەمەوە وتم:

– پاشماوەی بەسەر هاتەکەت بۆ تەواو نەکردم.

گێلە ڕوی تێکردم:

– چییە، ئەڵێی دڵنیایت لەوەی سبەی بەر دەبیت دەتەوێ ئەمشەو هەمووت بۆ بگێڕمەوە؟

– ئەوەیان بەدەست خوایە.

گێلە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا:

– خۆزگەم بەخۆت هیوات بەژیانە، بەڵام منی نەگبەت چی؟ بێت و بەریشم بدەن پاش هەفتەیەك دەبێ بێمەوە ئێرە... چونکە شوێنێکم نییە بۆی بڕۆم.

گریانێکی بەتین گەروی گرتبوو وتم:

– باشە بەسەرهاتەکەم بۆ بگێڕەوە!

– بەڵێ، هەربەو جۆرەی سەرم داخستبوو مات و مەلول بەکۆڵانەکاندا ئەسوڕامەوە لەپشتەوە گوێم لێ بوو یەکێك بانگی دەکردم: "هێی فەریدە گێل."

زۆر سەرم سوڕما، ئەمە کێیە لەقەبی من دەزانێ هەرکە هەڵگەڕامەوە بیبینم هەردو دەستی کردە ملم، ناسیمەوە، "نەجدەت"ە هاوپۆلیە

کۆنەکەم کە ساڵێ زوتر لەمن لەقوتابخانەی سەربازی دەرکرابوو. جل‌و بەرگی زۆر شیك‌و نایاب بوو، لە سەرسامیدا واق بووم...

نەجدەت، هەمیشە گیرفانی بەتاڵ بوو، هیچ کاتێ نەیدەتوانی بچێتە سینەمایەك، بەهۆی نەداری‌و تەنگدەستیەوە رۆژانی پشوو لەقوتابخانە دەمایەوە ئێستە ئەم دەبدەبەو ئۆتۆمبێلە مۆدێل بەرزەی لەکوێ بوو؟

نەجدەت دەستی خستە سەر شانم وتی:

– فەرید، خەریکی چیت؟

– بەسەرهاتی خۆمم بەکورتی بۆ باسکرد، زۆر پێکەنی قۆڵی گرتم وتی:

– باش بوو یەکتریمان بینی، بیری لێ مەکەوە خەمت نەبێ بەرەو ئۆتۆمبێلەکەی خۆی بردمی، سوار بوین‌و کەوتینە رێ، بەدەم رێگاوە من قسەم بۆ دەکردو ئەویش پێدەکەنی.

لەیەکێ لەشەقامە گەورەکان لەبەر دەم بالاخانەیەکدا وەستا.

ئێرە ماڵی هاورێکەم بوو، لەنایابی کەلو پەلی ماڵەکەی سەرسام بووم، خواردنەوەیەکی بۆ هێنام ناویشیم نەدەزانی، لەبرسا خەریك بوو دەمردم، کاتێ ئەو خواردنەوەیەم خواردەوە زیاتر پەرێشان بووم، بەدیوارەکەوە چاوم بەبڕوانامەیەکی کۆلێژی مافی نەجدەت کەوت زیاتر واق بووم بەخۆمم وت:

"ئەمە ساڵی پار لەناوەندی دەرکرا ئەمساڵ چۆن کۆلێژی تەواو کرد؟"

نەجدەت، کەزانی تێك چووم بەغرورێکەوە وتی:

– دەبینی ئەوە بڕوانامەی منە؟

– باشە چۆن بەماوەی ساڵێك کۆلێژت تەواو کرد؟

نەجدەت بەپێکەنینێکی لاقرتیانەوە وتی:

– سبەی بڕوانامەیەکی ئاوا بۆ تۆش وەردەگرم!!

هەر وەك بیەوێ لەدوكانێكی وردەواڵە فرۆشی قاپە ماستێكم بۆ بكڕێت، هەروەك لەو ژوورەدا نمونەكەی لەپێش چاوم بوو، بەڵام بەلامەوە ناباوەڕی بوو كە ڕاست دەكات.

نەجدەت، ئەوشەوە لەگەڵ خۆی بردمی بۆ گەڕانو بەلێشاو پارەی خەرج دەكرد بەجۆرێ دەیوست پارەو سامانی خۆیم نیشان بدات، تا ئەو شەوە من ئەو شوێنو ژنە ناسكو نازدارانەم نەدیتبوو.

تا ئەو كاتەی ئاگام لەخۆم بوو دەمزانی بردمیە پێنج شەش "باڕ"ێكو دوایش بردبومیە هۆتێلێكو لەوێ خەواندبومی.

سبەی كە بێدار بوومەوە زۆر سەیرم لەخۆم دەهات، دوای چەن مانگێك ئەوە یەكەمجار بوو لەسەر دۆشەك بخەوم... هێندە وڕو كاس بووم نەمدەتوانی بێمەوە سەر خۆم، تا بزانم لە كوێمو خەریكی چیم. بۆ چەن خولەكێ حاڵەتێكی مەستیو لەزەتبەخشم بەخۆمەوە بینی، دوسێ جار دەستەكانم كردنەوەو لەسینەی خۆمم دان لەپڕ بەهۆش هاتمەوەو لەجێگەكە دەرپەڕیم.

"ئێرە كوێیە؟"

كە سەیری دەورو پشتی خۆم كرد، زانیم هۆتێلێكی نایابە، وردە وردە بیرم كەوتەوە دوێنێ شەو لەگەڵ نەجدەت بوومو دیارە دوای ئەوەی كە تێكچووم نەجدەت هێناومێتیە ئێرە، بەڵام ئێستا دەبێ كرێكەی چەن بێ؟

هەروا ماتو مەلول وەك داهۆڵی سەر خەرمان بێ هەستو خواست لەسەر تەختی نوستنەكە دانیشتبووم، لەپڕ بەچەن لێدانێك لەدەگاكە درا.

بەندی جەرگو هەناوم پسا، خۆم بۆ بێنەو بەردەی خاوەن هۆتێل ئامادە كرد.

خۆی بوو "نەجدەت" بەخۆشی و پێکەنینەوە هاتە ژوورەوە هاواری کرد:

- هێشتا هەر خەوتوی؟

- بۆچی سەعات چەندە؟

- نزیکی نیوەڕۆیە، هەستە خێرا خۆت بگۆڕەو با بڕۆین.

کاتێ لەهۆتێلەکە هاتینە دەرەوە نەجدەت وتی:

- دوو وێنەی بچوکی خۆتت پێیە؟

- وێنەی منت بۆچییە؟

- بڕوانامەکەت ئامادەیە تەنها وێنەی خۆتی دەوێ پێوەی بچەسپێنم.

- وێنەم پێ نییە.

لە کۆلانێکدا چەن وێنەیەکی خێرامان گرت، پێکەوە چوینەوە بۆ مالی خۆیان، بڕوانامەکەم ئامادە بوو. بەدیار چاوی خۆمەوە دەسبەجێ وێنەکانی پێوە چەسپاندو مۆرێکی لێداو واژوی کرد.

- بفەرموو ئەم بڕوانامەیە کێشەکانت یەکلایی دەکاتەوە، ئێستا هەموو دەرگاکان بەڕوی تۆدا والایە، تا ئێرە ئەرکی من بوو لێرە بەدواوە خۆتو هیمەتی خۆت!

- سوپاست دەکەم، زەحمەتێکی زۆرت بۆ کێشام، نەجدەت قاقایەکی لێدا.

- ناشێ بەبڕوانامەی ئامادەیی قایل نەبیت بڕوانامەی کۆلێژت بوێ؟

- نا، وا نییە، ئەوەی راستی بێ لەو چەشنە کارانە دەترسم، دەمەوێ بەسەربەرزی ژیان بەرێ بکەم تیکە نانێکی حەلال بەدەست بێنم.

نەجدەت، بە واق بونێکەوە سەیری کردم:

- بەڕاستیتە... دەترسیت؟

- ئەرێ بەگیانی تۆ، دەمەوێ لەژیانمدا هەرگیز کارێکی خراپم لێ

نەوشێتەوە.

شانەکانی هەڵتەکاندو بزەیەکی لاقرتیانەی کرد:

– زۆر باشە، خۆت دەزانی ئیشەڵڵا سەرکەوتوو دەبیت، هێندە بەساردو سڕی قسەکەی کرد لەڕووم نەهات کەمێ پارەی لێ قەرز بکەم.

– خوا حافیز، نەجدەت.

– خوات لەگەڵ.

نەجدەت، ڕێگەیەکی بۆ من دۆزیبویەوە هەرکەسێکی دیکە بایە پەسەندی دەکرد، بەلام من نەمدەویست لەو کونەوە بچمە نێو ئەو ڕێگایەوە... حەزم دەکرد دەرگا داخراوەکان بەزۆری بازوی خۆم بکەمەوەو بڕۆمە پێشەوە... دوو سێ ڕۆژێ بێ کارو سەرشێواو دەسوڕامەوە، لەبەر ئەوەی کەس ئامادەی کار پێدانم نەبوو بۆیە بڕیارمدا حەماڵی بکەم. ئەم کارە نە دەسمایەی دەویست نە کەرەسەیەکی پێویست بوو. جانتاو باری گەشتیارەکانم لە لەنگەرەوە دەگواستەوە بۆ ناو کەشتی و بارەکانم دادەگرت و پارەی نانخواردنی نیوەڕۆ ئێوارەیەك چنگ دەکەوت.

بەلام جەخار، ئەو ڕێگەیەشم لێ داخرا، حەماڵەکانی ئەوێ بەرۆکیان گرتم و نەیان هێشت ئەو کارەش بکەم.

دوو سێ ڕۆژێك شەڕە شەقم لەگەڵ کردن بەلام زانیم بێ هودەیە، حەماڵی کردن لەم وڵاتەدا پێویستی بەواسیتەیە و خۆ خەریك کردن بەبێ مۆڵەت یاساغە.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە بەبێزارییەوە لەرۆخی لەنگەرگاکەوە وەستا بووم، بیرم لەئاقیبەتی ڕەشی خۆم دەکردەوە، چاوم بە لاپەڕەی ڕۆژنامە دڕاوێك کەوت هەڵم گرت و خوێندمەوە لەپەڕەی ڕێکلامەکاندا نوسرا بوو، فلانە بانك پێویستی بەچەند موچەخۆرێ هەیە. ویستم بچم بۆ ئەوێ و ئەزمون

بکرێم بەڵام جلی باشم نەبوو، بەم حاڵەوە هیچ کەسێ وەرینەدەگرتم.

چووم بۆ ماڵی نەجدەت وتم:

–دەستە جلێکم بەئەمانەت پێ بدە دەچم بۆ تاقیکردنەوە...

نەجدەت دووبارە پێکەنینێکی لاقرتیانەی کرد، قیڕاندم:

– بەچی پێ دەکەنی؟

– بەساویلکەیی تۆ.

– بۆچی؟ چی بووە؟ ئەزمون کردن ساویلکەیی نییە!

– ئەوانەی بیر کردنەوەیان وەکو تۆیە نەك هەر ساویلکەن بگرە شێتیشن، براکەم لەو تاقیکردنەوەیەدا کەس دەرناچێ، پێشتر هەموویان دیاری کراون.

– ئەی بۆچی لەرۆژنامەدا بڵاو کراوەتەوە؟

– عەزیزم ئەوە هەمووی خۆڵ لەچاوکردنە، بەخۆڕایی کاتی خۆت بەهەدەر مەدە، پێم وابوو لەبەر ئەوەیە جلەکانم نەداتێ بۆیە وتم:

– گرنگ نییە، خوا حافیز.

ویستم بچمە دەرەوە بانگی کردم:

– بۆ کوێ؟ وەرە هەر دەستە جلێکت دەوێ بیبەو برۆ بۆ تاقیکردنەوە بزانە من راست دەکەم یان درۆ؟

لەتاکەکەیدا شەش دەست جلی تێدا بوو یەك لە یەك باشتر، دەتوت هەموویانی دوێنێ لەبەرگدروو هێناوەتەوە.

دەستە جلێکم لەبەر کرد رۆشتم بۆ بانك و پرسیارم لەرۆژو مەرجەکانی تاقیکردنەوە کرد، زانیم دە رۆژی دیکە رۆژی تاقیکردنەوەیە، بەڕاستی پیاوەتی نەجدەت لەبیر ناکەم تاکو دە رۆژ لە هۆتێلێکی نایابدا لەسەر خەرجی و پارەی ئەو مامەوە، شەو و رۆژ خەریك بووم، گەر لەقوتابخانەش وەکو ئەو دە رۆژە بوومایە بەساڵێ دوو پۆلم دەبڕی.

ڕۆژی تاقیکردنـەوە هێنـدە مانـدوو بـووم وەك سەرخۆشـم لـێ هـاتبوو خۆیـشم نەمـدەزانی چ وەلامـێکم دابویـەوە، بـۆ شـەوێ نەجـدەت لێـی پرسیم:

- تاقیکردنەوەکە چۆن بوو؟

- وابزانم خراپ نەبوو.

دوای پـانزە ڕۆژ لەگـەڵ نەجـدەت پێکـەوە ڕۆشـتین بـۆ وەرگرتنـەوەی ئەنجامـەکان، ئـەو فەرمانبـەرەی ئەنجامـەکانی دەدانـەوە هەرکـە چاوی بە من کەوت وتی:

- کاکە، زۆر بەداخەوە!

هێنـدەی نـەمابوو بگـریم، ئـەتوت خانوەکـە بەسـەرمدا ڕوخـاوە، گریـان بەربینی گرتبووم، نەجدەت چاوێکی لێ داگرتم:

"با بڕۆینە دەرەوە." لە ڕاڕەوەکەدا پێی وتم:

- تۆ لێرە ڕاوەستە ئێستا دەگەڕێمەوە.

دوای دەپانزە خولەکێ بەپێکەنینەوە گەڕایەوە وتی:

- پیرۆزە، لەتاقیکردنەوەکەدا دەرچویت. وڕو کاس بووم.

سەرەتا وامزانی گاڵتەم پێ دەکات، بەڵام بەڕاستی بوو.

لەکۆی سەد کـەس تـەنها حـەوتیان وەرگیرا بوو من حەوتـەم کـەس بـووم. بـەڵام چـۆن بـە چ هۆکارێـك نـاوم لـە لیـستی دەرچـواندا بـوو ئەمـە مەتەڵێك بوو.

هەفتەیـەك دواتـر بـەپارەی ئـەو وەختـە بـە موچـەی ١٨٠ لـیرە لـەبانك دامەزرام. هێندە بەپەرۆشەوە لەکارەکەم دڵگەرم بووم لەماوەیـەکی کەمـدا سـەرنجی هـەموو سـەرۆکەکانی بـانکم بـۆ لای خـۆم کـێش کـرد، هێـشتا ساڵێکم تەواو نەکردبوو، بوومە سەرۆکی یەکێ لەفەرمانگەکانی بانك.

لەسەرۆکی گشتیەوە بگرە تا یاریـدەدەرو بەڕێوەبـەری گشتی هـەموان

دەیان ناسیم خۆشیان دەویستم، بەتایبەت بریکاری ژمێریاری گشتی پیاوێکی پیری بەویقار بوو، زۆر زیاتر لەوانیتر خۆشی دەویستم، دوو سێ جارێك بۆ نانخواردن دەعوەتی کردم بۆ ماڵی خۆیان.

هەستم دەکرد زۆری پێ خۆشە ببمە زاوای، ئەو دوو کچی قەیرەی هەبوو، رۆژێکیان لە ماڵیان بووم ڕوی تێکردم وتی:

– فەرید، مژدەت پێ دەدەم لەلایەن بانکەوە بەتەمان بتنێرنە ئەوروپا.

لەخۆشیاندا خەریك بوو شاگەشکە بم، خۆزگەم دەخواست نەجدەت لێرە بوایەوە ئاکامی هەوڵو تەقالاکەی منی بەچاوی خۆی بدیتبایە.

تا ئەو رۆژە من لەگەڵ یەکێ لەکچەکانی بریکاری ژمێریاریی گشتی پەیوەندیمان زۆر خۆش بوو، هەمووان وایاندەزانی بەو زووانە دەبینە دەسگیرانی یەکترو زەماوەندەکەمان دەکەین.

بەڵام، کاتێ هەواڵی رۆشتنی ئەوروپام بیست زانیم دەبێ ماوەی ساڵو نیوێك خولی تایبەتی بانکداری ببینم، بۆیە بەجارێ عەشقو خۆشەویستی کچەم لەسەر دەرچوو هەوای کچانی ئەوروپا لەسەری دام.

شەوو رۆژ خەونم بە ئەوروپاوە دەبینی، هەمیشە لەجیهانی خەونو بێداریدا لەگەڵ کچانی ئەوروپا ڕازو نیازم دەکرد، بۆیە چەن رۆژێ نەچوومە ماڵی بریکارو تەنانەت دوو سێ جارێك دەعوەتی کردم من ڕەتم کردەوە.

هەمیشە خەریکی ڕێکخستنی کارو ئامادە کردنی کەلو پەلی سەفەر بووم، پاش هەفتەیەك بەڕێوەبەری گشتی بانگی کردمە ژوورەکەی خۆی وتی:

– دەمەوێ لەیەکێ لەشارۆچکەکاندا لقێکی نوێ بکەمەوە لەتۆ باشتریشم بۆ ئەو کارە دەسناکەوێ، دووکەڵ لەتەوقی سەرمەوە دەرچوو، من خەریکی ڕێخستنی بارگەو بنەی سەفەری ئەوروپا بووم، ئێستا چۆن

بچمە شارۆچکەیەکی بچوك، سەرۆکی بانك کەهەستی بەناڕەحەتیەکەم کرد وتی:

– لەوێ زۆر نامێنیتەوە، حەو هەشت مانگ کارکردن لەوێ ئەزمونت زیاتر دەکات پاشان دەچیتە ئەوروپا.

دوو رۆژ دواتر کەوتمە رێ، لەو شارۆچکەیە هیچ شوێنێکی خۆش و حەوانەوە نەبوو، سەرۆکە ئیداریەکانی ئەوێ هەموو موچەخۆری بچوکی وەزارەتەکان بوون، کە تەنها دڵخۆشی ناوی سەرۆکایەتی بوون لەو بودجەیەی لەبەر دەستیاندا بوو دەستێکیان دەلێسایەوە، بەڵام بۆ من کە ئەهلی دزیی و فزیی نەبووم مانەوەم لەوێ لەدۆزەخ خراپتر بوو.

لەوێ لەگەڵ ئەفسەرێکی سوپادا بوومە ئاشنا، کوڕێکی باش بوو، زۆربەی کاتەکان پێکەوە یاری تاوڵەمان دەکرد یان باس و وتو وێژمان هەبوو، ئێوارەیەك دوای نانخواردن وتی:

– من ئەمشەو بۆ میوانداریەك دەعوەت کراوم پێم باش نییە بەم جلە سەربازیانەوە بڕۆم، تۆ جلەکانی خۆتم پێ بدە.

– بەچاوان، بۆ تۆ بایەخێکیان نییە.

هاتە ژوورەکەی من و جلەکانی لەبەر کردو رۆشت.

بەیانی زوو کە لەخەو بێدار بوومەوە سەیرێکی ژوورەکەی ئەوم کرد بینیم هێشتا نەهاتۆتەوە، سەعات بوو بەنۆ هەر نەهاتەوە، بوو بە دە هەر نەهاتەوە، پەیتا پەیتا ناڕەحەت بووم، کاتی دەوام درەنگی کرد منی بەدبەختیش وەك رۆستەم تاقە چەکێکم هەبوو نەمدەزانی چارەم چییە.

چارم نەبوو بێجگە لەوەی لەسوچێکی ژوورەکەمدا دانیشم چاو ببڕمە دەرگاکە دەوری سەعات یانزە مەئمورێکی بانك هات بەشوێنمدا وتم:

– بلێ نەخۆشە.

شەوو رۆژێ دوای ئەوەش ئەو هاوڕێیەم هەواڵێکی نەبوو، بۆ سبەی

بڕیارمدا جلەکانی ئەو لەبەر بکەم‌و لەماڵ بێمە دەرەوە.

ڕۆشتم بۆ بانك بینیم، توێکڵە خەیاریان لەژێر پێم ناو، هەر ئەو ڕۆژەی نەچوبووم بۆ دەوام راپۆرتیان لێداوم بۆ ئەستەمبوڵ. هێشتا چەند خولەکێ بەسەر گەیشتنمدا تێ نەپەڕی بوو، بروسکەیەك لەئەستەمبوڵەوە هات‌و داوایان کردبوو بگەمە ئەوێ.

نەمدەتوانی بەجلی ئەفسەرییەوە بڕۆم نەشدەکرا فەرمانی ئیداری دوا بخەم، وتم کاتێ لەشەمەندەفەر دابەزیم دەستێ جل دەکڕم بێ ئاگا لەوەی بەدبەختیەکی نوێ بەڕێوەیە، لەشەمەندەفەردا ژنێکم ناسی لەجوانیدا وێنەی نەبوو جێگەی ئەو لەکورسی بەرامبەرم بوو.

هەر لەو ساتەی چوومە ژوورەوە چاوی تێ بڕیم، زۆر هەوڵمدا سەیری نەکەم... بەتایبەت سەرم لەپەنجەرەکەوە دەبردە دەرەوە سەیری دیمەنەکانی دەرەوەم دەکرد. ژنەکە لێی پرسیم:

- تۆ ئەفسەری سوپایت؟

منیش نەمدەتوانی راستی‌و دروستی مەسەلەکەی پێ بڵێم، خۆ کوێرایی نەبوو دەیبینی من جلی سەربازیم لەبەردایە، کەچی کرمی ئەوەی هەبوو لەزاری خۆمەوە گوێی لێ بێت، ناچار بووم بێ درێژ دادڕی بڵێم:

- بەڵێ.

خوا کوێری بکا، ئەگەر ئەو نەپرسیبایە ئەو زمانە قرتاوەی منیش هێندە هەڵەوەڕ نەبوایە ئێستا فەرمانبەرێکی پلە باڵای ئەورووپا دیتوی بانك بووم.

خاتون، لێ نەدەگەڕاو هەر پرسیاری دەکرد، بەهەزار سوێندو قورئان دەیویست بیسەلمێنێ کە عاشقی ئەفسەرو جل‌و بەرگی ئەفسەرانەیە.

هێندەی وت‌و وت‌و وت تاکو لەقوڕی هەڵچەقاندم. تاکو ئەستەمبوڵ

وەك دوو هاوڕێی چەند ساڵە خەریکی گفتو گۆ بوین گوڵمان دەوت و گوێمان لە گوڵ بوو.

کاتێ گەشتینە وێستگەی ئەستەمبوڵ دنیا تاریك بوو، من نەمدەتوانی بچمە بانك و ناچار بووم تا بەیانی چاوەڕێ بم.

ژنە بردمیەوە بۆ ماڵی خۆیان، ئەوەش بۆ من هەلێکی باش بوو. گەر نەچومایە ڕەنگ بوو دوایی نەیدۆزمەوە، چوومە ماڵەکەی ئەو، وەك لەشەمەندەفەرەکەدا خۆی باسی کردبوو بێوەژن بوو. مێردەکەی دووساڵ بوو عومری درێژی دابوو بەئێوە.

ئەمە یەکەم ژن بوو من دەمناسی، هێندە چێژی لەدەممدا هەبوو بڕیارماندا بوو تا چەن ڕۆژێکی دیکە زماوەند بکەین ژیانی کاتیی ئەو شەوەمان بکەینە هەتا هەتایی.

بەو خەیاڵە خۆشەوە خەوتم، خەونم بەمانگی هەنگوینیەوە دەبینی بەدەنگێکی سەیر بێدار بوومەوە.

ژوورەکە تاریك و ئەنگوستە چاو بوو، تیشکێك هەڵکراو کوژایەوە، دەنگی دەمانچەیەك هات و ئیتر من ئاگام لەهیچ نەما، کاتێ چاوم هەڵێنا لەنەخۆشخانە بووم ئەویش نەخۆشخانەی سەربازیی.

دیارە وایانزانی بوو من ئەفسەرم بۆیە بردبومیانە نەخۆشخانەی سەربازی.

شانی چەپم بەسەختی بریندار بوو بوو، ژانی دەکرد. وەك پەرستارەکان دەیانوت دوو ڕۆژ بوو بێ هۆش بووم، بەڵام بۆچی بریندار بووم و چی ڕویدا بوو نەمدەزانی، بەدوای کەسێکدا وێڵ بووم مەسەلەکەم بۆ باس بکات.

ڕۆژی سێیەم کە بەهۆش هاتمەوە لێکۆڵینەوە دەستی پێکرد:

– لەچ بەشێکدا خزمەت دەکەی؟

نەمدەزانی چ وەڵامێك بدەمەوە، سەرۆکی نەخۆشخانە پرسیاری لێکردمەوە.

– لە چ بەشێکی سوپادا خزمەت دەکەی؟

– بڵێم چی؟ من؟ من؟

دواجار تێگەیشتن کە من ئەفسەرێکی ساختەم، بەپەلە دەسگیریان کردمو لەچەرپای نەخۆشخانەوە گوێزرامەوە بۆ گرتوخانە.

دۆسیەیەکی گەورە دروست کراو بە چەن تۆمەتێکی گەورە تۆمەتبار کرام، "بە کار هێنانی جلوبەرگی ئەفسەری. دەرچوون لە یاساکانی وڵات! دەسدرێژی کردنە سەر ناموسی خەڵکی! سوود وەرگرتن لە بڕوانامەی ساختەو هەڵگرتنەوەی واژوی پیاوە گەورەکان."

دواتر هەموو ڕاستیەکانم زانی بەڵام چ سوود؟

من لەتاقیکردنەوەکەی بانکدا دەرنەچوبوم، نەجدەت بەکارتی پیاوێکی گەورەی ناودار کە هەمیشە چوار پێنجێکی پێ بوو کاری بۆ کردبووم، بڕوانامەیەکی ساختەشی بەناوی منەوە دروست کردبوو، تەسلیمی بانکی کردبوو.

ئەو ژنەش کە ئەو بەڵایانەی بەسەرمدا هێنا پوری کچی جەنابی بریکاری ژمێریاری بوو، لەسەر ئەوەی لەهێنانی برازاکەی پەشێمان بووم بەو ڕێگەیە تەمبێی کردم.

تێکڕای ئەو شتانە دوای ئەو شەوە دەرکەوتن بوونە هۆی بەچۆکدا هاتنم، محکوم بونەکەم لەسەرەتاوە دیار بوو، گەورەترین سزایان دامو زیندانی کردنەکەم هەتایی بوو.

یەکەمجار کە بنیادەم زیندانی دەکرێ زۆر دەترسێ، پاش چەن رۆژو هەفتەیەك ئالودەی زیندان دەبێ.

ئەم زیندانیە بۆ منیش پەندێکی گەورە بوو فێری ئەو شتانە بووم کە

تا ئەو رۆژە نەمدەزانی.

ئەو رۆژەی لەزیندان بەر بووم بنیادەمێکی بەئەزمون و دنیا دیدە بووم، وانەزانن بڕیارمدا بوو بەساختەچێتی و فرو فێڵ پێش بکەوم، نا هەرگیز ئەو نیازەم نەبووە، دووبارە هیوادار بووم بەڕاستی و دروستی و شێلگیریی لەژیاندا سەرکەوتن مسۆگەر بکەم.

بەلام دەتوت هەموو دەرگاکانم بەڕودا داخراون، تەنها ئەو درزە کراوەیە کە بۆ نەهامەتی و بەدبەختی ڕاپێچی دەکردم.

بۆ ئەوەی هاوشێوەی من نەچنە ئەو درزو ڕێگەیەی منەوە لەزۆریان دەپارێینەوە کەچی ئەوان لەبری ئەوەی بێن بەهانامانەوە بەشەق بەرەو ئەو ڕێگەیەمان دەبەن.

لێرەدایە هەندێ کەس بەبێ ویستی خۆیان دووچاری هەندێ کارو ڕێگەی خراپ و نەشیاو دەبن، ئەوەشی بەسەر مندا هات یەکێ بوو لەو کارەساتانە.

لە دەرسی فیزیادا یاسایەك هەیە ATAIET بەپێی ئەم یاسایە هەر تەنێك بۆ ئەوەی بەرەو پێش بجولێ دەبێ پێشتر کەمێ بۆ دواوە بگەڕێتەوە، هەرچەن خێراتر بچێتە پێشەوە گەڕانەوەی بۆ دواوە زیاتر دەبێت. لەشەمەندەفەردا ئەو یاسایە جوانتر دەردەکەوێ.

ئێمەش هەر کاتێ بمانەوێ بازێك بەسەر لەمپەرێکی گەورەدا بدەین دەبێ بگەڕێنەوە بەرەو دواوە.

ماوەی زیندانی کردنی منیش کتومت هەمان ئەم خەسڵەتەی هەبوو، بۆ منێك کە دەمویست قەرەبوی دواکەوتنی ژیانم بکەمەوە ئەو گەڕانەوەیەی بەرەو دوایەم پێویست بوو.

خودا شاهیدە بۆ بڕینی ئەم مەودا زۆرە هیچ مەرامێکی فێڵبازیم نەبوو.

تەنها دە لیرەم لە گیرفاندا بوو، بۆ ئەوەی ئەویش خەرج نەکەم هەرچەن

برسیشم بوو دڵم نەدەهات شتێك بخۆم!

هەروا بەسکی برسی و سەرێکی تەژی لەئاوات و ئارەزوو بەکۆڵانەکاندا بەدوای کاردا دەسوڕامەوە، نەمدەویست بچمە لای کەس و داوای کاری لیێ بکەم، چونکە ئەزمونێکی تاڵم لەمەدا هەبوو، بۆیە دەمویست هەر بەو دە لیرەیە کارێك بگرمە دەست و دەرامەتێکی لیێ هەڵکرێنم.

بەدەم ئەم بیرو خەیاڵەوە گەیشتمە بازاڕی ماسیفرۆشان کاروباری ئەوان گەلیێ باش بوو، دەوروبەری هەر کامێکیان کۆمەلیێ موشتەری لیێ بوو.

"منیش بۆ دەست پیێ نەکەم. چی لەمە باشترە؟"

بەڵام، زوو دەرکم بەوە کرد بەدە لیرە کاری ماسیفرۆشی ناکریێ. "ئەی چی بکەم چی بکەم؟"

بڕیارمدا پرتەقاڵ فرۆشی بکەم، ئەم کارەم بۆ دەلوا، بیستبووم جولەکەیەك بەم کارە بۆتە ملیۆنێر، کابرای جولەکە پرتەقاڵەکانی دەفرۆشتەوە بەو نرخەی کە کڕیویێتی و سنوقە دارەکەی بۆ دەمایەوە، چونکە بەمایەکاریی دەیفرۆشتن ڕۆژانە سی چل سنوقێکی دەفرۆشت هەر سنوقە بەتاڵێکی بەسیێ لیرە بۆ هەژمار بکەی ڕۆژانە دەکاتە ۱۸۰ لیرەی کاش.

ئەم مەسەلەیە هەرچەن داستانێکە، بەڵام ڕاستییەك دەسەلمێنیێ بۆیە منیش بڕیارمدا پرتەقاڵ بەنرخێکی هەرزان بفرۆشم.

ڕۆژیێ تا ئێوارە لەگەڵ چەن پرتەقاڵ فرۆشیێ قسەم کردو ڕێگەو جێگەی بەچاکی فێر بووم، زانیم دەبیێ بەیانی زوو بچمە مەیدانی میوەفرۆشان بۆ ئەوەی بتوانم پرتەقاڵ بکڕم.

چونکە شوێنی حەوانەوەم نەبوو، لەلایەکیش ترسی ئەوەم هەبوو بەیانی زوو نەتوانم بگەمە مەیدان بڕیارمدا شەو لەویێ بخەوم. قوژبنێکم

دۆزییەوەو هەندێ پوش‌و پەلاشم هێناو لەسەری درێژ بووم، هەر بیرم لای ئەوە بوو تۆ بلێی ببمە ملیۆنێر؟ وەلێ مەخابن لەجەوری رۆژگار بێ خەبەر بووم.

بەنەسیمی فێنکی دەمەو بەیان بەخەبەر هاتم، هەراو زەنای کڕیارو فرۆشیار تازە دەستی پێ کردبوو، هەر دوعاو نزایەکم دەزانی خوێندم‌و فووم کرد بەخۆمدا، لە جێگا ببورن لەپوش‌و پەلاش هاتمە دەرەوە.

– خودایە بەپشتیوانی تۆ نەك بەپشتیوانی خەڵکی رۆژگار.

رۆشتمە لای پرتەقاڵ فرۆشەکان، لە بەردەمی هەر یەکەیاندا چەن خولەکێ دەوەستام‌و نرخی سنوقە پرتەقاڵەکانم دەپرسی.

نرخی هەر سنوقێك سێ تا سێ لیرەو نیو بوو. هەر سنوقەو چەن دانەی تێدا بوو، ئەمەم نەدەزانی، وەلێ چونکە هەموو کەسێ دەیکڕی منیش سێ لیرەو سیی قرۆشم داو سنوقێك پرتەقاڵم وەرگرت.

چوومە گۆشەیەك‌و سنوقەکەم لەبن دیوارەکە داناو بۆ خۆیشم بەلایەوە هەڵتروشکام.

سنوقە پرتەقاڵەکە لەبەر چاوم شتێکی گرنگ بوو، ئەمەش هۆکارێك بوو بەزویی دەرگای دەوڵەمەندی بۆ خستمە سەر پشت‌و لەو تنۆکە تنۆکانەوە بەزویی دەبوومە خاوەنی دەریایەك پارە.

پرتەقاڵ فرۆشەکان بەپەلە سنوقەکانی خۆیان هەڵدەبچڕی‌و خەریکی هاوار هاوارو فرۆشتن دەبوون.

بەلام، من ئەم کارەم نەکرد، دەبێ حسابی بکەم بزانم هەر پرتەقاڵێ چەن دەکەوێ، پاشان بەو مەزەندەیە نرخیان بۆ دانێم‌و بیانفرۆشم. زۆر بەهێواشی سنوقەکەم هەڵبچڕی، هەوڵم دەدا نەوەك سنوقەکە تێك بچێت‌و خراپ بێ.

پرتەقاڵەکانم هەژمار کرد ١٦٨ پرتەقاڵ بوون، منیش ٣٢٠ قرۆشم پێ

دابـوو، خێـرا دەفتـەرو قەڵـەمم لـە گیرفـانم دەرکـردو دەسـتم کـردە بەحسابکردن، هەر پرتەقاڵێك دوو قروش‌و شتێ کەمتر کەوتبوو. ئەگەر دانـەییم بـەدوو قـروش بفرۆشـتایە ئـەوا کـەمێ قـازانجی دەکـردو سـنوقە بەتاڵەکەیشم بۆ دەمایەوە.

ئەوەشم دەزانی کەسێکی کاسب یان بازرگان کاتێ دەگاتـە سـەرکەوتن حساب‌و کتابی ڕاست بێت، منیش ئێستا تەواو دڵنیام دەتوانم لەئاکامی کارەکەم خاترجەم بم.

سنوقەکەم خستە بن دەستم‌و هاتمە لای بازاری ماسیفرۆشـەکان. زۆرم برسـی بـوو، ویـستم نانێك بکڕم بەوشـکی بیخـۆم کەچی دڵـم نـەدەهات، بیـستبووم کاسـبکار هـەرگیز نابـێ لەدەسـتمایەکەی خـۆی بخـوات، دڵنەوایی خۆمم کرد کە خۆم بگرم تاکو پرتەقاڵـەکان دەفرۆشـم ئـەو کاتـە لەقازانج نانەکەم بخۆم.

مەیـدانی ماسیفرۆشـەکان هێنـدە قـەرەباڵغ نـەبوو، شـوێنێکی گونجـاوم دۆزییـەوەو سـنوقەکەم لـێ دانـا، پرتەقاڵـەکانم بەسـەلیقەوە لەسـەر یـەك دانان چاوەڕێی موشتەریم دەکرد.

پاش کەمێ چەن فرۆشـیارێکی دیکـە هـاتن‌و هـەر یەکـەو لەقوژبنێکـەوە بەرەی خۆیان لێ ڕاخست.

دیقەتمدان بزانم ئەوان پرتەقاڵەکانیان بەچەن دەفرۆشن، بینـیم هـەموو هاوار دەکەن جوتی بە پێنج قرۆش، چوومە لای یەکێکیان‌و وتم:

- سنوقیت بەچەن کڕیوە؟

- دوو لیرەو نیو.

- لەمن هەرزانتر کڕی بووی.

وەلێ پرتەقاڵەکانی من گەورەترو چاکتر بوون، لێم پرسی:

- سنوقێ چەن پرتەقاڵی تێدایە؟

- نازانم دوو سەد سێ سەد دانەی تێدا دەبێ.

لەزۆرێك لە پرتەقاڵ فرۆشەکانم پرسی هەموو هەر وایان وت، پێم سەیر بوو:

- باشە چۆن هەژمارتان کردووە وا جوتێ پرتەقاڵ دەدەن بە پێنج قرۆش؟

- مەزەندەکەی خۆ دیارە.

نهێنی کاری ئەو کەسانەم بۆ دەرکەوت لەهیچەوە دەست پێدەکەن و دەبنە ملیۆنێر، رۆژی هەزاران کەس دەست بەکاسبی و بازرگانی دەکەن، بۆچی لەنێوانیاندا تەنها یەکێ دەبێتە ملیۆنێرو ئەوانی دیکە دەفەوتێن.

هۆکاری ئەوەی ئەوان حساب و کیتاب نازانن، ئەگینا تێکڕای ئەو پرتەقاڵ فرۆشانە دەبونە ملیۆنێر.

بەمتمانەی تەواوم بەسەرکەوتن دەستم کردە هاوار کردن:

- ئاها... پرتەقاڵێك بە دوو قرۆش، پرتەقاڵی چاك، وەرە بۆی! دوان سیانێك لەپرتەقاڵ فرۆشەکان ئاوڕیان دایەوەو دەستیان کردە چپەو بۆڵە کردن:

- ئەوە کێ یە ئەمرۆ لێمان قوت بۆتەوە؟

- هەیکەلی ئەڵێی لولەیە.

- لێیگەڕێ بەسەرو سەکوتیا دیارە هیچی لەباردا نییە.

ئەوان سێ چوارێك بوون دەستیان کردە هاوار:

- پرتەقاڵی چاك دووانی بەپێنج.

من توندتر هاوارم کرد:

- وەرە بۆ ئێرە هەرزانم کرد پرتەقاڵی گەورە دانەی بە دوو قرۆش.

موشتەریەکان لەدەنگی من سەیرێکی پرتەقاڵەکانی منیان دەکرد پاشان دەچوون بۆلای ئەوان و مامەڵەیان دەکرد.

" من نازانم بۆچی ئەو خەڵکە ئاوایە، پرتەقاڵەکانی من گەورەترن و بەهەرزانتریش دەیانفرۆشم، ئیدی بۆچی هیچ کەسێ لەمنی ناکڕێ هەموو دەڕۆنە لای ئەوان!!." هەرچیم دەکردو دەکۆشام سەرم لێی دەرنەدەچوو، ژنێك ئەم گرێکوێرەیەی بۆ کردمەوە، دوای ئەوەی هەموو پرتەقاڵەکانی هەڵگوشی و تاقی کردنەوە وتی:

– حەتمەن ئەم پرتەقاڵانە سەرما بردەڵەن وا بەهەرزان دەیانفرۆشی.

– ببورە خانم بەخوا هیچ عەیبێکیان نییە، تۆ ببینە ئەمانە لەوانەی ئەوان گەورەترو هەرزانترن، بەڵام خانم ملی پیا نەکرد. چوویە لای ئەوان و پرتەقاڵی خۆی کڕی.

منیش لەداخانداو بۆ ئەوەی توانجێك لەخانم بگرم توندتر هاوارم کرد:

– ئەو پرتەقاڵانە پارەی حەڵاڵیان دەوێ.

یەکێ لەماسی فرۆشەکان لەولاوە هاواری کرد:

–هێواشبە کوڕە چ مەرگێکتە؟ وا دەنەڕێنی پەردەی گوێی خەڵکیت دڕاند.

بینیم کابرا چاوەکانی سور هەڵگەڕاون و سمێڵی تا بناگوێی هاتوون، بەندی جەرگ و هەناوم پسا. لەتاوا وتم:

– بەچاوان!

پاشان کەوتمە دەریای بیر کردنەوە، هەندێ لەکارەکان زۆر بەئاسانی دەکەونە بەرچاوی بنیادەم ، وەلێ کاتێ دەچێتە پێشەوە دەبینی بەو ئاسانیە نییە، هەموو کارێ ڕێچکەی تایبەت بەخۆی هەیە، بنیادەم دەبینێ چایچێتی کارێکی بەدەرامەتەو وادەزانێ دانانی چایخانەش هەروا سادەو ساکارە بەڵام ... نا وانییە.

سێبەرێك لەبەردەممدا قووت بویەوە وردە وردە سەروسەکوتی شین و مۆر هەڵگەڕا زنجیرەی خەیاڵی بچڕاندم:

– کوڕە، بەئیزنی کێ لێرە بەڕەت لێ داخستووە؟

لەپێشدا کەمێ لێی ورد بومەوە ویستم بڵێم:

"بە تۆ چی، تۆ چ کارەیت؟"

کەچی نەیهێشت قۆڵی گرتمو بەتەکانێك هەڵیدامە ناو بازارەکە.

– مەگەر ئێرە خانە هەریەکێ هەستێ و لەدایکی زیز بێ و سنوقێ پرتەقاڵ بکڕێ و لەبەردەم خەڵکی دوکانێك قوت بکاتەوە؟

پاشان ڕوی کردە دوو سێ خزمەتچی و کەناس کە لەدوایەوە وەستا بوون بەڕوخسارێکی فەرماندانەوە وتی:

– خێرا ئەم هەتیوە ببەن بۆ شارەوانی و سزای بدەن.

ئەنجا تێگەشتم جەنابی مەئموری شارەوانییە، تا ئەو ڕۆژە سەرۆکاریم لەگەڵ شارەوانیدا نەبوو بوو، بەڵام ئەو هەموو چیرۆکە سەیرو سەمەرەیەی کە بیستبووم بەس بوو بۆ ئەوەی زەندەقم بچێ.

کەوتمە لالانەوە:

– جەناب بۆخاتری خوا بەرەڵامکە، سەرم دای لەبەرد، گووم خوارد، چیتر ئەم کارانە ناکەم.

– قسەی قۆڕ مەکە، یاسا ڕێگە نادات، خۆ یاسا کەشك نییە.

– جەناب، بەخوا من یەکەم ڕۆژمە، نەمزانیوە.

– کە سزاکەیت دا دەبیتە وەستا.

یەکێ لەمەئمورەکان لەدواوە وەستا بوو دڵی پێم سوتا، بەچاوو تێی گەیاندم شتێك بدەمو گیانی خۆم ڕزگار بکەم.

ئەنجا تێگەشتم مەشکەیەك دۆ چەندە کەرەی لێ هەڵدێت، بەڕاستی منیش چەن کەسێکی گەمژەو گێلم خێرا دەستم برد بۆ گیرفانمو بەوپەڕی دڵاوایی لیرەیەکم دەرهێنا خستمە دەستی جەنابی پشکنەری شارەوانی، بەو جۆرە یاسا تەواو بوو، منیش مۆڵەتم پێ درا خەریکی

کاری خۆم بم.

ئەمجارە دەرکم بەوە کرد بۆچی جوتێ پرتەقاڵ بە پێنج قرۆشە، منیش ناچار بووم ئەو لیرە بەرتیلە بخەمە سەر مایەی پرتەقاڵەکان و جوتی بدەم بە پێنج قرۆش.

بۆیە ناچار بووم هەوڵێکی فرەتر بدەم بۆ ئەوەی ئەو پارەیەی کەداومە بیهێنمەوە مایە، بەهەموو هێزی خۆم هاوارم کردو نەڕاندم:

– پرتەقاڵی گەورە.

– هێشا کۆتا پیت لەزارم ڕەها نەبوو بوو، دەمم لێك نەنا بوو یەکێ لە پرتەقاڵ فرۆشەکان وەکو پڵنگ ئامبازم بوو، بۆکسێکی سەرەواندە چەناگەم وەك تۆپی لاستیك توند سەرەواندمیە دیوارەکەی بەرامبەرو لەهۆش خۆم چووم.

بۆ سبەی لەنەخۆشخانە چاوم هەڵێنایەوە لەتێکڕای ئەو داراییەشم تەنها شەش تەقەڵی سەر ڕومەتم بوو.

تەنانەت چاکەت و پانتۆڵێکی کۆن و پواوم هەبوو ئەوانیشیان برد بوو، ئێستەش نەمزانی ئەو کابرایە کێ بوو، چییان لەو کردو سنوقە پرتەقاڵەکەم چی لێ هات؟

بەکورتی دوای هەفتەیەك لە نەخۆشخانە دەرچووم و دەستێ جلی مردوویان لەبەر کردم. چاکەتەکەی بۆ من زۆر تەسك بوو. بەلام پانتۆڵەکەی هەتا بڵێی درێژ بوو، گوایە خاوەنە ڕەحمەتیەکەی پیاوێکی کەڵەگەتی لاواز بووە هیچ شێوەیەکی منی تێدا نەبوو.

دووبارەو سەر لەنوێ دەستم لەپێم درێژتر گەڕامەوە نێو کۆمەڵگە، بۆ ئەوەی کارێك بکەم و بژێویەك بەدەست بێنم، ڕەنگە بەلاتانەوە سەیر بێت ئەگەر بڵێم هێشتا ورەم بەرز بوو، هێشتا باوەڕم وابوو ڕۆژێ سەرکەوتن بەدەست دێنم، هێشتا حەزم دەکرد بەراستی و دروستی و داوێن

پاکییەوە کار بکەمو بچمە پێشەوە.

هەروا بەبێ ئامانج بەشەقامەکاندا دەڕۆشتم، لەپشت جامخانەی دوکانێکی کوتاڵفرۆشی چاوم بەکاغەزێ کەوت نوسرا بوو: "منداڵێکمان پێویستە بۆ کارو باری سەر پێیی."

چەن خولەکێ لەبەر دوکانەکەدا ڕاوەستام، لە لایەك دەموت بابڕۆم بڵێم هاتووم کارتان بۆ دەکەم، لەلایەکی دیکەشەوە قاچم بەدوامدا نەدەهات لەدڵی خۆمدا دەموت:

"گەمژە ئەوانە منداڵیان دەوێ نەك حەیتە زەلامێکی وەك تۆ."

سەرەنجام بڕیارمدا بچمە ژوورەوە، لەپشتی جامخانەکەوە چوار پێنج کەس ژنو پیاو خەریکی فرۆشتنی شتو مەكو کاروباری موشتەریەکان بوون، کە منیان بینی وایانزانی موشتەریم وتیان:

– فەرموو.

یەکێکیان هات بۆ لامو خوڵکی کردم.

وتم: "کارم بە ئاغایە."

پیاوێکی پیریان نیشاندام لە ناوەڕاستی دوکانەکەدا لە پشت مێزێکەوە دانیشتبوو، ڕۆژنامەی دەخوێندەوە، چوومە بەردەمی وتم:

– ببورە، پێم وایە پێویستتان بە شاگردێك هەیە؟

– بەڵێ، کوا منداڵەکە بێنە با ببینم دواتر قسەی لەسەر دەکەین.

– منداڵم پێ نییە خۆم دەمەوێ ببمە شاگرد!

دوکاندارو فرۆشیارەکان پێم پێکەنینو ئاغا وتی:

– ئێمە بەدوای منداڵێکدا دەگەڕێین؟

منیش وەکو پاڵەوانێك لەمەیدانی جەنگدا بدوێ وەڵامم دایەوە:

– هەرچی بێت من لەمنداڵێك گەلێ باشتر دەتوانم کار بکەم، ئاغا لەودیوی چاویلکەکانیەوە لێم ورد بویەوە بەلاقرتیەوە وتی:

– ئاخر ئێمە هەفتەی حەوت لیرە دەدەین، ئەم پارەیە بەدەردی تۆ ناخوات.

– بۆ من بەسە.

– زۆر باشە برۆ دەستبەکاربە.

بەدەسپێکردنی ئەم کارە دیسان مەسەلەی ملیۆنەرەکان دایەوە لە کەللەم، لە بەسەرهاتی یەکێك لەوانەدا خوێندبومەوە کاتێ بۆ دۆزینەوەی کار رێی دەکەوێتە کارخانەیەك، کاری پێ نادەن.

جوامێرەکە بە نائومێدییەوە لە کارخانەکە دێتە دەرەوە، چاوی بەدەرزیەکی سنجاق دەکەوێ لەزەویدا کەوتووە... دەسبەجێ دەچەمێتەوە دەرزیەکە هەڵدەگرێتەوە.

خاوەن کارخانەکە لەپەنجەرەوە دەیبینێ، دەسبەجێ بانگی دەکات و دایدەمەزرێنێ.

جوامێرەکە لەو کارخانەیەدا بەدڵسۆزی کار دەکات و بەکەمترین ماوە دەبێتە بەرێوەبەرو دواتریش دەبێتە هاوپشکی کارخانەکە. منیش نیازم بوو ئاغای نوێم تێبگەیێنم چەن کەسێکی دەستڕەنگینم.

هەر لە یەکەم رۆژی دەسبەکار بونمەوە خەریکی پاککردنەوەی دوکانەکە بووم، نەمدەزانی ئاغا لەژێرەوە چاوی لەسەرمە، قوتوەیکی بەتاڵم دۆزییەوەو کردمە گیرفانمەوە. دەمویست ئاغا وا بزانێ من قوتویەکی نەشیاویش فرێ نادەم و هەڵیدەگرم، بەڵام ئاغا کە گومانی خراپی لەسەرم هەبوو، بانگی کردم بێ ئەوەی مۆڵەتی داکۆکی کردنم لەخۆم پێ بدات وتی:

– تۆ کە لە قوتویەکی بەتاڵ نەگەڕێی چۆن متمانەت پێ بکەین؟

دواتریش زۆر بەبێ رێزیی لەبەر چاوی فرۆشیارەکان لە دوکانەکە دەریکردم.

دووبارە لەمەیدانی ژیاندا تا و تەنیا کەوتمەوە، هەموو دەرگاکانم لێ داخرا بوو، تاکە شتێك هێشتبومیەوەو ورەی دەدایەوە بەرم ئەویش ئومێد بوو.

ئومێدێك سنوری تێپەڕاندبوو، گەشتبویە ئاستی خەیاڵپەرستی، دیارە دەزانن هەر شتێ سنوری بەزاند بەزیان دەشکێتەوەو هەندێجاریش دەبێتە جێی مەترسی.

خەیاڵپەرستی لەو نەخۆشییە ترسناکانەیە ئایندەیەکی دژواری هەیە، زۆربەی خەیاڵپەرستەکان یان دوچاری شێت بوون دەبن یان ئەگەر دەماریان بەهێز بێ دەبنە قۆڵبڕو ساختەچی.

دیارە خەیاڵپەرستان لەسەرەتاوە مەرامێکی گلاویان نییە، بەڵام بیانەوێ یان نا دەگەنە ئەم بن بەستە.

من خۆم لەوانەبووم کە وامدەزانی هەرکەس بەپاکی و بێخەوشی بژی سەرکەوتوو دەبێ، من ئەو کاتە لەحاڵی کارە خراپەکانی کۆمەڵگا، خەڵکانی گورگ سیفەت و هەزاران دەردو بەڵای دیکە بێ ئاگا بووم، دڵنیا بووم سەرەنجام ڕۆژێ ئاکامی ڕاستی و دروستی خۆم وەردەگرمەوە.

هەر بۆیە بە تێکڕای هەوڵ و تواناموە چوومە پێشەوە لە ماوەی دوو سێ هەفتەدا چەن کارێکی جۆر بەجۆرم کردو ئاقیبەت ڕێم کەوتە نوسینگەی پارێزەرێك.

ئاغای نوێم پارێزەرێکی ناودار بوو، گرێبەستێکمان کرد نیوەڕۆو ئێوارەم لەسەر ئەو بێت و شەوانەش لەوێ بخەوم.

شانس لەوە باشتر نەبوو، هەر ئەوەندە نیوەڕۆو ئێوارەم مسۆگەر بوایە ئەویتری دەمتوانی لەبەرنامەی ژیانم دابەزێنم.

ڕۆژەکانی سەرەتا کارم تەنها گەسك لێدانی ژوورەکان بوو، دوای دوو هەفتە پلەم بەرز بویەوە کاری کڕینی پێویستیماڵەوەو جێبەجێ کردنی

فەرمانەکانی ژنەکەیشی پێ سپاردم.

دواتریش بوومە خزمەتی بەردەم ژوورەکەی خۆی، دواجار شانازی سکرتێریم پێدرا، کەم کەم ئاغا لەگەڵ خۆیدا دەیبردمە ئێرەو ئەوێ هەندێ کاری لاوەکی پێ دەسپاردم.

جەنابی پارێزەر زۆر خۆشی دەویستم دەیوت:

– لەئایندەدا تۆ دەبیتە پارێزەرێکی بەرجەستە، کەیفم لەبیستنی ئەو قسەیە دەهات، ئەو هاندانە ناچاری کردم زیاتر کار بکەم، سەرجەم یاساکانی جەزایی و مافپەروەریم وەك ئاوو دۆ لەبەر بوو.

رۆژێکیان ئاغا چوبویە دادگا من بەتەنها لەنوسینگە لەگەڵ یەکێ لە موەکیلەکان کە قاچاخچی تلیاك بوو قسەم دەکرد، لەو کاتەدا دوو کەس هاتنە ژوورەوە لەبەریان هەستام وتم:

– بفەرموون، چ ئەمرێکتان هەیە؟

یەکێکیان چەن ساتێ لێم وردبویەوەو پاشان بە پێکەنینێکی گاڵتە ئامێزەوە وتی:

– تۆ ناوت فەرید نییە؟

– بەڵێ!

– چاك جێی خۆتت لێرە کردۆتەوە!

لەو قسانەی زۆر نارەحەت بووم وتم:

– تۆ کێیت و چیت دەوێ؟

– بەو زوانە تێدەگەیت، هەستە پێشم کەوە با پێت بڵێم.

– بۆ کوێ بێم؟

– پێشم کەوە بۆ بنکەی پۆلیس؟

پۆلیسەکان دامیانە پێش خۆیان و من هەرچی دەموت بابە راوەستن تاکو ئاغا دێتەوە، نەیان بیست.

لەبنکەی پۆلیس بردیانم بۆ ژوورێك، پیاوێکی بەتەمەن لەودیو مێزێکەوە دانیشتبوو ژنێکیش کەمێ لەولاترەوە لەسەر نیشتۆکێك دانیشتبوو، دوو پۆلیسەکە بەڕێزەوە بەو پیاوەی پشتی مێزەکەیان وت:

- هێنامان.

من دڵنیا بووم هەڵەیان کردووەو زوو تێدەگەن! وتم:

- قوربان دیارە لێتان تێکچووە؟

ئەوەی لەپشتی مێزەکەوە بوو مستێکی کێشا بەمێزەکەداو بەڕیتمێکی توڕەبوون و گاڵتە ئامێزەوە وتی:

- بەڵێ، دیارە تۆ فریشتەیت!

پاشان ڕوی کردە ژنەکە وتی:

- خانم ئەمەیە؟

بەترس و لەرزەوە سەیری سیمای هەڵاوساوو چاوی سور هەڵگەڕاوی ژنەکەم کرد، خەریك بوو چمکی دەسماڵەکەی بەددانەکانی دەجویی گەلێ بەدڵنیایی وتی:

"بەڵێ ئەمە خۆیەتی!"

کابرای پشت مێزەکە بەدەنگێکی تایبەتەوە وتی:

- پففففف. ئەی نەتوت لێتان تێکچووە؟

- قوربان من نازانم مەسەلە چییە؟

چاوەکانی پیاوەکە بەجۆرێ دەرپەڕین کە چاوی من بێجگە لە دوو چاوی گەورە هیچی دیکەی نەدەبینی. وتی:

- ئەم ژنە دەناسیت؟ بەدیقەتەوە لە ژنەکە ورد بوومەوە.

- نەخێر، نایناسم!

ژنەکە وەك تەرەقە بەڕومدا تەقییەوەو لەجێی خۆی دەرپەڕی:

- ئەی ناپاك، ئێستا نامناسیتەوە؟

دواتر دایە پرمەی گریان و بچڕ بچڕ بەردەوام بوو:

– بە چ زمانێك لەگەڵ من دەدوایت؟ چەن بەقوربان و بەساقەم بویت هەتا فریوتدام، ئێستاش دەڵێی ناتناسم، دەتوت هەرچی هێزو توانام هەیە لەجەستەیان دەر هێناوم، ئەژنۆکانم کەوتنە لەرزین، زۆر بەداماوی دەستم کرد بەپاڕانەوە.

– خانم، تکات لێ دەکەم، تۆمەتبارم مەکە، من کەسێکی بەئابڕوم، دوای دەر بەدەریەکی زۆر تازە کارێکم دەستگیر بووە، جوان سەیرم بکە تاکو دڵنیا بیت لەهەڵەدایت، من ئەسڵەن کەی تۆم دیتوە، کەی تۆم فریو داوە؟

خانم، بە چەشنێکی عاشق کوژانەوە لێم ورد بویەوە:

– چۆن؟ هەرئاوا، تۆ نەبویت حەیوان، ئەی چ گەمژەیەك بوو هەموو رۆژێ دەهاتەماڵەکەم؟

– خانمی بەڕێز، والله بەخوا لێت تێکچووە.

ژنە، بەجۆرێ دەگریاو هەنیسکی هەڵدەدا من خەریك بوو نارەحەت دەبووم، من هەر لە دێرماکەوە کەسێکی دڵنەرم بووم.

– خانم، تکا دەکەم مەگری، کارەکان چاك دەبن، بەڵام تۆ مەبە بەبایسی ئابڕو بردنی من، بلێ بەهەڵەدا چویت، ڕەنگە ئەو کەسە هاوشێوەی من بێت، خواش پێی خۆش نییە من لەکەدار بکەیت.

ئەو پیاوەی لەپشتی مێزەکەوە بوو قیڕاندی:

– بێدەنگ بە ساختەچی دزا

پاشان ڕوی کردە ژنەکە:

– کچەکەم هەستەو بڕۆرەوە بۆ ماڵی خۆت، من حسابی ئەم کوڕی سەگە دەکەم و پارەکەتی لێ وەر دەگرمەوە.

بەجۆرێ دەستەپاچە بووم، هەرچی ویستم شتێك بەخانم بڵێم

نەمتوانی ئەتوت قسەکردنیشم بیر چۆتەوە.

ژنەکە لەو کاتەدا لەسەر نیشتۆکەکە هەڵدەستا وتی:

– غەددار، بۆچی واتکرد؟

لە خۆشیدا زمانم بەر بوو هاوارمکرد:

– بزانە، قوربان ئەم ژنە منی لەجیاتی کەسێکی دیکە گرتووە! من ناووم فەریدە تەنانەت هاوڕێکانیشم پێم دەڵێن گێلە.

ئەم قسەیەم کابرای زۆر بێتاقت کرد هاواری کرد:

– کوڕە، من ٢٤ ساڵە پۆلیسم تۆ دەتەوێ من بخەڵەتێنی؟

ژنەکە دووبارە خۆی هەڵدایەوە نێو قسەکانمان:

– جەنابی سەرۆك نەکەن ئەزێتی بدەن؟

پاشان لەپڕ هەردوو دەستی کردە ملم:

– غەدار، بۆچی بەزەییت پێمدا نەهاتەوە؟ بۆچی هێلانەی عەشق و بەختەوەریت لێ تێکداین؟ زاڵم.... زاڵم...

وەك پەیکەر لەناوەراستی ژوورەکەدا وەستابووم، نەمدەزانی چ وەڵامێکی ئەو بەڵای ناگەهانە بدەمەوە.

سەرۆك زەنگێکی لێداو پۆلیس هاتە ژوورەوە:

– ئەمە ببەنە خوارەوە.

دڵم داخورپا، من بیرەوەری تاڵم لەگەڵ وشەی خوارەوە هەبوو دەستم کردە پارانەوە:

– جەناب، مۆڵەتم پێ بدە لەگەڵ ئەم ژنە قسە بکەم، بۆی بسەلمێنم لە هەڵەدایە.

بەڵام کەس گوێی لێ نەگرتم.

بردیانمە خوارەوە بۆ گرتوخانەی کاتیی، لەتاریکیەکەدا گوێم لە دەنگی چەند کەسێ بوو دەیانوت:

"بەخێر بێیت"

کاتێ بەتاریکیەکە چاوم ڕاهات، بینیم پڕە لەخەڵکی جۆراو جۆر، چەن کەسێ دەوریان لێدابووم، هەر یەکەو پرسیارێکی لێ دەکردم:

– چییت کردووە؟

– تاوانەکەت چییە؟

وامدەزانی بەسەرهاتەکەیان بۆ باس بکەم ڕزگار دەبم:

– بەخوا، خۆیشم نازانم چ تاوانێکم کردووە!

– ئەی بۆچی هاتویتە خوارەوە؟

– ژنێك منی لەگەڵ غەدارەکەی لێ تێکچوو بوو، هەرچی دادو بێدام کرد بابە من ناوم فەریدە لێت گۆڕاوە قایل نەبوو!

نەفەرێك بەرامبەرم بەچیچکانەوە دانیشتبوو مشتەکۆڵەیەکی سرەواندە سەر سینگم:

– دەتەوێ ئێمەش بخەڵەتێنی ساختەچی؟

تۆ سەیر ئەم نەگبەتییە، بەندیەکانیش باوەڕیان پێ نەدەکردم. زانیم قسە کردن بێ سوودە بێدەنگ بووم.

دوای دوو سەعات هاتن بەشوێنمدا، هەناسەیەکی ئاسودەم هەڵکێشاو بەو چوار پێنج کەسەی دەورو پشتم وت:

– بینیتان من ڕاست دەکەمو بێگوناهی من دەرکەوت؟

دوو مەئمور بردیانمە ژوورەکەی سەرۆكو لەوێ ژنێکی دیکەی لێ بوو گەلێ لەدایکم پیرتر بوو، ئەتوت دەڵە مەیمونە هەرکە منی بینی وتی:

– مەزلۆم گیان، ئاخ... مەزلۆمی خۆشەویست بۆ چی بەزەییت بە مندا نەهاتەوە؟ بۆچی بەجێت هێشتم؟ مەگەر من چ خراپەیەکم دەرهەقی تۆ هەبوو؟

هێندە دەستەپاچە بوو بووم، دەنگم گیرا بوو، وەك پەیکەرێکی بەرد

لەقوژبنێکی ژوورەکەدا وەستا بووم سەیری ئەوانم دەکرد.

پیرەژنەکە هەستاو هاتە لامەوە سەری نا بەسینەمەوە دەستی کردە گریان، من وەکو کەسێك کارەبا بیگرێ پاڵکێکم بەژنەکەوە ناو هەڵمدایە ئەولاوە:

– خانم، مەزلوم کێیە؟ چاوت بکەوە لێت گۆڕاوە؟

جەنابی سەرۆکی پۆلیس، کە ٢٤ ساڵ پێشینەی هەبوو، بەلاقرتیەوە وتی:

– دیارە ئەم ژنەش ناناسیت، دیارە ئەمیش درۆت بۆ دەکات؟

بەناچاری هەرچی سوێندێکم دەزانی خواردم:

– بەخوا، بەپێغەمبەر، بەئیمام، بەقورئان، من بێت‌و هیچ کامێکیان ناناسم.

پیرەژنی، پیرەکەمتیار، دەمێك بوو تفی دەمی کۆ کردبویەوە، هەتا دەمی گرتی کردییە دەم‌و چاوم‌و لەلیکدا خوساندی!

– تففف، درۆزنی بێ شەرەف، لەو کارەت شەرمەزاربە... من سکرتێری پارێزەرێك بووم، ئەوەش کارێکی ئەوتۆ نەبوو جێێ باسی خەڵکی بێت.

سەرۆك، لە داخاندا سمێڵی خۆی دەجویی هاواری کرد:

– مولازم مەزلوم. دەبێ توشی بەڵایەکی وەهات بکەم هەتا ماوی نەوێریت جل‌و بەرگی ئەفسەریی بپۆشیت.

لەم قسانەی سەرۆك واق بووم، ئەمانە دەڵێن چی؟

دووبارە بردیانمەوە بۆ خوارەوە. هەتا عەسری ئەو رۆژە منیان نیشانی بیست دانە ژن دا کە هیچ کامێکیانم نەدەناسی.

یەکێ پێی دەوتم کازم گیان‌و یەکێکی دیکە دەیوت موزەفەری من. یەکێ تفی تێ دەکردم، یەکێ داوێنی دەگرتم‌و دەپاڕایەوە.

من بەبێ ئەوەی هیچ لەمەسەلەکە بزانم مات‌و مەلول بووم، خودایە

ئەمە چ نەهامەتییەکە بەرۆکی گرتووم.

بۆ ئێوارە شەش حەوت وێنەگر هاتنە گرتوخانە بۆ ئەوەی راپۆرتە هەواڵ ئامادە بکەن، منیش دەستم گرت بەدەم‌و چاومە بۆ ئەوەی وێنەم نەگرن، بەڵام دوو مەئمور دەستیان گرتم مەئمورێکیش ژێر چەنەی هەڵبڕیم‌و ئەویی دیکەش سەری ڕاست کردمەوە.

بەم سەرو سەکوتەکەوە وێنەگرەکان خێرا خێرا دەستان کردە وێنە گرتنم.

بۆ رۆژی داهاتوو من بوومە یەکێ لەناودارترین لاوەکانی وڵات. تێکڕای گۆڤارو رۆژنامەکان وێنەو راپۆرتیان سەبارەت بەمن لە پەڕەی یەکەمدا چاپکردبوو.

"ڕاوچی ژنان کەوتە داو" جوامێرێك بەکەڵك وەرگرتن لەجل‌و بەرگی ئەفسەریی‌و بەناوی خوازراوەوە ٥٤ ژنی فریوداوە... دەسگیر کرا.

ئەگەر تاوانبارێکی ترسناك یان چەتەیەکی گەورە دەسگیرا بکرایە، دادگاییەکەی چەن مانگ‌و بگرە چەن ساڵکیشی دەخایاند! بەڵام هێشتا هەفتەیەکی بەسەردا نەچوبوو، جڤاتی دادگایی من پێك هێنراو منی بەدبەختیان بەناوی فێڵبازێکی پیشەیی لەپشت مێزی دادگاییەوە وەستاند.

لە دادگا ٢٤ ژن‌و کچی سکاڵاکار ئامادە بوون، هەموویان ئامادە بوون ئەگەر مارەیان بکەم دەست لەداواکانیان دەکێشنەوە.

یەکێ دەیوت "جیازی"کەی فرۆشتم‌و خواردویێتی، یەکێ داوای ئەوەی هەبوو دەیوت" فریوی داووم ، پارەی بردووم، یەکێ دەیوت خشڵ‌و زێڕەکانی فرۆشتوم‌و خواردویێتی".

دە کەس لە سکاڵاکاران کچانی تەمەن کەمتر لەبیست ساڵ بوون، شەشیان تەمەنی لەنێوان بیست تا چل ساڵ بوو، هەشت کەسیان

تەمەنیان لە چل تێپەڕی بوون دوو سێیەکیان پەنجا شەستساڵێك دەبوون.

سەرۆکی دادگا پیاوێکی بە ویقار بوو خۆیشی دەرکی بەبێ تاوانی من کردبوو، بەڵام ئەو پێشینەیەی هاوپێچی دۆسیەکەم بوو، پەلو باڵی ئەویشی شکاندبوو، بێجگە لەمەحکوم کردنی من هیچ ڕێچارێکی نەبوو.

پارێزەرەکەم پێشنیاری کرد لەگەڵ سکاڵاکاران زەماوەند بکەم! هەموشیان ئامادە بوون، بەڵام من بەترسێکی وەهاوە تەماشای سەرۆکی دادگام کرد هەموو ئامادەبوان دایانە قاقای پێکەنین.

سەرۆکی دادگا تێگەشت کەمن ئامادەم پانزە ساڵ زیندانی بکرێم بەڵام خۆ لەقەرەی ئەو نەگبەتیە نەدەم.

خوا لەباوکی سەرۆك خۆش بێت، تەنها بە دووساڵ زیندانی کردم.

پێم وابوو چیتر بەمە ئاسودە دەبم بەڵام مەگەر ژنان لێدەگەڕێن...

هەموو رۆژێ چوار پێنجێکیان دەهاتن بۆ دیدەنیم و لەداخی یەکتریی دیارییان بۆ دەهێنام و ڕکابەرییان دەکرد.

هەریەکەو هەوڵی دەدا سەرنجم بۆ خۆی راکێشێ بۆ ئەوەی کە بەربووم زەماوەندی لەگەڵ بکەم، بەڵام ئەم کارە عەیبێکی هەبوو زۆربەی جار ژنەکان دەیانکردە شەڕو دەستیان لەقژی یەکتر دەنا هەر مەپرسە... هێشتا نەمدەزانی چ فڕو فێڵێك لەبن سەریاندایە.

رۆژێك یەکێ لە سکاڵاکارەکانم بە ناوی عەتیەوە هاتبوو بۆ دیدەنیم بڕیارمدا ئەو مەسەلە ڕوون بکەمەوە.

عەتیە، تەمەنی چل پەنجا ساڵێك دەبوو زۆر شڕو شێواوو بەراستی لە بەد فەساڵیدا هاوتای نەبوو، وتم:

– عەتێ خان، بۆ خاتری خوا، تو بی و دینت، راست بڕۆ من کەی و چ کاتێ تۆم بە لاڕێدا بردووەو کڵاوم لەسەر ناویت؟

عەتیٚ، پێکەنی وتی:

– سوێندم مەدە، ئەوەی فێڵی لێکردوم تۆ نیت، کازم ناویٚ بوو سوێندی دەخوارد کە مارەم دەکات، هەرچی دارو نەدارم هەبوو سیٚ هەزار لیرە بوو، بازنی ئاڵتون‌و گوارەکانیشم پێدا، هەمووی بردوو تێی تەقاند، منیش سکالاٚم لەسەر تۆمار کرد، پۆلیس وێنەی هەموو خاوەن پێشینەکانی نیشاندام لەبەر ئەوەی وێنەی تۆ لەهەموویان جوانترو باشتر بوو وتم ئەمەیە.

هێندە قینم هەستا بوو دەمویست بەمشتە کۆڵە دەم‌و چاوی بقوپێنم، نەڕاندم:

– سەگسار، خوا لێت هەڵدەگریٚ لاوێکی ئاوا توشی قەرقەشە بکەی؟!

–کەسێکی دیکە چارە ڕەشی کردبووم، منیش چارەم نەبوو دەمویست دەمامکیٚ بۆ ئابروچونەکەم بدۆزمەوە، بەهیوای ئەوەی تۆ مارەم بکەی.

لەداخاندا پێکەنینم دەهات، تو خوا سەیرکەن هەندیٚ کەس چەن گەمژەو بیٚ شەرەفن، کەسێکی دیکە کلاٚوی لەسەر ڕفاندون کەچی هەرکەسێکیان چنگ بکەویٚ بەرۆکی ئەو کەسە دەگرن. قیڕاندم:

– بڕۆ ونبە لەبەرچاوم ... ڕیسوا.

عەتیٚ، دەستی کرد بەگریان‌و پاڕانەوە:

– دەست بەعەشقی منەوە مەنیٚ، دووسەد لیرەی دیکەم هەیە، ئامادەم بەهەموو جۆریٚ نازت بکێشم، بەو مەرجەی بەڵێنم پیٚ بدەی دوای ئەوەی لەزیندان بەر بویت مارەم بکەی پێکەوە خێزانێکی بەختەوەر پێك بێنین‌و ببینە خاوەن مناڵ.

نەمهێشت قسەکەی تەواو بکات قۆڵیم گرت‌و هەڵمدایە دەرەوە.

حوسنیە، رۆژێك هەر لەو قسانەی کرد، بەویشم وت:

"بۆچی واتکرد؟" وتی: "کە وێنەی تۆم بینی شەیدای بووم، عەشقی

تۆ کوێری کردم نەمزانی دەڵێم چی، ئەویشم کردە دەرەوەو دەستی کرد بەگریان،

– توخوا، ئازارم مەدە، من کچم تا ئێستا دەستی هیچ پیاوێکم بەر نەکەوتووە، پارەیەکی زۆرم هەیە ئامادەشم کە....

هاوارم کرد:

– ونبە، پیرە سەگ، ئیشەڵلا تا دەمریت هەر بە کچێتی دەمێنیتەوە!

لەهەمووی خۆشتر سکاڵای کچێکی جوان بوو گەلێ ناسكو نایاب بوو، ئەو داماوە نەکەس فریوی دابوو نەکەسیش فێڵی لێ کردبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی دوای هەوڵو کۆششێکی زۆر مێردێکی بۆ لەداو نەکەوتبوو، وەختێ باسی من لەرۆژنامەدا دەخوێنێتەوە دێت بەخەیاڵیدا ئەویش لەم شەڕەدا بەشداری بکات بەڵکو شتێکی دەسگیر بێت.

ئەنجا تێگەشتم بۆچی ژنان هێندە حەزیان لەجلو بەرگی ئەفسەرییە، قاتێك جلی ئەفسەریی بکەیتە بەری کۆتەرە دارێك، هەر کچو ژنێك بیبینێت عاشقی دەبێت، سەر وەختێ ماوەی حوکمەکەم تەواو کردو لە بەندیخانە بەر بووم، دووبارە بۆ دۆزینەوەی کارێکی باش بەپەرۆش بوومەوە.

تەواوی ئەو کارەساتەی بەسەرم هاتبوون بۆم ببوون بەپەندو ئەزمون، هیوایەکی فرەم هەبوو لەژیاندا سەرکەوتن مسۆگەر بکەم.

بەڵام ئەم پێشینە نەفرەتیە وەك پەڵەی داخ بەنێوچەوانمەوە دیار بوو نەیدەهێشت هەدایەك بدەم.

بۆیە بڕیارمدا لەئەستەمبوڵ دەرچمو بچمە شارۆچکەیەکی دوور لەوێ هیچ کەسێ نەمناسێت.

بەدوای چارەنوسدا گەلێ شوێن گەڕام، لەهەر شارێك دوو سێ ڕۆژ دەمامەوە سەرم بەهەموو کونو کەلەبەرێکدا دەکرد، بەڵام ئاسەواری

کارێك نەبوو، وردە وردە خەریك بوو بێ هیوا دەبووم.

بەدوایین پارەیەك کە پێم بوو سواری شەمەندەفەر بووم بێ ئامانج کەوتمە ڕێ.

دوای ئەوەی شەوێك بەڕێگاوە بووم لەیەکێ لە وێستگەکانی ناوەڕاستی ڕێدا پیادە بووم.

ئەو شارە نزیکەی چوار پێنج کیلۆ مەترێ لە وێستگەی ڕێگەی هێڵێ ئاسنەوە دوور بوو، لیرەیەك لەگیرفانمدا نەبوو بەپێ بەرەو شار ڕێکەوتم.

وردە وردە خەریك بوو شار لەخەو بێدار دەبویەوە، کاسبکاران تاکو تەرا دوکانیان دەکردەوە.

نەمدەزانی بەرەو کوێ بڕۆم و چی بکەم! لەتاو تینی برسێتی و تینوێتی توانای ڕێ کردنم نەبوو.

لەڕێگە تووشی مزگەوتێ بووم، چوومە حەوزو خانەی مزگەوت و دەم و چاوێکم شۆردو چوومە قوژبنێکەوە دانیشتم، کەوتمە دەریای خەیاڵەوە کە چارەم چییەو چی بکەم؟

نازانم ماوەی چەندێك لەوێ دانیشتبووم هەرچۆن بوو خەو بردبومیەوە.

لەخەونمدا بەسکی برسیمەوە خەونم بە پلاوو مریشکەوە دەبینی، لەپڕ بینیم دنیا هاتە لەرزین دارو دیواری حەزو ئاوەکە وەکو دار بییەك بایەکی بەهێز بیهەژێنێ شڵەژان بەسەر یەکدا، دەنگێك وەکو هەورە بروسکە لەگوێمدا زرینگایەوە.

بە ترس و بیمەوە چاوم هەڵهێنا بینیم کەسێك شانم ڕادەوەشێنێ:

– ئۆی، سەلام و عەلەیکوم.

پیرەمێردێکی ڕیشن بوو، تەمەنی پەنجا شەست ساڵێ دەبوو، لەبەر ئەوەی زۆر شەکەت و ماندوو بووم ،توانام نەبوو وەڵامی بدەمەوە.

دووبارە بەدەنگێکی بەرزتر وتی:

- برا سەلام و عەلەیکوم.

دیسان وەڵامم نەدایەوە.

ئەمجارە بەتوڕەییەوە هاواری کرد:

- مەگەر کەڕیت، سڵاوم کرد.

دووبارە هیچم نەوت.

یەکێکی دیکە هاتە حەوزخانەکەو بەپیاوە ڕیشنەکەی وت:

- لەگەڵ کی قسە دەکەیت؟

- نازانم ئەمە کێیە لێرە خەوتووە ئەڵێی لاڵە وا قسە ناکات!

ڕاستیشی دەکرد لەتاو برسێتی و تینوێتی زمانم نەدەسوڕا قسە بکەم.

ئەو پیاوەی دواتر هاتبوو پەنجەی کرد بەگوێچکەمداو هاواری کرد:

- ئۆ هۆی... ئامۆزا.

خەریك بوو پەردەی گوێم بدڕێت، بۆ ئەوەی وازم لێ بێنن و برۆن بەلای کاری خۆیانەوە وەکو ئەو ئەکتەرانەی لەسینەما دیتبومن وتم: "یا..."

وتی:

- لەکوێوە هاتوی؟

- دووبارە وتم "یا..."

هەردووکیان دایانە قاقای پێکەنین، چەند کەسێکی دیکە لەئیمانداران بۆ نوێژ هاتبوون لەدەورم کۆ بوونەوە!

- ئەمە کێیە؟

- چی هەیە؟

کابرای ڕیشن وەك خزمەتچیەکی باخی ئاژەڵان کە دەیەوێ ئاژەڵێکی نوێ نیشانی بینەران بدات وتی:

-نازانم، قسە ناکات، تەنها "یا، یا" دەکات.

یەکێ لە قەرەباڵغیەکەدا هاواری کرد:

- نەوەك ئەڵمانی بێت، ئەوان هەمیشە دەڵێن: "یا... یا."

پاشان ڕوی کردە پیاوێکی قەمبور:

- وانییە حوسێن دە باشی؟

ئەویش بەزەحمەت سەرێکی هەڵبڕی سەیرێکی بەژن‌و باڵای منی کرد کە لە زەویدا پان بوبومەوە:

- بەڵێ، ئەگەر بڵێ یا، یا هەر لەو بێ دینانەیە.

یەکێکی دیکە وتی:

- بەجلەکانیدا دیارە کە ئەڵمانیە.

هەویرەکە ئاوێکی زۆری کێشاو منیش ناچار بووم، خۆم بەکەڕو لاڵ بدەمە قەڵەم یان ئەوەی بەڕاستی ببمە ئەڵمانی.

کڵاوێکی کپم لەسەردا بوو پانتۆڵێکی مەخمەڵی کۆنەم لەپێدا بوو تەواو وەك بێگانە دەر دەکەوتم.

یەکی لێی پرسیم:

- تۆ... ئەڵمانیت؟

سەرێکم بۆ لەقاند، یا...یا.

کابرا ڕوی کردە ئەو خەڵکەی پەیتا پەیتا لەزیادبوندا بوون:

- بەڵێ، ئەڵمانییە، یەکێ نییە ئەڵمانی چاك بزانێ؟ کابرای ڕیشن قۆڵی مام حوسەینی گرت:

- تۆ نەتووت زەمانی جەنگ لەگەڵ ئەڵمانیەکان کارت کردووە، جوان قسە بکە بزانم، لێی بپرسە بۆچی هاتووە بۆ ئێرە؟

دڵم داخوریا، بێت‌و شتێکم لێ بپرسێ چی بکەم؟ گەر خەڵکی بزانن درۆم کردووە بە چ دەردێکم دەبەن، خوا کردی مام حوسێن ئەڵمانیەکەی بیر نەمابوو، ڕەنگە هەر لەئەزەلەوە نەیزانیبێت بەدرۆ لای خەڵکی خۆی

پێوە هەڵکێشابێ.

هاوکات یەکێ لە دوکانەکەی ئەوبەرمانەوە بەپاکردن هاتە مزگەوتەکەوە هاواری کرد:

– دوورکەونەوە، بۆ ئەو داماوە ئازار دەدەن.

یەکێ وەڵامیدایەوە:

– ئاخر ئەمە پیسە هاتۆتە ئەم مزگەوتەوە باش نییە.

– نا، بابە ئەمە موسڵمانە، من خۆم بەیانی کەهاتم دوکانم کردەوە بینیم لەسەر حەوزەکە دەسنوێژی دەگرت.

خوا لە باوکی خۆش بێ بەو شاهێدیدانەی منی قوتار کرد، دیار بوو ئەو کاتەی من ویستبوم لە بەلوعەی کەناری حەوزەکە ئاو بخۆمەوەو دەموچاوم بشۆم ئەم کابرایە منی لە دوورەوە دیتوەو وایزانیوە خەریکی دەسنوێژ گرتنم.

یەکێ لە قەرەباڵغیەکەوە پرسی:

– مام رەجەب ئەم کابرایە نوێژیشی کرد؟

– بەڵێ، دیارە وەك نوێژی ئێمە بوو... بەڵام..

کابرا ڕیشنکەی یەکەمجار وتی:

– ڕەنگە هاتبێ بۆ ئێرە بۆ ئەوەی موسڵمان بێت!

مام ڕەجەب وەکو ئەوەی لەگەڵ کەسێکی ئەڵمانی بدوێ وتی:

– تۆ ... تۆ... موسڵمان دەبیت؟

چاك تێکەوتبووم، نەمدەتوانی بلێم بابە منیش هاونیشتمانیەکی خۆتانم ناوم فەریدەو موسڵمانیشم.

مام ڕەجەب، دووبارە پرسیارەکەی کردەوە:

وتم: یا...

هەر کە ئەم وشەیەم لەدەم دەرچوو لەپێشا مام ڕەجەب دواتریش

ئەوانیتر باوەشیان پێداکردمو چەن ماچێکی بەکوڵیان کردم.

قەرەباڵغی خەڵکەکە تا دەهات زێدەتر دەبوو، خەڵکی بۆ ڕێز لێنانی برایەکی دینیی نۆ موسڵمان پاڵ پاڵێنیان بوو، زۆری نەمابوو بکەومە ژێر دەستو پێی ئەو خەڵکەوە.

مام ڕەجەب قۆڵی گرتم بەزەحمەت لەقەرەباڵغی خەڵکەکە دووری خستمەوە وەك ئەوەی من باش لەزمانی تێبگەم وتی:

- بفەرموو بچینە کەیلە شرەکەی ئێمە.

پیاوە ڕیشنەکە بەپەلە هاتە پێشو پاڵێکی بەسینگی مام ڕەجەبەوە نا.

- ناهێڵم بیبەیتەوە، دەبێ بێتەوە بۆ ماڵی ئێمە.

لە دواوە چەن کەسێکی دیکە بانگیان کرد:

- دەبێ نیوەڕۆو ئێوارەیەکیش ئێمە گەورە بکەن.

- با ئێمەش خێرێکمان دەسکەوێ.

مام ڕەجەب وەك ئەوەی شتێکی ئەنتیکەی دەسکەوتبێ یان هەنگوینی لە کلۆریی داردا دۆزیبێتەوە توند قۆڵی گرتبوومو ڕایدەکێشام.

چووینە بەر دوکانەکەی ئەو بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد:

- زەکی، من میوانێکی ئازیزم هەیە دەرۆمەوە بۆ ماڵەوە چاوێکت لەدوکانەکەم بێ.

- لە کۆڵانێکی باریكو تەسکەوە گەشتینە هەورازێك، زۆری نەمابوو لەبرساندا لەهۆش خۆم بچم، لەڕێگا مام ڕەجەب دەیویست شتێکم پێ بڵێ بەڵام نەیدەتوانی ئاقیبەت بەڕیتمێکی تایبەتی خۆی پرسی:

- تۆ... ناو... چی؟

هیچ ناوێکی ئەڵمانیم بیر نەکەوتەوە خۆمم لەگێلی دا... لەوەی کە نەیتوانی مەبەستەکەی خۆیم پێ بڵێ زۆر بێتاقەت بوو، بەدەم هەڵسوڕاندنی تەسبیحەکەیەوە وتی:

- دەبێ فێری تورکی بکەین.

کاتێ هەورازەکەمان بڕیو گەشتینە سەر ملەو یاڵەکە، مام ڕەجەب لەبەر دەرگای خانویەکی گەورە کە باخچەیەکی جوانی لەبەر دەمدا بوو هەڵوەستەیەکی کرد دوو سێ جار بە ئەڵقەڕێزەکەی لە دەرگاکەیدا.
لەژوورەوە دەنگێکی ژنانەی نەرم نیان بەرز بویەوە:

- کێیە؟

- خۆمانین، کچەکەم. دەرگا کرایەوە، چونکە کەسم لە پشتی دەرگاکەوە نەبینی تێگەشتم بە تەناف دەرگاکەیان کردەوە.

مام ڕەجەب، بسم الله یەکی بەدەنگی بەرز کردو چویە ژوورەوەو خوڵکی منیشی کرد، بەڵام چونکە وام دەرخست کە تێ نەگەشتووم پێکەنینێك لەسەر لێوەکانی قەتیس بوو.

باخچەکەمان بەجێ هێشت و گەشتینە بەر دەم باڵاخانەیەکی خشتی گەورە مام ڕەجەب چەن کۆکەیەکی کردو بەدەنگی بەرز وتی:

- کەس لەوێ نەبێ میوانم هێناوەتەوە.

گەشتینە نهۆمی دووەم چوینە ژوورێکی گەورەوە، ناو ژوورەکە بە "قاڵیی" گەورە ڕاخرا بوو، مام ڕەجەب ئاماژەیەکی بۆ کردم کە دانیشم خۆیشی چوە دەرەوە، لەڕاڕەوەکەوە گوێم لەدەنگی بوو.

- کچەکەم ئاسیا، خواردنێکی گەرم بۆ میوانەکەمان ئامادە بکە.

ئەم ڕستەیە بۆ من مژدەیەکی خۆش بوو، بەڵام بریا لەجیاتی خواردنی گەرم کە زۆری پێ دەچێ تا دەکوڵێ تیکە نانێکی وشکیان پێ بدامایە، دواجار هەرچۆنێ بوو دانم بەخۆمدا گرت تا خواردنەکە ئامادە بوو.

کوڕێکی لاو سینیەکی گەورەی هێناو لەبەر دەمم داینا و ڕۆشتە دەرەوە، بۆنی شیری کوڵاوم هەڵمژی و کەمێ هاتمەوە سەرخۆ.

بەپەلە دەستم برد کاسە شیرەکە هەڵگرم، بەڵام بۆ نەگبەتی مام ڕەجەب

پەردەکەی لاداو هاتە ژوورەوە.

بەپەلـە دەسـتم کێـشایەوە، مـام ڕەجـەب دیـار بـوو پێـی زانـی بـوو پێکەنینێکی درێژی کرد وتی:

– برا گیان بفەرموو، شەرم مەکە، بەماڵی خۆتی بزانە.

من هەروا لێم دەڕوانی، مام ڕەجەب دەستی برد بۆ دەمی خۆیی‌و بە ئاماژە تێی گەیانم خواردنەکە بخۆم منیش سەرێکم بۆ لەقاند "یا، یا." و دەستم برد بۆ کاسە شیرەکە.

مام ڕەجەب دەستێکی دا لەشانم:

– تۆ پشووی خۆت وەرگرە، من دەڕۆم.

لەژوورەکـە چـوە دەرەوە منـیش وەکـو گـورگی برسـی دەسـتم کـرد بـە لوشدانی خواردنەکەو نەشمدەزانی لە کامەیان بخۆم.

پـەنیری پێـستە، کـەرە، شـیرەنگوین، کوتولـە، کاتـێ سـکم تێـر بـوو بەخۆمدا هاتمـەوە کەوتمـە خـەیاڵی ئـەوەی تـا زووە چارەیەك بدۆزمـەوەو لەم تەڵەیە دەربازبم.

بێت‌و بـزانن درۆم لەگـەڵ کـردوون‌و فریـووم داون بەڵایـەکی وام بەسـەر دێنن وێنەی نەبێ.

باشتر وایە تا گیانم گەرمەو کار لەکار نەترازاوە تێی تەقێنم.

هەستامەوە خۆم گورج بکەمەوە بۆی دەرچم لـەناکاو پـەردەی ژوورەکە لادراو مام ڕەجەب بەخۆی‌و مەلایەکی نورانیەوە هاتنە ژوورەوە.

هێنـدە شـپرزە بـووم هیـچی نـەمابوو پـەت بـدەم بـەئاودا، بـەزمانێکی پاراوی لای خۆمان بەخێراتنی مامۆستا بکەم، بەڵام بەپەلە کەوتمـە خـۆم دەستەکانم بەشێوەی خاچ لەسەر سینگم داناو سەرم بۆ نەوی کرد.

مـەلا ئـەم ڕەفتـارەی منـی گـەلێ پـێ پەسـەند بـوو، چـەن ڕسـتەیەکی عـەرەبی وت جـوان لێـی تێنەدەگەیـشتم پاشـان لـەکاتێکا بـەرەو ڕووم

دەهات وتی:

– سەرەتا دەبێ بزانین ئەم ئەڵمانیە چ کارەیە؟

– مامۆستا، ئەم ئەڵمانیانە یان سەربازن یان زانا، دیارە ئەم پیاوە کەسێکی تێگەشتووە وا موسڵمان بووە.

مامۆستا نەرمە کۆکەیەکی بۆ کرد وتی:

–دیارە زانستی ئەمانە وەکو ئێمە نییەو ناگەنە ئاستی ئێمە! ئەمانە هەموویان بۆ مادە کار دەکەنو لەگەڵ مەعنەویاتدا سەرۆکاریان نییە.

مام ڕەجەب سەرێکی لەقاندو فەرمایشتی مامۆستای پشت ڕاستکردەوە.

– تەواوە.

هیچی نەمابوو پێکەنینم بەقسەو ڕەفتاریان بێت، بەهەر کلۆجێ بوو خۆم گرت تا بزانم ئاقیبەتی کار بەکوێ دەگات.

جەنابی مامۆستا دیقەتێکی وردی لەبەژنو باڵامدا:

– ئێستە ئەم پیاوە موسڵمان بووە دەبێ سودێکی زۆر لەم مەسەلەیە وەرگرین "خودایە خۆت ڕەحممان پێ بکە."

منی بێچارە لەچاڵێك دەرهاتبومو بەسەردا کەوتبومە چاڵێکی دیکەوە، نەمدەزانی مامۆستا چ خەیاڵێکی بۆ کردومو چۆن دەیەوێ سوودم لێ وەربگرێ.

مام ڕەجەب دەیویست قسەیەك بکات، مامۆستا بواری نەدا وتی:

– دەبێ وێنەیەکی فرەی لێ بگرینو هەموو وڵاتەکان ئاگادار بکەینەوە کە ئەڵمانییەك موسڵمان بووە.

لەبیستنی ئەم قسەیە ئارەقێکی سارد تا نوکی پێی تەنیم:

"ئەی هاوار، من هاتمە ئەم شارە دوورە کە دەرنەکەومو گومناو بژیم، ئەمانە دەیانەوێ سەرم لەقوڕ بنێنەوە."

مام ڕەجەب بەدوای قسەکەی مامۆستادا وتی:

- بەڵێ، لەهەموو رۆژنامەکانی خۆماندا دەبێ وێنەی بڵاو بکەینەوە.

ئەتوت بەکوتەك دەکێشن بەسەرمدا، وا تێکچوو بووم خەریك بوو سەکتەم دەکرد. ئەگەر وێنەم لە رۆژنامەکاندا چاپ بکرێ قوڕی دنیا بەسەرما ئەکرێ.

خوا کردی و مامۆستا ئەو پێشنیارەی پەسەند نەدا.

- تۆ دەڵێی چی پیاوی باش، بێت و مەرکەز پێی بزانێ کەسێکی بەمجۆرە لێرەیە دەیبەن.

لەخۆمەوە سەرێکم لەقاندو بزەیەك کەوتە دەمو چاوم، دووبارە خوا ڕەحمی کرد مامۆستا و مام ڕەجەب پێیان نەزانیم ئەگینا کارەکە گەنتر دەبوو.

مام ڕەجەب جگەرەیەکی بۆ ڕاگرتم، زۆری نەمابوو بڵێم جگەرەکێش نیم وتم: ج... جج بیرم کەوتەوە. تازە پیتی جیمیش لەدەمم دەرچوو بوو نەدەکرا قسەکەم بگەڕێنمەوە وتم:

-جر. فان در. هیزن.

مامۆستا و مام ڕەجەب بە واق بونەوە تەماشایان کردم:

- کەس نازانێ ئەم بەستەزمانە دەڵێ چی! دەبێ خێرا تەرجومانێك پەیدا بکەین.

من زۆر دەستەپاچە بوو بووم، بەجۆرێ دەست و سەری خۆمم جوڵاند دەمویست سەرو بنی مەسەلەکە لێك بدەم.

مام ڕەجەب قاقایەکی درێژی کێشا و دەستی خستە ژێر چەنەی وتی:

- تۆ، خەو، پێویست؟

- یا... یا.

مام ڕەجەب ڕوی کردە مامۆستا وتی:

- هەقی خۆیەتی داماوە ڕێیەکی زۆری تەی کردوە کفت و کۆڵەوارە بابچینە ئەو ژوورە بەڵکو ئەویش پشویەك بدات.

ئەوان هەستانە سەر پێ و مامۆستا وتی:

- لە پێشا دەبێ مەراسیمی مەزهەبی و خەتەنەی بکەین، دوایش کارێکی بۆ جۆر دەکەین.

مام ڕەجەب ئەشەدو بیلای بۆ کێشا.

- دیارە ئەرکی خۆمانە هاوکاری بکەین برایەکی دینیمان بۆ زیاد بووە.

لە دڵی خۆمدا وتم: دیارە برای دینی کەم بوو...

سەدان هەزار برای دینی بەهەژاری و داماوی هەیەو کەسیش لەخەمیاندا نییە.

جەنابی مامۆستا بەمیهرەبانیەکەوە سەیری کردم.

- بەڵێ، دەبێ ژنێکی باشی بۆ بێنین...

هێندە ڕقم هەستابوو دەمویست لەم گاڵتەجاڕییە دەس هەڵگرم و هەرچی جنێوێ لەدەمم دێتە دەرەوە پێیان بدەم، ئاخر توخوا سەیرکەن ئەو هەموو موسڵمانە بەهەژاری و نەهامەتی دەژین و کەسیش بیریان لێناکاتەوە، کەچی بۆ کەسێکی مەسیحی موسڵمان بووە چەندە بەپەرۆشن، ئێستا ئەگەر بڵێم من ئەڵمانی و مەسیحی نیم برای دینی ئێوەم و خەڵکی ئەم وڵاتەم هێشتا ئێوە ئامادەن هاوکاریم بکەن؟ دیارە کەنا؟

پێکەنینێکی زۆرەکیم بۆ مامۆستاو مام ڕەجەب کرد ئەوان لەژوورەکە چوونە دەرەوە، کوڕێژگەیەك پێخەفی بۆ هێنام و مام ڕەجەب هاتەوە ژوورەوەو جێگاکەی نیشاندام، دەستی خستە ژێر سەری و چاوی نوقاند.

من سەرێکم بۆ لەقاند وتم:

– گدۆن گشون" واتا سوپاس". ئێستە ئەم وشەیە لەوێ فێر بووم خۆیشم نەمدەزانی...

مام ڕەجەب بەدەنگی بەرز وتی:

– گەر شتێ پێویست... بانگ بکە... تێگەیشتی؟ دووبارە سەرم لەقاندەوە: "یا..."

هێندە ماندو بووم هەر کە مام ڕەجەب چوە دەرەوە وەك دارێك لەبن و بێخ بیبڕیتەوە کەوتمە زەوی.

خوایە... خوای گەورە... خۆت ڕزگارم بکە، سبەی بەیانی چارەم چییە؟

بێت و تەرجومانی ئەڵمانی بێنن چی بڵێم؟ گەر بیانەوێ خەتەنەم بکەن چی بکەم؟؟؟

دەڵێن بنیادەم خۆی ژیانی خۆی دروست دەکات...!

ڕەنگە کەسانیتر بتوانن ژیان بۆ کەسێك دروست بکەن، بەلام ئەو کەسانە زیاتر لەژیاندا سەرکەوتوو دەبن کە لە سەر پێی خۆیان بۆستن و بە ورەو تین و تواناوە بەرەو ئامانجەکەیان هەنگاو هەڵدەگرن... بەڕوکەش ئەم قسانە هەموویان مەنتیقی و جوانن بەلام لەڕاستیدا هەر وایە؟!

ڕاستە من هەڵەیەکم کردو لە ناوەندی سەربازی دەرکرام، بەلام ئایا لەبەرکردنی جلی ئەفسەریی... بوونە کارمەندی بانك... لەقەبی شکارچی ژنان بەخواستی من بوو... بەدەستی من بوو...؟ نا...!

هیچ کامێك لەم کارانە تەنانەت بەخەیاڵیشمدا گوزەریان نەکردبوو... من هیچ حەزێکم بۆیان نەبوو، ئێستاش وەك ئەڵمانییەك بەگیریان هێناوم... تەنها خودا بۆ خۆی دەزانێ ئاقیبەتم بەچی دەگات.

نا... ئەمجارەیان چۆك دانادەم بۆ چارەنوس، دەبێ خودی خۆم بناغەی ژیانم دامەزرێنم... ئەمشەو لێرە دەبم و سبەی بەیانی زوو هەڵدێم.

کاری پێشاوم هەبوو...

کە دەرگای ژوورەکەم کردەوە شتێك بەهەموو هێزی خۆیەوە کەوتە ژوورەکەو قریشکەیەکی درێژ لە ڕاڕەوەکەدا دەنگی دایەوە...

بەندی جەرگ و هەناوم داکەوت، ئارەقێکی سارد هەموو گیانی تەنیم...

ئەو جوانە مەرگە کچەکەی مام ڕەجەب بوو کە گوایە خەریك بوو لەکونی کلیلی دەرگاکەوە سەیرم بکات هەرکە دەرگاکەم کردەوە نەیتوانی خۆی بگرێتەوە دەمەو ڕوو کەوتە ژوورەکەو قیژاندی...

لەوەگەڕێ کە زۆر ترسام، لەوەش تۆقی بووم ئێستە مام ڕەجەب و ئەوانیتر بگەنە سەرم و ئابڕوم بچێت، بەڵام نەمتوانی سەیری ئەندام و ڕوخساری ئاسیا کە دەم و چاوی بە پەچەی نوێژکردن داپۆشی بوو نەکەم. خوایە، لە بەژنی، لە باڵای، لە ڕەنگی، لە ڕوخساری، لە پێستی، لە قژی قەشەنگی، لە چاوی درشتی. دەتوت مامزەو لەداو کەوتووە، چاوە ئەفسوناوییەکانی حاڵەتێکی نامۆیان هەبوو، لەشەرمدا ڕوخساری وەکو گوڵی هەنار سور ببوو، تنۆکی ئارەق بەسەر ڕومەتیدا قەتارەیان بەستبوو.

دووبارە خوا ماڵی ئاواکا، لەو کاتە هەستیارەدا بەر لەوەی دەرگای ژوورەکانیتر بکرێنەوەو دایك و باوکی بێنە دەرەوە کچە خۆی لەسەر خشتی ڕاڕەوەکە ڕاکێشا. منیش لەو کاتە کورتەدا دەگاکەم داخست و بەدەم لەرزینەوە لەو دیو دەرگاکەوە ڕاوەستام بۆ قسەکانیان گوێ قوڵاخ بووم.

مام ڕەجەب هاواری کرد:

- چی بوو کچێ؟ ئاسیا وەك هونەرمەندێکی لێزان بەدەم قوڵپی گریانەوە وەڵامیدایەوە:

- پێم هەڵخزاو کەوتم بەزەویدا. ئاخ وای...

دەنگێکی ژنانە وتی:

- ئازاری زۆرت پێ گەیشت؟

- وابزانم قاچم لەجێ چووە، ئاخ مردم.

مام رەجەب بە توڕە بوون و ناڕەحەتیەوە وتی:

- ڤیروسیا، وەك بنیادەم بەڕێدا برۆ.. بێدەنگبە میوانەکەمان خەوی لێ دەزڕێ.

دەنگێکی ژنانە وتی:

- برۆ بزانە بە خەبەر نییە.

دووبارە بەلایەکی دیکە، خەریك بوو دەچوومە سەر جێیەکەم مام ڕەجەب هاتە ژوورەوە سەیرێکی کردم.

بۆ ئەوەی وا بزانێ تازە لەخەو ڕابووم. باوێشکێکم کێشا دەستم کرد بەقسەی ئەڵمانی و هەرچیم بەدەمدا هات نەمگێڕایەوە.

مام ڕەجەب پێکەنی:

- تۆ، پێویست، بخەوی.

- منیش تێمگەیاندەوە...یا.

دیسان دەرگای ژوورەکە داخرایەوە، هێشتا لەڕاڕەوەکەدا دەنگی گریان و ناڵەی ئاسیا دەهات. هێندە گریانێکی ئاسایی دەگریا وامدەزانی بەهۆی کەوتنەکەوە بەڕاستی ئازاری پێگەشتووە.

مام ڕەجەب و ژنەکەی کچەیان بردە ژوورەکەی خۆیان و دنیا خامۆش بوو، بەلام بەلایەکی نوێ بەرۆکی گرتم.

هەستم کرد نەك بەدڵێك بەڵکە بەسەد دڵ عاشقی ئاسیا بووم.

هەی نەفرەت لەوشانسەم، نازانم بۆچی وەختێ بنیادەم سکی تێر دەبێ بیر لەعەشق و ئەویندارى دەکاتەوە.

ئەمەش بەدەستی خۆم نەبوو، من بێ ویستی خۆم عەشقێکی ناگەهان بەرۆکی گرتبووم.

تەنگاو بووم پێویستم بەچوونە سەراو بوو، جوان گوێم هەڵخست کاتێ دڵنیابووم هەموو خەوتوون لەژوورەکە هاتمە دەرەوە. لەڕاڕەوەکەدا تروسکاییەك هەبوو لەوسەریشەوە لەبەردەرگاکە خاولیەکی بچوك بەبزمارێکدا کرا بوو.

وتم ئەم خاولیە نیشانەی ئەمەیە ئێرە دەسشۆری و سەراوە دەسکی دەرگاکەم باداو دەرگا کرایەوە، قیژەی ژنێك و هاواری جنێوی پیاوێك وەکو تۆپ لەمێشکمدا تەقییەوە وەك کەسێ کارەبا گرتبێتی لەجێی خۆم وشك بووم.

ئێرە ژووری نوستنی مام ڕەجەب بوو، خۆی و ژنەکەی گوایە بەبۆنەی خێری موسڵمان بوونی مەسیحیەك جووت بوو بوون و جەژنیان گێڕا بوو.

نەفرەت لەو شانسەم ڕاستیان وتووە:

"دزی نەشارەزا ڕوو لەکادێن دەکات!"

ئێستا چی بکەم؟ ئەم گەن و گووە چۆن پینەکەم؟

هێندە شپرزە بووم و خۆمم دۆڕاندبوو بۆ چەن ساتێ جوڵەم لێ بڕا بوو.

وەك پەیکەرێکی بێ گیان یان مەحکومێك ببرێتە پای سێدارە بێ هەست و خوست چاوەڕێی چارەنوس بووم.

لەپڕ دەنگی قیژەیەکی ترسناك لەژوورەکەی تەنیشتمەوە هات، مام ڕەجەب وەك پڵنگی بریندار لە پێخەفەکەی دەرپەڕی تاکو تێلا ترێنم کات یان دەم و قەپۆزم بهاڕێت، تەمبێ کردنی منی بیر چویەوە بەتوندی

مشتێکی لەسینگم دا، لەبەر دەمی دەرگاکە لایدام‌و ڕایکردە ژوورەکەی تەنیشتمەوە کە ئاسیا تێیدا دەیقژاند:

– چیتە، کچە تیوە گێژە؟

– دز. دز هاتووە.

– دزی چی؟

– لە ڕاڕەوەکەدا بوو.

– گەمژە ئەوە میوانەکەمان بوو.

دواتر تێگەشتم ئاسیا لەچاودێری مندا بووە بەتایبەت ئەم دەورەی بینیوە.

پاش ساتێك مام ڕەجەب توڕەو تۆسەن لەژوورەکە هاتە دەرەوە بەڕق‌و قینێکەوە بە سەر مندا قیڕاندی:

– بەئەستۆی وردو ملی شکاوت خەریکی چیت؟

من بێ ئەوەی گوێ بدەمە ئەوەی لەزمانی ئەو تێناگەم دەستم خستە سەر دڵم‌و ناڵاندم:

– ئاخ، در. هیزن.

مام ڕەجەب قینەکەی ڕەویەوە لەکاتێکا دەچویە ژوورەوە بە ژنەکەی وت:

– وابزانم ئەم داماوە خواردنەکەی ئێمەی پێنەکەوتووە تووشی ژانە سك بووە.

ژنە دەستی کرد بەبۆڵە بۆڵ:

– تۆیش بەڵایەکت بۆ گیانی ئێمە هێناوە.

– وسبە ژنەکە، میوان خۆشەویستی خوایە، نەخوازەڵا ئەمەش خێری دوو بەرابەرە هەستە کەمێ ئاونەباتی گەرمی بۆ دروست بکە.

– ئەم زەحمەت بدە بەرخۆت‌و خێرەکەیشی ببە بۆ خۆت. مام ڕەجەب

لەژوورەکە هاتە دەرەوە لەکاتێکا ئاماژەی بۆ ژوورەکە دەکرد:

– تۆ، پێویست، ژوور، ئێستە من دێم سك ئێشە، چاك دەکەم.

لەتەنگاویدا خەریك بوو دەتەقیم هاوارم کرد.

– من، پێویست، تەوالێت.

– ئێستا چ وەخت، تەوالێت، نێرەکەرە بەو نیوە شەوە هەوەسی تەوالێتی هەستاوە.

ئەمجارەش هەر ئاسیا فریام کەوت، دیار بوو لەو دیوی دەرگاکەوە گوێبیستی قسەکانمان بوو.

بەدەنگێکی بەرز وتی:

– بابە، دەیەوێ بچێتە ئاودەست.

– ملت بشکێنە من چوزانم تۆ چ کاوێژێ دەکەی؟

– پاشان ئاماژەی بۆ کردم بچمە ئەوسەری باخەکەوە.

ژنەکەی لەژوورەوە هاوری کرد:

– مەسینەکە گلاو نەکات.

– نا بابە موسڵمان بووە ئیتر.

کاتێ خۆم خاڵی کردەوەو گەڕامەوە بۆ ژوورەکە ئەنجا حەوشەی جوان و پڕ دارو درەختی مام ڕەجەبم بینی.

"چەن ماڵێکی خۆشە خۆزگەم بە خۆیان باخێکی ئاوان هەیە."

لە ژوورەوە خەیاڵم ئاسودە بوو، دەبوو پلانێکی جوان داڕێژم..

خەیاڵی بوونە ملیۆنەریم لە مێشکدا نەمابوو، تەنها ئەوەم دەویست بەبێ دەردەسەریی لەم داوە قوتار ببم.

باشترین ڕێیەك بەخەیاڵمدا هات ئەوە بوو دەست لەم خواردن و پێشوازیانە هەڵگرم و بەیانی زوو پێش ئەوەی خانەخوێ لەخەو هەستێ لەم شارە دەرچم و بچمە سوچێکی دیکە.

نازانم کەی خەوم لێکەوتبوو، بەدەنگی ناسازی کەڵەشێر بێدار بوومەوە لەدەلاقەی ژوورەکەوە سەیرێکی گزنگم کرد.

سپێدەی بەیان تازە دەمی دابوو، بەپەلە خۆم گۆڕی بۆ ئەوەی کەس پێم نەزانێ بەنوکی پێ لەژوورەکە هاتمە دەرەوە، هەرکە لەپلیکانەکان هاتمە خوارەوە دەنگی قیژەی ئاسیا وەك زەنگی مەرگ دەنگی دایەوە.

- بابە، ئەڵمانیەکە خەریکە دەڕوات، بابە ڕاکە گەیشتە کۆڵان! ترسی ئەو بەڵایەی چاوەڕوانم بوو سەرتاپێی تەنیم؟!

- هەی دادو بێداد، بێت و بگیرێمەوە چ خاکێ بەسەرداکەم؟

- هەنگاوەکانم خێراتر هەڵگرت.

- لەکۆڵان تاکوتەرا ئەو خەڵکەم دەبینی کە دەچوون بۆ حەمام یان بۆ مزگەوت، گەر توانیبام خۆم بگەیێنمە دەرەوەی شار کارەکە ئاسان دەبوو.

لەدواوە گوێم لەدەنگی مام ڕەجەب بوو:

- هۆی.! هۆی.! کاکە.!

- هەنگاوەکانم خێراتر کرد، زۆری نەما بوو نەرمە غارێکی بۆ بکەم.

بەڵام، تا دەهات دەنگی مام ڕەجەب نزیکتر دەبویەوە زیاتر هاواری دەکرد. دیارە ئەویش بەڕاکردن بەدوامدا ڕای دەکرد بەردەوام بانگیشی دەکردم.

- هاوڕێ، هۆی، براکەم، برای دینی، بۆ کوێ دەچیت؟

هێواشبە، هەناسەم تیا نەما، بۆستە بزانم ئەڵمانی.!

وردە وردە خەڵکی تێمان دەگەیشت، خەیاڵێك دایگرتم:

"تۆ بڵێی مام ڕەجەب وابزانێ شتێکم لەماڵیان دزیوە؟"

"ئەگەر دەوەستم عەیبێك و دەشرۆم دووان."

"خوایە چی بکەم. چارەم چییە؟"

وەختێ لەهەورازەکە شۆڕ بوومەوە مزگەوتەکەم بینی خەیاڵێکی باشم

بۆ هات، چوومە حەوزخانەی مزگەوتەکەو لای بەلۆعەکەوە وەستام و خەریکی دەستنوێژ گرتن بووم.

مام ڕەجەب هەناسەی تیا نەمابوو، بەدوامدا ڕای دەکرد هەر کەبینی بۆ نوێژکردن هەڵە داوانمە پێکەنینێکی درێژی کرد:

–بابە گیان دەبوو بتوتبایە بۆ نوێژکردن دێیت، ناوکت خستین!

پاشان لەگەڵ خۆی کەوتە قسەکردن:

"ئەم داماوە هەرچەن قسەش نازانێ."

"من خەریکی کاری خۆم بووم، مام ڕەجەب دوو سێ کەڕەت بەهێواشی دەستی دا لەپشتم:

– مەرحەبا، ئافەرین، خوا چ نورێکی خستۆتە دڵی ئەم ئەڵمانیەوە، لەئێمە موسڵمانترە، نوێژەکەی بەیانی زوو دەکات.

مام ڕەجەب هێندە لە مزگەوت مایەوە تاکو نوێژەکەم بەئەدای تایبەتی خۆم کرد، پاشان قۆڵی گرتم و بردمیەوە بۆماڵی خۆیان.

– زانیم بەو ئاسانیە ناتوانم لەماڵی ئەوان هەڵێم، بەڵام چارەم چییە؟ نەمدەزانی.

– خۆمم سپاردە دەستی چارەنوس تەسلیمی کارەسات بووم.

چەن سەعاتێ دواتر جەنابی مامۆستا بەپێنج شەش کەسەوە تەشریفیان هێنا.

مامۆستا، چەن ڕستەیەکی عەرەبی وت و منیش لەدوایەوە دوپاتم کردنەوە. بەهێنانی شایەتومان بەڕەسمی ئیمانم بەئیسلام هێنا.

هەڵبەت ئەمە دووەمجار بوو موسڵمان دەبوم، جەنابی مامۆستا وتی:

– ناوت چییە؟

– خۆمم لەگێلی دا، جەنابی مامۆستا بەدانیشتوانی وت.

– یەکێکتان خێرا بڕوات مامۆستای زمانی فەرەنسی قوتابخانەکە

بێنێت.

دوای چەن خولەکێ ماموستای فەرەنسی هات، لەوە دەچوو هەموو شتێ بزانێ.

پرسی:

– ئەمە برا دینیەکەمانە؟

ماموستا وەڵامیدایەوە:

– بەڵێ، قسەی لەگەڵ بکەو بزانە کێیەو لە کوێوە هاتووە؟

ماموستای فەرنسی وتی:

– ئەمانە لەزمانی فەرەنسی تێناگەن.

تێگەشتم فەرەنسی زانینەکەی کاکیشم هەروەك ئەڵمانیەکەی منە.

گیانم بەوە بوو لە قوتابخانە کەمێ فێری فەرەنسی بووبووم.

جەنابی ماموستای فەرەنسی بەگومانێکەوە لێم هاتە پێشەوە وتی:

– پار لی ڤوو فەرەنسا؟!

– وی.

گوایە دەویست لێم بپرسێ ناوت چییە، کەچی هەڵەی کرد وتی:

– کیلی ڤوترو نومرو؟ واتا "نمرەت چەندە.؟

من پێکەنیم و ئەویش تێگەشت، وتم:

–پاردون.

پاشان وتی: "ناوت چییە؟"

وتم:

– کارڵ.

کاکم ڕوی کردە جەنابی ماموستا وتی:

–هەروەك وتتان ئەم بەڕێزە یەکێکە لەبیرمەندانی گەورەی دنیاو دەڵێ من لێکۆڵینەوەم لە هەموو ئاینەکان کردووەو پەییم بردووە بەوەی

ئیسلام لەهەموویان باشترە.

ئێمە تەنها دوو ڕستەمان پێکەوە وتبوو، ئەویش ئەم هەموو شەرح و تەفسیرەی بۆ قسەکانم زیاد کرد، ئەو خەڵکە ساویلکەیەی لەوێ بوون لەزانیاری مامۆستای فەرەنسی مات و حەیران بوون.

– ئافەرین کاکی موعەلیم چەن جوان بەفەرەنسی قسە دەکات.

– بەخوا خوێنەوارییەکی باشت هەیە.

یەکێ لە دانیشتوان کەسێکی لاپرس بوو وتی:

– ئێوە تەنها پێکەوە دوو قسەتان کرد، چۆن ئەم هەموو مانایەی هەبوو؟

مامۆستای فەرەنسی بێ ئەوەی بەسەر خۆی بێنێ وەڵامیدایەوە:

– ئەمە وابەستەی ژیریی و کارامەیی مرۆڤە، زمانی فەرەنسی وەکو زمانی ئێمە نییە ئەم هەموو درێژ دادڕییەی هەبێ، هەر وشەیەکی کۆڵێ مانای هەیە، زمانی بیانی وەکو قاڵبە سابون وایە، دەبینی پارچە سابونێکی بچووک دنیایەك کەف دەکات.

من بۆ ئەوەی پێنەکەنم توند لێوی خۆم دەکرۆشت.

مامۆستای فەرەنسی کە دیار بوو زۆر ساختەچیە، دەستی کرد بەخوێندەوەی یەکێ لەو چیرۆکانەی لە پۆلی دووەمی فەرەنسیدا دەخوێنرێت وەکو بولبول دەیخوێند.

"جان، کیفەکەی هەڵگرت، دایکی ماچ کردوو ڕۆشت بۆ قوتابخانە، جانتیش هاوسێیان بوو، لەڕێگە چاویان بەیەکتر کەوت و سەرگەمی قسەو گاڵتە گەپ بوون، کاتێ گەیشتنە قوتابخانە زەنگی چونە ژوورەوەی پۆل لێ درابوو."

دوای هەموو ڕستەیەك وچانێکی دەگرت و لەمنی دەڕوانی، منیش بۆ ئەوەی کارەکە لەوە زیاتر گەن نەبێت سەرم بۆ دەلەقاندو خێرا دەمووت:

- و... و... مسیۆ.

کاتێ چیرۆکەکە کۆتایی هاتو کاکی مامۆستا هەگبەکەی بەتاڵ بوو، ڕوی لەدانیشتوان کرد:

- گوێتان لێ بوو؟

جەنابی مامۆستا بەدوو پەنجەی ڕدێنی شانە دەکرد وتی:

- براکەم، تۆ زۆر باش لەزمانی ئەم فەرەنگیانە دەزانی.

- بەڵێ، من جارێکیان لەگەڵ پیاوێکی فەرەنسی دەدوام کابرا گەلێ پێی سەیر بوو، تەنانەت خودی فەرەنسیەکانیش لەگەڵ من دەرناچن، کەسێ دەتوانێ لەگەڵ مندا بدوێ کە زمانە فەرەنسیەکەی تەواو بێت، ئەم کەسەش ئەڵمانیەو باش ناتوانێ بە فەرەنسی بدوێ.

جەنابی مامۆستا پشت ڕاستی قسەکانی کردەوە وتی:

- باشە، ئێستا ئەم بیانیە ناوی چییە؟

- کارڵ.

- زۆر باشە، کەواتە دەتوانین ناوی لێ بنێین کامل.

هەموو دانیشتوان ئافەرینی دەرك‌و ژیریی جەنابی مامۆستیان کردو بەندەش نازناوی نوێم کامل بوو.

دوای ئەنجامدانی ئەم مەراسیمە سەر لەنوێ خواردنی شیرینی دەستی پێکردەوە قاپە شیرینی‌و مرەبا مەجلیسی ڕازاندەوە.

هەروا لەسەرو مەجلیس‌و لەبن دەستی مامۆستاوە دانیشتبووم کەوتمە دەریای خەیاڵەوە.

"بۆچی ئەم هەموو موسڵمان‌و برا دینیە لەوڵاتی ئێمەدا کەوتون‌و کەسیش بچوکترین گرنگیان پێ نادات، بەڵام بۆ من کە بەخەیاڵی خۆیان بیانیم‌و نۆ موسڵمانم ئەم هەموو خەرجی‌و میوانیەم بۆ ساز دەکەن؟"

"خوا بکا هەژارو نەداری وڵاتەکانی دەرەوە ئەم هەواڵە نەبیستن،

ئەگینا لێشاوی کۆچبەرانی سواڵکەر ڕوو دەکەنە وڵاتەکەمان گیروگرفتی نوێش دەبێتە سەرباری ئابوری و بازرگانی شڕو شێواوی ئێمە. "

"ئەو کاتە هەژارترین کەسی وڵاتی ئێمە دەرپێی خۆی لە پێ دادەکەنێ و دەیکاتە پێی نۆ موسڵمانە بیانیەکان".

زۆر پێم سەیرە چۆنە تا ئێستا فەرەنگیەکان بیریان لەمە نەکردۆتەوە بێن و موسڵمان بن ئەم هەموو خێرو بێرە ببەن بۆ خۆیان.

ئەگەر بڵێین ئاگایان لەو مەسەلەیە نییە ڕاست نییە، زۆرجار بینیومانەو بیستومانە هەرکاتێ یەکێ لەئێمە لە ماڵەکەی خۆیدا قسەیەکی نهێنی بە ژن و منداڵەکەی خۆی بڵێ دوو سێ ڕۆژ دواتر لە رادیۆو ڕۆژنامەکانیاندا پەخش دەکرێت، ئەی بۆچی لەو بارەیەوە هەنگاوێکیان بۆ نەناوە...؟

بێگومان هۆکارێکی گرنگی هەیە ئێمە تا ئێستا پێمان نەزانیوە. بەکورتی مام ڕەجەب دەستی لەهەموو کارو پیشەیەك هەڵگرتبوو تەنها خزمەتی منی دەکرد، جوانترین جل و بەرگی بۆ دانا بووم، باشترین خواردنی بۆ ئامادە دەکردم، شەوو ڕۆژ یان خۆی یان ئاسیای کچی خزمەتیان دەکردم.

منیش ئەو گەرمو گوڕییەی جارانم نەمابوو، ڕاستیەکەی نەمدەویست و نەمدەتوانی ئەو ماڵە بەجێ بێڵم، لەلایەك ڕێگەی هەڵاتنم لێ بەسرابوو، لەلایەکی دیکەشەوە ملم بووبوو بەپەتی ئاسیاخانەوە.

بمبورن قسەکەم بەجۆرێ تێمەگەن، خۆشەویستی من عەشقێکی بێخەوش و ڕۆمانتیك بوو، چونکە هەردووکمان دەمانزانی بارو دۆخ بۆ هاوسەرگیریمان گەلێ لەبارە، هەڵەیەك لەبرەودانی ئەم خۆشەویستیەدا لەگۆڕێ نییە.

بەهەموو ئاکارو ڕەفتارێکی مام ڕەجەبدا دیاربوو حەزی دەکرد شانازی

بەزاوا کردنی خۆیم پێ ببەخشێت، هەر لەبەر ئەمەش پەلەی بوو بۆ خەتەنە کردنم.

ئەو رۆژە دوای خواردنەوەی شیرینی سەر لەنوێ مەسەلەکەی دوپاتکردەوە بڕیار درا سبەی مەراسیمی خەتەنەی من جێبەجێ بکرێ. خوایە خۆت لەشەڕی ئەم کارە پارێزاروم بکە.

بۆ سبەینێ خۆمم نەخۆش خست، مام ڕەجەب دکتۆری بۆ هێنام، ئاسیاو دایکی کە منیان بەزاوای ڕەسمی خۆیان دەزانی بە بێ هیچ لە روو دامانێك دەستیام کرد بە خزمەت کردنم.

خودا ئاسیا زەلیل بکا، هەر کاتێ چاوم بەچاوەکانی دەکەوت. چوار پەلم دەشکا، وای لەو چاوانەی، چەن پێستێکی نەرم‌و نیانی هەبوو دەتوت پەڕەی گوڵە، تاڵە قژە ئاڵتونیەکەی سەریی دەتوت ئاوریشمی پاڵفتەیە.

کاتێ لەژێر چاوەوە لێم ورد دەبویەوە شەرمێکی ناسکی کیژانە دایدەگرت، لێوە خونچەییەکانی هێندە قەشەنگ بوون بنیادەم خۆی پێنەدەگیرا دەیویست بیانگەزێ.

باوەڕ بکەن لەبەر خاتری ئاسیا نەبوایە ئامادە نەبووم یەك خولەك لەو ماڵە نەفرەتیەدا بمێنمەوە.

بەڵام ئەو عەشقە سەختە بوو منی لەوێ کۆت‌و بەند کردبوو، بوو بوە هۆی بەدبەختیم.

سات بەسات زیاتر ئالودەی ئەو مامزە کێویە دەبووم، هەرچیم دەکرد عەشقی ئەو لەسەرم دەر بکەم نەدەکراو نەدەکرا.

راستیان وتوە عەشق جۆرە نەخۆشیەکە، من تووشی ئەو نەخۆشیە ببووم.

تەسلیمی چارەنوس بووم‌و ئیرادەی گەڕانی چەرخی ژیانم دایە دەستی

تەقدیرا "هەرچی دەبێ با ببێ... لەگەڵ ئاسیا هاوسەرگیریی دەکەم، دەبینە خاوەنی پێنج شەش مناڵێك، ژیانێکی سەربەرزانە پێك دێنین، دوای شەش حەوت ساڵێ پێشینەی زیندانیەکەم زەمەن کۆنی دەکات، دەستی ژن و مناڵەکەم دەگرم دەچینە ئەستەمبوڵ، ژیانێکی ئاسودەیی دەست پێدەکەین."

چەن خەیاڵ پلاوێکی شیرینم لەسەردا دەپەروەراند... هەیهوووو!؟

چەن رۆژێ تێپەڕی، چیتر لەوە زیاتر نەمتوانی خۆم بکەم بەنەخۆش، ئاخر نە تام لێ دەهات، نە ڕەنگ و ڕویشم پەڕی بوو.

بەکورتی هەرچی دکتۆرەکان سەرو ژێریی منیان دەپشکنی و تاقیان دەکردەوە بچوکترین شوێنەورای نەخۆشیم تێدا نەبوو.

نەگبەتی لێرەدا بوو، ئەو خۆ نەخۆش خستنە درۆینەیە نەك تەنها باری منی ڕاست نەکردەوە بەڵکو ئاڵۆزتری کرد، مام ڕەجەب بڕیاریدا مەجلیسی خەتەنە سورانی گەورەم بۆ ساز بکات.

تەنانەت کارتی دەعوەتیشیان بۆ چاپکردو مێژوەکەیان دیاریکردو کاکی دەلاك "خەتەنەکەر" ئاگادار کردەوە.

ئەم وەستایە لەم شارۆچکەیەدا هەمەکارە بوو، دوکانی سەرتاشخانەی هەبوو، کەڵەشاخی دەگرت، ئیشی دەلاڵی خانوبەرەو جار جارەش قەواڵەی گرێبەستی دەنوسی.

کاتێ ئەوم ناسی کەمێ دڵم ئارام بوەوە، ئەمجۆرە کەسانە لە هەمبەر پارەدا هەموو شتێ دەکەن.

لەو ماوەیەدا مام ڕەجەب هەموو رۆژێ هەندێ پارەی کردبویە گیرفانی جلەکانم بڕیارمدا پەنجا لیرەیەك پاشەکەوت بکەم بە بەرتیل بیدەم بە وەستای دەلاك بۆ ئەوەی زۆرم لێنەکات.

بەمجۆرە کارمان بەخێرو خۆشی دەڕۆشت و مەراسیمی زەماوەندی

مـن و ئاسـیا مـسۆگەر دەبـوو، ئەگـەر دوای ئـەوەش وەسـتا شـتێکی بدرکاندبایە کەس باوەڕی پێ نەدەکرد.

رۆژی جەژنی خەتەنەکردنی من فەرتەنەیەکی سەیر بوو، دەتوت هەموو خەڵکی شاریان دەعوەت کردووە.

"خوایـە، ئـەم هـەراو زەنایـە بـەخێر بگـەڕێ و توشـی چەرمەسـەریەکم نەکات".

دەمویـست تکا لـەمام ڕەجـەب بکەم شـتەکە هێنـدە گـەورە نـەکات بـەڵام چۆن؟ بە چ زمانێ؟ نەمدەزانی. دەترسام کارەکە گەنترو پەندتر بێ.

قازانە پلاوی گەورەیان لە سەر ئاگر نابوو، شـەك و بـەرانی قەڵـەویان لـە شیش دابوو، دووکـەڵی برژانـدنی گۆشـت و کـەباب ئـەو ناوەی داگیرکرد بوو.

میوانەکان لەچوار پێنج ژووردا سـەرگەرمی شـیرینی خواردن و کـەیف و خۆشـی بـوون، لـەژوورێکی گـەورەدا وەسـتای دەلاك خـەریکی ئامـادە کردنی کەرەسەی کاری خۆی بوو.

مام ڕەجەب بە پەلەو بەهەڵەدەوان خۆی کرد بەژووردا و وتی:

– پیاوێ لەئستەمبوڵەوە هاتووە کاری بەتۆ هەیە.

وەکـو کەسـێ بەئاسـنێکی سـورەوەکراو گیـانی داخ بکـەن سـەرتا پـێم سوتا هیچی نەمابوو هەر لەوێدا بکەوم.

"کێ بێ لەئەستەمبوڵەوە بە دوای منـدا هاتبـێ؟ ناشـێ بەڵایـەکی تـازەم بەسەر بێت؟"

مام ڕەجـەبی دامـاو وایـدەزانی مـن لەترسـی خەتەنـە کردنەکەیـە وا تێك چووم گەلێ بەزەیی هاتەوە پێمدا:

– وەك بڵێی لەخەتەنە دەترسیت!

– نا، هیچ نییە ناترسم!

وتی:

–ئەو پیاوە بێت بۆلات؟

هێندە تۆقیبووم نەمتوانی وەلام بدەمەوە بە مەبەستی ئەرێ سەرێك بۆ لەقاند.

مام ڕەجەب رۆشت و من سەیرێکی پەنجەرەکەم کرد دەمویست ڕاکەم، بەلام لەکوێوەو چۆن؟ کار لەکار ترازا بوو هیچ چارەیەك نەبوو.

نیوە گیان بووم تاکو ئەو کەسە هاتە ژوورەوە، جوامێرێکی شیکپۆش بوو، کەمێ هێور بوومەوە. بەلام هیچم نەوت و دانم بەخۆمدا گرت تا بزانم کاری بە من چییە؟

کابرا بزەیەکی کرد وتی:

– من پەیامنێری گۆڤاری "عصر"م.

"ئەگەر بیوتبا من ئیزرائیلم هێندە نەدەپەشۆکام، ئەمە هەمان ئەو بەلایە بوو کە من هەمیشە لێی هەلدەهاتم."

"خودایە بەگەورەیی خۆت لەدەست ئەم پەیامنێرانە ڕزگارمکە."

خۆمم لە گێلیدا، ئەویش بەئاماژەی دەست مەبەستەکەی خۆی تێگەیاندم.

– من، هاتووم، لەموسلمان بوون و خەتەنە کردنی تۆ وێنەو هەول ساز بکەم.

وەك بیانیەکان وەلامم دایەوە:

– من، باش، تورکی، نازانێ.

سوپاس بۆ خوا کاکی هەوالساز بێجگە لەزمانی دایك هیچ زمانێکی دیکەی نەدەزانی بەلاسایی کردنەوەی منیش وتی:

–تۆ، چ داهێنان و کەشف، گەورە. کرد؟

گەلێ حەزم دەکرد بەلەهجەی خۆمان توانیبام وەلامێکی ڕاست و

دروست بخەمە قولی مستی!!

"کەشفی ئەوەم کردووە ئەوانەی لەزکماکەوە موسڵمان بوون کەس بایەخیان بۆ دانانێ، کەچی بۆ موسڵمان بوونێکی درۆینەی تاقە کەسێ هەزاران کەری وەك تۆ پارەو کاتی خۆیان بەهەدەر دەدەن."

بەڵام، بەهەر کولەمەرگیەك بوو جڵەوی خۆمم گرتو وتم:

– من زۆر کەشف، ماتۆری تەیارەی بێدەنگ، کەشتی بێ دوکەڵکێش، ئۆتۆمبێلیی بێ تایە!

پەیامنێر هەر چاوێکی بوو بوون بەچوار، پەیتا پەیتا سەری دەلەقاند،وشەی ئەڵلا، ئەڵلا، ئافەرینو دەسخۆش لەدەمی بەردەبونەوە.

لەو کاتەدا دوو کەس هاتنە ژوورەوە بە ئاماژەی دەست تێیان گەیاندم بچم بۆ مەراسیمی خەتەن کردنەکە.

بەچوستو چالاکی بەرەو ژوورە تایبەتەکە رۆشتم، لەخەیاڵی ئەوەدا بووم چۆن لەگەڵ کاکی دەلاك سەری قسە دامەزرێنمو بە بەرتیلێك سەرو بنی مەسەلەکە دیزە بەدەرخۆنە بکەم.

کاتێ چوومە ژوورە تایبەتەکەوە دووکەڵ لەتەوقی سەرمەوە دەرچوو، بێجگە لە کاکی دەلاك هەشت کەسی مل هورو سمێڵ بابڕ لەوێ دانیشتبوون.

لە کاکی دەلاکم پرسی:

– ئەمانە، لێرە، بۆچی؟

– دەبێ ئەمانە لێرە بن بۆ ئەوەی دەستو قاچت بگرن.

سەیرێکی دەرگاکەم کردو بە پەلە کەوتمە رێ.

وەستای دەلاك وتی:

– بۆ کوێ؟

بەئاماژە تێمگەیاند لەدەرەوە کارێکم هەیە.

دیار بوو وەستا دوان سیانێکی لیّ تێگەیاندبووم، وەك پاڵەوان ئامبازم بوون، توند دەستیان گرتمو ڕایانگرتم، وێنەگریش لێکدا لێکدا خەریکی گرتنی وێنە بوو، منیش خۆم جیڕ کردبویەوە بۆ دەرباز بوون، بەلاّم کوڕەکان وەك ئەوەی مەڕ کەوڵ بکەن هەڵیان بڕیم، لە سەرو سەکوتیاندا دیار بوو هەر لەناوەڕاستی ئەو ژوورەدا خەتەنەم دەکەن.

دەستم کرد بەهاوار هاوار..

خەسووم بە شپرزەیی خۆی کرد بەژووردا وتی:

– مەترسە، هیچ نییە، وەستا زۆر دەستی سوکە هەر ئێستا تەواوت دەکات؟

کوڕەکان بەکێشمە کێش بردمیانە لای تەختێك لەسوچێکی ژوورەکەدا بوو منیش بەحەواوە پەلەقاژەم بوو وەستایش دڵخۆشی دەدامەوە.

تا ئێستا من چل پەنجا کەسی نۆ موسڵمانم خەتەنە کردووە نایەڵم هەر بەخۆشت بزانی.

من بەدەست کوڕەکانەوە هێندەم پەلەقاژێم کرد لەهۆش خۆم چووم و تەخت لێی کەوتمو بەدەستیانە شل بووم، لەو بیّ هۆشیو بورانەوەیەدا ژاوە ژاوێکم بەرگوێ کەوت، چەن کەسێ هاواریان کرد "سبحان الله، جل الخالق".

هەموو بەرەو دەرەوە هێرشیان دەبرد، واق بووم نەمدەزانی چ باسە، هەموو حەواسی خۆمم خستە گەڕ تا بزانم چی بووە.

لەودیو دەرگاکەوە کاکی دەلاك مەسەلەکەی دەگێڕایەوە:

– ئەم کابرایە لەزکماکەوە خەتەنە کراوە!

خەزورم بەخۆشحاڵیەوە هاواری کرد:

– خوایە زۆر شوکر بۆ تۆ.

یەکێکی دیکە هاواری کرد:

– چۆن شتی وا دەبێ!؟

– بەڵێ.

زۆر دڵخۆش بوو کارەسات بەو ئاسانیە تەواو بوو، خەمم نەما، بسکەی سمێڵم دەهات.

بەڵام مەگەر خەڵکی فزوول "لاپرس" لێدە گەڕێن ئاوی زوڵاڵ لەگەروی بنیادەم ڕەت ببێ؟ یەکێ قیت بۆوە وتی:

– ڕەنگە ئەمە جولەکە بێ!

ئەم قسەیە وەکو تۆپ لەمێشکمدا ناڵەی کرد، بەتایبەت چەن کەسێکی دیکە بۆیان سەندەوە.

– بەڵێ، ڕەنگە جولەکە بێ!

– دەبێ حەواسمان کۆ بکەینەوە.

دیسان خوا لەمردوی کابرای دەلاك خۆش بێ وەلامیدانەوە:

– من ئێستا هەموو شتێ ڕوون دەکەمەوە.

زانیم دووبارە دەیانەوێ شاڵاو بێننەوە، بەر لەوەی خۆیان بکەن بەژووردا خۆم کرد بەخەوتوو.

ئەمجارە وەستا باشی، خۆی بەتەنیا هاتە ژوورەوە، زانیم لەوە زیاتر ناکرێ خۆم دوا بخەم، بەزمانی خۆمان و بەهێمنی وتم:

– تکا دەکەم دەرگاکە جوان قایم بکە با دەنگمان دەرنەچێتە دەرەوە.

وەستا، گێژو کاس بوو، هەقی خۆی بوو، کەسێکی تا ئێستا ئەڵمانی و زمانی تورکی نەدەزانی، دەهری بوو بوو، دەیوست لەژوورەکە هەڵێت، بانگم لێ کرد:

– بابە، مەترسە خۆ من پیاو خۆر نیم، وەرە پێشەوە کارم پێتە.

بەپەلە ئەو پەنجا لیرەیەی بۆم هەڵگرتبوو لە گیرفانم دەرکردو بۆم ڕاگرت.

– وەرە ئەم پارەیەم لێ بگرەو بە پەڕۆیەکیش بۆم ببەستە.

وەستا بزەیەکی کرد:

– ئەی، زۆڵ، فێڵی خۆتت چاك زانی.

پارەکەی خستە گیرفانی:

دەبێ کەمێ هاوارو قیژە بکەی بۆ ئەوەی ئەوان وا تێبگەن خەتەنەت دەکەم.

قریشکەیەکی بچوکم کرد.

– نەبوو توندتر.

بەهەموو هێزی خۆم قیڕاندم:

– ئاخ... باوکە ڕۆ مردم!

لەسەر جێگەکەم تەخت بووم، وەستا دەرگای کردەوە:

– تەواو بوو بەخێرێ.

– وێنەگران و پەیامنێرەکان شالاویان هێنایە ژوورەوە فلاشی کامێرەکانیان بەژوور سەرمەوە ڕوناك بوونەوە، پرسیاری سەیرو سەمەرەیان لێ دەکردم، خۆم کرد بەبێ هۆش و نەسڵەن هیچ وەلامێکم نەدانەوە.

بەم حاڵەشەوە ئەو هەواڵە وەکو تۆپ لەشاردا تەقییەوە، لەوەناچێ هەرگیز هێندەی ئەو ڕۆژە ڕۆژنامەکان تیراژی فرۆشتنیان بەرز بوبێتەوە.

وێنەکانی منیان لەپەڕەی یەکەمدا چاپکردو مانشێتی سەیرو سەمەرەیان بۆ نوسی بوو.

"جوامێرێکی ئەڵمانی موسڵمان بوو."

"ئاهەنگی خەتەنە سورانی پرۆفیسۆری ناوداری ئەڵمانی بەخۆشی و شادی بەڕێوە چوو."

"ئاهەنگێکی مەزن لە جیهانی ئیسلامدا ڕویدا."

بەمشێوەیە کوێرەوەرییەکی گەورە بۆمن لەگەشە کردندا بوو، منیش هەزار کەڕەت چاوەڕوانی ئەو نەگبەتیە بووم.

هێشتا دنیا تاریکی نەکردبوو، نەگبەتیەکە دەستی پێکرد، سێ چوار پۆلیس خۆیان بەژووردا کردو بەدوای مندا دەگەڕان "هەرکە خۆیان بەژووردا کرد پێکەنینێکی لاقرتیانەیان کرد."

– هەستە سەر پێ!

– خێرا، خۆت بگۆڕە!

کەلەپچەیان کردە دەستم بەدیار چاوی واق وڕماوی خەزورو ئاسیاو هاوسێکانەوە لەو ماڵە بردیانمە دەرەوە.

ئاسیا پاڵی دابوو بەدیوارەکەوە بەئەستەم دەگریا، خەزوریشم وەکو کارەبا گرتبێتی لەجێی خۆی وشك بووبوو، هاوسێکان مقۆ مقۆیان بوو:

– تۆ بڵێی سیخوڕ بوبێ؟

– من لەیەکەم ڕۆژەوە دەمزانی!

– ئەم گەماڵ باوکانە ئیشی خۆیان چۆن دەکەن؟

– بە درۆ خۆی کردووە بە ئەڵمانی.

– بەڵێ، حەتمەن ئینگلیزە.

ڕاستەخۆ بردیانم بۆ بنکەی پۆلیس، لەبەر درەنگی کات بەبێ لێپرسینەوە لە ژوورێکی تەڕو تاریك فڕێیاندام.

بۆ سبەی بەیانی بۆ لێ پێچینەوە هەراو زەنایەکی فرە ساز بوو، دووبارە وێنەگران و پەیامنێران باسێکی گەرم و گوڕیان چنگ کەوتبوو، وێنەگرتن دەستی پێکردو من هەرچی دەکۆشام دەم و چاوی خۆم بشارمەوە پۆلیسەکان چەناگەیان دەگرتم و بەزۆر سەریان هەڵدەبڕیم.

سەرۆك لێی پرسیم:

– سەگی کوڕی سەگ... ئەم ساختەچێتیانە چێن دەیانکەی؟

- بەخوا من خەتایەکم نییە.

سەرۆك، جوتێ شازللەی ئاراستە کردم چاوم بروسکەی کرد.

- ئەی کێ خەتا بارە؟ سەگبابی فێڵباز بۆچی خۆتت بەئەڵمانی بەو خەڵکە ناساندوە، بۆ؟ ها؟

- جەناب، مەگەر بوونە ئەڵمانی لەیاسادا تاوانە؟

سەرۆك شتەکەی لەکورتی بڕییەوە، ئاماژەی بۆ دووان کرد کە لەسەروی ژوورەکەوە دانیشتبوون:

- بەڕێزان، تاوانبار لەخزمەتی ئێوەدایە!

دوایی زانیم ئەو دوانە پۆلیسی نەهێشتنی تاوانن و لەئەستەمبوڵەوە هاتوون، ئەوانیش دەستیان کرد بەلێپرسینەوە:

- باشترە، ڕاست برۆی مەبەستت لەم کارە چی بووە؟

منیش هەموو باسەکەم هەر لەسیر هەتا پیواز بۆ گێڕانەوە.

هەموو دایانە قاقای پێکەنین، دیاربوو باوەڕیان بەقسەکانم نەکردبوو.

- بەو ئاسانییە خۆتت کردە ئەڵمانی تاکو ژەمە نانێك ورگی خۆت تێر بکەی؟

- باوەڕ بکەن هیچ مەرامێکم نەبووە... خەریك بوو لەبرساندا دەمردم.

- کوڕی باش، لەم وڵاتەدا کێت دیتوە لەبرساندا بمرێ تا دووەم بیت؟

نەمدەزانی بڵێم چی، مەسەلەکەیان گەیاندبویە جێیەك هەر قسەیەکم کردبا لانیکەم دە ساڵ حوکمیان دەدا بە کۆڵمدا، ناچار بێدەنگ بووم.

یەکێ لە مەئمورەکان فەرمانیدا خەزورم و ئاسیا بۆ ڕو بەڕو کردنەوە بێننە ژوورەوە. دەستم کرد بەپاڕانەوە:

- جەناب، لەسێدارەم بدەن، زیندانیم بکەن، بەڵام شەرمەزارم مەکەن.

ڕاستیەکەشی هەر وابوو، چونکە لەڕووم هەڵنەدەهات سەیری مام ڕەجەب بکەم کە بەوپەڕی دڵسافی خۆیەوە بردبومیەماڵەکەی خۆی و

خزمەتی کردبووم، بەڵام چاریش نەبوو.

خەزورم وەختێ هاتە ژوورەوە، راستەخۆ بەرەو من هات و لەبەر دەمما ڕاوەستا بەرِق و قینێکی خەستەوە سەیرێکی بەژن و باڵای کردم:

– تففف، لەچارەت، حەرامزادەی نمەك حەرام، بێ شەرەف... بێ ئابڕو؟

ئەگەر مەئمورەکان بیان هێشتبا هەر لەوێدا دەیخنکاندم.

پۆلیسەکە لێی پرسی:

– تۆ سکاڵات لەسەر ئەم کابرایە هەیە؟

– بەڵێ، خوا کوێری کات وا ئابڕوی بردم شەرافەتی لەکەدار کردم، سێ هەزار لیرەم بۆ خەرج کردووە، دەبێ قەرەبوی هەموو زیانەکانم بۆ بکاتەوە.

پاشان ئاسیایان هێنا.

ئەو کچە قوڕ بەسەرە هێندە گریا بوو چاوەکانی بوو بوونە گۆمی خوێن.

پۆلیس لێی پرسی:

– کچەکەم تۆیش سکاڵات لەسەر ئەم فێڵبازە هەیە؟

– نا.

مام ڕەجەب، بە واق بونێکەوە لەکچەکەی ڕوانی:

– تۆ سکاڵات نییە؟

– نەخێر، چی کردووە تا سکاڵام لەدژی هەبێ؟

– لەمە زیاتر چی بکات، کڵاوی لەسەری هەموومان کردووە.

– ئەو هیچ خەتایەکی نییە.

– دایکت دەیوت گوارەو بازنەکانی تۆیشی دزیون، ویستویێتی فریوت بدا.

- درۆیە، ئەو هیچ شتێکی بەمن نەوتوە، ئێوە دەتانویست من بەو بدەن بە شوو.

لە وەفاداری ئەو کچە سەر سام بووم، بوغزی گریان گەروی گرتبووم، بۆ ئەوەی فرمێسکەکانم نەبینیّ ڕووم کردە لای دیوارەکە.

مام ڕەجەب بەزۆر قسەی بەکچەکە بڕیی:

- ئەم تیّ ناگات، منالەو هەڵخەڵەتاوە.

پاشان ئاسیایان لە ژوورەکە بردە دەرەوە، لە درزی دەرگاکەوە هەراو زەنایەکی سەیر دەبیسرا، ئەتوت هەموو خەڵکی شار کۆ بونەتەوە بۆ سکالاّ کردن هاتونەتە پۆلیسخانە.

یەکیّ دەیوت هەزار لیرەی لیّ وەرگرتووم، یەکێکی دیکە دەیوت سەد لیرەی منشی بردووە.

هاوکات من هیچ کامێکیانم نەدەناسی و هەرگیز چاوم بەچاویشیان نەکەوتبوو.

چونکە تاوانەکەم زۆر بوو سیمام گومانـاوی دەردەکەوت، بڕیاردرا لەگەڵ دەستەیەك چەکدار ببرێم بۆ ئەستەمبوڵ.

لە ئەستەمبوڵ بەپەلە دۆسیەکەم ڕێکخراو بەپلیکانەکاندا بردیانم بۆ خوارەوە.

لە زینـدانیش هەر بیرم لای ئەوە بوو، دوای ئازاد بوونم کارێکی ئابڕومەندانە بدۆزمەوە زیاتر ئاگام لەخۆم بێت نەکەومە هیچ داوێکەوە.

ڕۆژێك زیندانیەکی "ناشی"یان هێنایە لامان، حالّی ئەو لەگەڵ زیندانیەکانی زینداندا جیاواز بوو، بەڕوکەش و سیمایدا لەکەسێکی بە ویقار دەچوو کە ئەم لەو کەسانە نییەو ئەمە یەکەمجاری زیندانیّتی، زۆر بەخێرایی بوینە ئاشنای یەکتر ناوی "واسیل" بوو بازرگانی بازاڕ بوو.

بازرگانی ڕۆن و زەیتون و ڕۆنی زەیتونی هەبوو، هەر لەیەکەم ڕۆژەوە

هێنایانە زیندان دەمی کیسەی کردەوە وەکو خۆڵ پارەی خەرج دەکرد.

تیکەی منیش کەوتبویە رۆنەوە خوردو خۆراکم ریكو پێك بوو، نان و خواردنیان لەماڵەوە بۆ دەهێنایین، ئێستەش چێژی ئەو خواردنە بەلەزەتانە لەبێخی ددانم ماونەتەوە.

من هەرچی لێم دەپرسی تاوانەکەی چییە، ئەو هیچی بۆ باس نەدەکردم بەلام من هەر لەسیر هەتا پیوازێ بەسەرهاتی خۆمم بۆ گێڕایەو.

واسیل، ناونیشانی خۆی پێدامو وتی:

- هەر کاتێ ئازاد کرایت وەرە بۆ لام کارم پێتە.

هەرچەن باوەڕ بەو بەڵێنانە ناکرێ کە زیندانیان بەیەکتری دەدەن، بەلام ناچار ناونیشانەکەم لێ وەرگرت دوای سێ مانگ لەزیندام ئازاد کرام راستەخۆ چوومە لای.

واسیل، زۆر بەگەرمی پێشوازی لێ کردم، لەیەکێ لەشەقامە گەورەکانی ئەستەمبوڵدا کۆگایەکی گەورەی هەبوو، لە کۆگاکەیدا تەنەکە رۆن هەتا میچەکە هەڵچنرابوون.

واسیل، سەد لیرەی دامێ و وتی:

-برۆ سێ رۆژیتر بگەڕێوە دەسبەکاربە.

دەمێك بوو توشی بنیادەمی راستو دروست نەبوو بووم، لەم کارەی ئەو سەرم سوڕما بوو، باوەڕم نەبوو ئەو لەکۆگاکەیدا کارێك بەمن بسپێرێت.

بەلام ئەوە راستی بوو، من بەناوی ژمێریار لەکۆگاکەی ئەودا دەسبەکار بووم.

دوو سێ مانگی خایاند، رۆژ بە رۆژ زیاتر لەکارەکەمدا قاڵ دەبووم، بە باشی فێری کارەکان بوو بووم.

چیتر پێویستم بەوە نەبوو واسیل فەرمانم پێ بکات، خۆم ئەرکی خۆمم بەباشی ڕا دەپەڕاند.

گەلێ خۆشحاڵ بووم ژیانم کەوتۆتە سەر سکەیەکی باش، منیش بۆ خۆم دەتوانم وەك هەموو کەس بێ ترس و لەرز تیکە نانێك بخۆم و شەوانەش ئاسودە سەر بکەمە سەر سەرین.

ڕۆژێکیان واسیل، دەعوەتی کردم بۆ ماڵی خۆیان، خواردنێکی خۆشی ساز کردبوو، مریشك، ماسی پلاو، وەختێ نانەکەمان خوارد واسیل وتی:

– لەم ماوەیەدا من تۆم بەهەموو جۆرێ تاقی کردۆتەوە دڵنیام تۆ کەسێکی خاوەن متمانەو باوەڕ پێکراویت.

لەخۆشیدا خەریك بوو شاگەشکە ببم:

"بزانە ئەگەر بنیادەم سەر ڕاست بێ چەن خێرا دەبێتە خاوەنی متمانە، بریا ئەو برادەرەم کە دەیوت لەم وڵاتەدا هیچ کەسێ بەسەر ڕاستی کاری ناچێتە پێش ئێستە لێرە بوایە بیزانیبا واسیل چەن لێم ڕازییە!"

واسیل، لەقسەکانی بەردەوام بوو:

– من دەمەوێ پاداشتی ئەو ڕاستی و دروستیەی تۆ بدەمەوە، کۆگاکەم بدەم بە تۆ.

پێم وابوو ئاغا یان پێم ڕادەبوێرێ یان دیسان تاقیم دەکاتەوە، بەشەرمێکەوە وتم:

– کۆگا پیرۆز بەخۆتان بێ، من هەردەم خزمەتکاری ئێوەم و خۆیشم بەخزمەتکار دەزانم.

واسل، لێم تێگەیشت:

– گاڵتە ناکەم، بەڕاستمە دەمەوێ کۆگاکەم بدەم بە تۆ.

– ئاخر بۆچی؟

– متمانەی تەواوم بەتۆ هەیە منالەکەم زۆر هەلەخەرجن، متمانەم بەزاوکەشم نییە چونکە دەمەوێ ماوەیەك بە سەفەر برۆم، دەمەوێ لەکارو باردا رەها بیت‌و سەربەخۆ بتوانی هەموو کارەکان لەئەستۆ بگریت.

– دیارە من تەنها چاودێریی دەکەم.

زۆر لەسەری رۆشت، من نەمتوانی لە مەبەستەکەی بگەم بزانم ئەم کارە چ سوودێکی بۆ ئەو هەیەو بۆمن چییە، چونکە من وەکو جاران هەر موچەخۆرێك بووم هەموو قازانجێ هەر بۆ گیرفانی ئەو بوو.

واسیل وتی:

– بۆ ئەم کارەش مانگی ٥٠ لیرەت بۆ زیاد دەکەم، تۆش دەبێ لەبەر دەمی خەلکی و روداوی رۆژگار قەوالەیەکی ١٠٠٠٠ لیرەییم بدەیتێ، نەوەك خوا نەخواستە شەیتان فروت بدات.

هەرچی بیرم لێ دەکردەوە ئەم کارە مانای چییە، بۆچی واسیل کۆگاکەی بە من دەدا، سەرم لێ دەر نەدەکرد.

چاك دەمزانی ئەم کاسەیە بێ ژێر کاسە نییە، فێلێك لەگۆڕێیە، بەلام مەسەلە چییە ئەوەم نەدەزانی، خۆ من خاوەنی دەسمایەیەك نیم لە کیسم بچێ، لەرواڵەتیشدا ئەو مامەڵەیە بێ عەیب بوو، بەتایبەت مانگی ٥٠ لیرەی موچەکەشم زیادە وەردەگرت.

"خۆم‌و بەخت" بنیادەم نابێ لەقە لە بەختی خۆی بدا، سبەینێ بەیانی چووینە دادنوس‌و کۆگاکەی بە شەش هەزار لیرە بە من فرۆشت لەهەمبەردا قەوالەیەکی ١٠٠٠٠ لیرەیی لێ وەرگرتم منیش بەڕواڵەت بوومە خاوەنی کۆگا.

دەسبەجێ تابلۆی کۆگاکەم داگرت‌و تابلۆیەکی تازەم بە ناوی

"کۆمپانیای ئیعتیماد... فرۆشگای ڕۆن‌و زەیتون" لە جێگایدا هەڵواسی.
هاوسێکەمان حاجی ساڵح ناوێك بوو ئەویش هەمان بازرگانی هەبوو، ئەو ڕۆژە کاتێ واسیل بۆ نانخواردن ڕۆشتەوە حاجی ساڵح هاتە لام وتی:

– لەبری فرۆشتنی کۆگاکە چەندێك مووچەی بۆ زیاد کردیت؟

– مانگی ٥٠ لیرە.

– پففف، بەخوا کلاوێکی چاکی لەسەرت ناوە، ئەگەر کۆگاکەی منت بویستبایە مانگی بە ٥٠٠ لیرە دەمدایتێ.

وڕو کاس بووم وتم:

– چۆن کلاوی لەسەر ناوم؟

– ئەوی چوو، چوو... ئەگەر کۆگاکەی منیشت دەوێ ئەوا مانگی ٥٠٠ لیرەت پێ دەدەم:

– ئاخر بۆچی ئێوە کۆگاکانی خۆتان بە من دەدەن؟

قاقایەکی درێژی کێشا:

– پیاوێکی دڵساف‌و سادەیت یان پێم ڕادەبوێریی؟

– بۆچی پێت ڕا دەبوێرم؟

– دواتر خۆت تێ دەگەیت.

ئەمەی وت‌و ڕۆشت. دڵم داخورپا، خوایە تۆ بڵێی ئەمجارە چ نەهامەتیەك بەرۆکم پێ بگرێ، بۆ ئەو خەڵکە لێناگەڕێن تاقە ڕۆژێ ئاسودەبم؟ ئاخر من چیم لەو خەڵکە کردووە؟ هەر کەسێکم پێ دەگات دەیەوێ لەچاڵم بنێ.

چەن ڕۆژێ دواتر واسیل پێی وتم:

– سبەی دەبێ لە کەم کردنەوەیەکدا بەشدار بین.

پێشتر ڕیکلامی کەمکردنەوەکانم لە ڕۆژنامەکاندا زۆر دیتبوو بەڵام

گوێم پێ نەدەدان و کارم پێیانەوە نەبوو وتم:

– چ کەمکردنەوەیەك؟

– کەمکردنەوەی ڕۆنی سەربازگەکان.

– جا، ئێمەو ئەم کارە گەورانە؟

واسیل پێکەنی:

– نان لەو کارانەدایە تۆ نازانی!

– من شارەزا نیم، نازانم چی بکەم؟

– پێکەوە دەڕۆین، تۆش وردە وردە شارەزا دەبیت؟

بۆ سبەی چووین بۆ کۆمیسیۆن، بێجگە لە ئێمە چەن کەسێکی دیکە هاتبوون من زۆربەیانم دەناسی.

حاجی ساڵحی هاوسێمان یەکێك بوو لەبەشدار بووان.

لیستی کەمکردنەوەکەیان کردبویە ناو پاکەت و مۆریان کردبوو، بڕی سێ تۆن ڕۆن لەماوەیەکی دیاریکراودا دەبوو تەسلیم بکرێت، هەرکەسێ هەرزانتر بیفرۆشتبایە ئەو دەیبردەوە.

ئەو ڕۆژە کیلۆیەك ڕۆنمان بە ١٢٠ قرۆش دەکڕی و کیلۆیمان بە ١٥٠-١٦٠ قرۆش دەفرۆشتەوە.

بیرم کردەوە ئەگەر ١٣٠ قرۆش بنوسم لەهەر مامەڵەیەکدا ١٥٠٠٠٠ لیرە قازانج دەکەین و منیش یەکەم پایەی ملیۆنەر بوونم دادەڕیژم، بزانە چارەنوس چۆنە، ڕاستیان وتووە: "ئەوی بەشوێن هەر شتێکدا بگەڕێ هەمان ئەو شتە دەدۆزێتەوە."

من هەر لە ڕۆژی بەرێوە لەخەیاڵی ئەوەدا بووم ڕۆژێك بێت و ببمە ملیۆنێر.

ئێستا دوای ئەم هەموو کوێرەوەرییە خەریکە شانسم خەبەری دەبێتەوە.

واسیل لەتەنیشتمەوە دانیشتبوو وتی:

– دەتەوێ چەن بنوسیت؟

– کیلۆی ١٣٠ قرۆش.

– مەگەر خوا شێتی کردوی؟

وامزانی کەمم وتووە:

– ١٤٠ قرۆش چۆنە؟

واسیل پێکەنینێکی لاقرتیانەی بەجۆرێ کرد هەموو ئەوانەی لەدەوربەرمان بوون زانیان من زۆر شەرمەزار بووم.

– ئەگەر ئێمە نرخێکی زیاتر بنوسین ئەوان دەیبەنەوە.

سەرێکی لێ هێنامە پێشەوە بەئەستەم وتی:

– ٨٠ قرۆش بنوسە.

وامزانی دەڵێ، ١٨٠ قرۆش بنوسە:

چاوی لێ دەرپەڕاندم:

– ١٨٠ ی چی ٨٠ بنوسە.

ئێستە نۆبەی من بوو پێم سەیر بێ.

– چۆن شتی وا دەبێت، ئێمە خۆمان بە ١٢٠ قرۆش دەیکڕین؟

– تۆ بینوسەو کارت نەبێ!

وەك ئەوەی من خاوەن ماڵ بم قەڵەمم لەسەر کاغەز هەڵگرت:

– زۆر زەرەر دەکەین.

– تۆ بینوسەو کارت نەبێ!

– پەیوەندی بە منەوە نییە؟

مشتو مڕەکەمان لە سنور دەچوو، واسیل وتی:

– تۆ بەڵێندەریت دەبێ بینوسیت؟

بەدەنگی بەرز وتم:

- ئاخر بنیادەمی ئاقڵ چۆن بەدەستی خۆی ماڵێ خۆی وێران دەکا؟
- ئەرێ بابە من زەرەر دەکەم بەتۆ چی؟

ئەم قسەیەی ماقوڵ بوو، هەرچەن دڵم بەرایی نەدەهات نرخەکەم کیلۆی ٨٠ قرۆش نوسی و کردمە پاکەتەکەوە.

وەختێ پاکەتەکان کرانەوە من براوەی یەکەم بووم.

برێك پارەماندا بەسنوق و پسوڵەمان وەرگرت.

خەڵکەکە پیرۆزباییان لە واسیل کرد:

- بەخوا منیش کەڵە پیاوێکی وەکو فەریدم هەبوایە لەجیاتی ٨٠ قرۆش ٤٠ قرۆشم دەنوسی.

من، سەرم هیچ لەم قسانە دەرنەدەچوو.

لە کۆمیسیۆن کە هاتینە دەرەوە لە واسیلم پرسی:

- توخوا پێم بڵێ چۆن دەکرێ بنیادەم شتێك بە ١٢٠ قرۆش بکڕێ و بیفرۆشێتەوە بە ٨٠ قرۆش؟

- ئەمە بەقسە نابێ، دوایی بۆ خۆت تێ دەگەی.

- بابە خۆ ئەمە مەسەلەی ئەتۆم نییە، ئەم مامەڵەیە ٤٠ قرۆشی زەرەرە.

- کورە، زەرەر ناکات، تەنها قازانجی کەمە.

ئێمە دەستمان کرد بەهەناردە کردنی رۆن، بەڵام هەر کیلۆیەك برێکی زۆر زەرەری دەکرد.

هەرچی بیرم لێ دەکردەوە سەرم لێی دەرنەدەچوو نەمدەتوانی ئەو مەتەڵە هەڵێنم.

رۆژێ واسیل برێك پەتاتەی کڕی، کە فەردە پەتاتەکانمان دەبردە کۆگاکەوە وتم:

- ئەمانەت بۆچین؟

پێکەنی وتی:

– دەمەوێ بازرگانی پەتاتەش بکەم.

بۆ سبەی شەو بەلۆری پەتاتەیان هێنا بۆ کۆگاکە.

ئەتوت ئەو پەتاتانە لەسەر سەری من کۆ دەکەنەوە، مێشکم خەریك بوو دەتەقی لە دڵی خۆمدا وتم:

– ئاخر ئەم هەموو پەتاتەیە لەکوێ هەڵدەگرن!؟

هەرچەن چونە ژوورەوەی من بۆ ئەوێ یاساغ بوو، رۆژێ بەسەرە رۆیی خۆم پیا کردو هەموو شتێکم بۆ دەرکەوت.

کورەکەی واسیل، پەتاتەکانی دەکردە قازانی گەورە گەورەو دەیکردنە هەویرو لەگەڵ هەندێ شتی دیکەدا ئاوێتەی رۆنەکەیان دەکرد.

هێندە شعورم هەبوو بزانم ئەم کارە تاوانەو بێتو بزانن گۆری باوو باپیرمان هەڵدەتەکێنن.

وتم:

– براکەم، من شتی وام پێ پەسەند نییە، ئەگەر بمویستبا ئەو کەڵەکبازییە بکەم ئێستە لێرە نەدەبووم.

واسیل، لەپێشا کەمێ پەشۆکاو پاشان زۆر ئاسایی وەڵامیدایەوە:

– فێڵی ئەم کارە لە کوێدایە؟

– بۆچی، فێڵ کردن کلكو شاخو باڵی هەیە، پەتاتە لەجیاتی رۆن فرۆشتن فێڵ نییە؟

– نا... پەتاتە زیانێکی بۆ لەشی مرۆڤ نییە زۆریش بە سوودە.

کورەکەی واسیل دەستی کرد بەتاریف کردنی سوودەکانی پەتاتە..

ئەمە خۆراکێکی چاکەو دەوڵەمەندە بە نیشاستە، کلوگۆز، برێکی چاك رۆنی... واسیل قسەکانی لەدەمی قۆستەوە وتی:

– ئەوە گرنگ نییە ئەڵمانیەکان لە خەڵوز گۆشت دروست دەکەن،

لەئێسقان شەکر دروست دەکەن، لەتەختەش ئارد؟

ئەتوت کوڕو باوك بۆ قایل کردنم پێشبڕکێیانە کوڕەکە قسەکەی لەدەمی باوکی وەرگرتەوە:

– ئێستا زانستی کیمیا گەشتۆتە ئەو ئاستە، ئیدی ئێمە بۆچی لێی سوودمەند نەبین؟

قسەکانیان لەڕوی زانستییەوە حاشا هەڵنەگر بوو منیش وردە وردە خەریك بوو تەسلیم دەبووم.

واسیل، کە زانی وا من نەرم بووم کەمێکیش قەرزاری کردم:

– ئێمە پیاوێکی خاوەن شەرەفین! شتی خراپ ڕەوای خەڵکی نابینین...ئەگەر ئەوانیتر ئەم کەمکردنەوەیان ببردبایەتەوە، مەگەر خوا بۆخۆی بزانێ چ شتێکیان دەرخواردی سەربازەکان دەدا، ئێمە پیاوچاکین ترسی خوامان لە دڵدایەو گوناح ناکەین.

وتم:

– بۆ نمونە چ شتێکی دیکە تێکەڵ بە ڕۆن دەکرێ؟

سەرێکی لەقاندو دەنگێکی تایبەت لە دەمیەوە هاتە دەر:

– پێخ... نازانی ئەو خەڵکە لە گڵە سپی و وازلین چ ڕۆنێك دروست دەکەن، حاجی سالح سەردەمێك ڕۆنێکی وەهای دروست کردبوو هەرکەس لێی بخواردبایە لەپیاوەتی دەکەوت، هەموو دکتۆرە گەورەکانی دنیا دەسەو دامێنی بوون تاکو پێکهاتەی ئەو دەرمانەیان پێ بدات بەڵام بەسەزمانە خۆیشی نەیدەزانی چ شتێکی تێکەڵ بەو ڕۆنە کردووە، ئەگەر بیری نەچوبایەتەوە حەو زەمان بوو، بوو بووە ملیۆنێر.

کوڕەکەی واسیل بەخۆ هەڵکێشانێکەوە وتی:

– بەڵام کاری ئێمە وردەکارییەو هەموو ئەو ماددانەی ئاوێتەی دەکەین دیارە.

واسیل قسەکەی بۆ سەندەوە:

– ئێمە کەسانێکی بە شەرەفین، گەر باوەڕیش ناکەی برۆ لەبازاڕ بپرسە، بزانە کەسایەتی و مەزەندەی ئێمە لای خەڵکی چۆنە؟ قەرزاری لیرەیەکی هیچ کەسێك نین، سیی ساڵە لەو بازاڕەدام تا ئێستا تاقە جارێکیش سزایەك نەدراوم.

وتم:

– ئەمانە هەموو ڕاستن، بەڵام...

– بەڵام چی...؟

– کڕیار دەزانێ ئێوە پەتاتە لەگەڵ ڕۆن ئاوێتە دەکەن؟

واسیل و کوڕەکەی بە دەنگی بەرز پێکەنین!

– من نەمدەزانی تۆ هێندە ساویلکەیت، چۆن نازانێ، مەگەر شێت بێ ئەو کەسەی نەزانێ ڕۆنی ئێمە پاڵفتە نییە...

– چۆن دەزانێ؟

– ئاخر... عەزیزی من! ئەوان خۆیان ڕۆن دەکڕن دەشزانن ڕۆنی پاڵفتە کیلۆی بە ۲ لیرەش نادەن. کەوایە بۆچی! بە ۸۰ قرۆشی دەفرۆشین، بۆ نمونە ئاردو پەتاتەو شتی دیکەی تێکەڵ دەکەین، کەواتە ماڵمان ئاوا بێت کە ڕۆن گریسی تێکەڵ ناکەین.

زانیم قسەکەی تەواوە بۆیە زەرە ناکات، وتم:

– ئەی باشە ئێمە بۆچی ئەو نرخەمان نوسی؟

– تۆ، هەقی ئەم کارانەت نەبێ، لە بەیانیەوە بێجگە لەهەقی خۆت بەشێك لەقازانجی ڕۆنەکەش وەربگرە..

بێجگە لە بێدەنگی هیچ چارەیەکم نەبوو، بەڵام دڵیشم رازی نەدەبوو دەسبەرداری ئەم کارە بم، دەمزانی ئەگەر زۆر لەسەری برۆم نەك هەر سوودێکی نییە بەڵکە هەزار تەشقەڵەی لێ دەکەوێتەوە یەکەمیان بێکار

بوونی خۆم دەبێت.

دوای ئەو رۆژە، واسیل هەموو رۆژێ لیستی حسابەکەی بۆ دەهێنام، ئەو برە رۆنەی هەفتەی یەکەم هەناردەمان کردبوو رۆنی پاڵفتە بوون و ٥٠٠ لیرەشمان لێی زەرەر کردبوو، هەروا هەفتە لەدوای هەفتە بڕی پەتاتەکە زێدەتر دەبوو وای دەکرد زەرەرەکە پڕ بکاتەوە.

- دەبینی، ئێمە بەبێ پرسی تۆ هیچ کارێ ناکەین، وەرە ئەم لیستان واژۆ بکە.

کەمێ دردۆنگ بووم، نەمدەویست واژۆیان بکەم. واسیل پێکەنی:

- ئێمە متمانەمان بە تۆ کردو کۆگایەکمان بەم گەورەییە خستە بەردەستی تۆو تۆیش متمانەمان پێ بکەو فەرموو واژۆیان بکە.

خۆزگە دەستم بشکایەو ئەو واژۆ خاوەن تۆپیوانەم لەو لیستانە نەدابایە.

واسیل لە واژۆ کردنەکانم زۆر خۆشحاڵ بوو.

*********

فەرید، هێندەی قسە کردبوو کەفی ئەچەراند، دەمێك بوو بێ پسانەوە قسەی بۆ دەکردم:

جگەرەیەکی پێ کردو چاوی لەچاوم بڕیی..

–ڕەنگە باوەڕیش نەکەی تا ئێستا هەرچیم وتوە هیچ پێچ و پەنایەکی تیدا نەبوو، ڕەنگە وابزانی من لەناخەوە ئەو پیاوە بێخەوشە نەبوو بم کە بانگەشەی بۆ دەکەم، حەزم لەم مامەڵەیەی واسیل بوبێ، نا بەخوا ئەم کارەم پێ پەسەند نەبوو حەزیشم لێ نەدەکرد، بەڵام قسەکانی واسیل جۆرێ بوون هەرکەس فریوی دەخواردو باوەڕی دەکرد، هاوشێوەکانی واسیل کاری خۆیان باش دەزانن، بێت و یەکێ پێیان بڵێ بێشەرەف ورگی دەدڕن.

ئەوانە کەسانێکی بەشەرەفن، لەبازاڕو لای هەموو کەس خاوەن ئابڕوون، خاوەنی کەسایەتین، کەسانیتریش هەرچەن باش دەیانناسن بەڵام هەر ڕێزیان لێ دەگرن، ئەوان سەریان بڕوات نوێژیان ناڕوات.

وردە وردە کار لە پەتاتە ترازا، پیوو دوگیشی بۆ زیاد بوو، ئەو ڕۆنەی هەناردە دەکرا لە سەدا هەشتای تێکەڵەی دیکە بوو تیا مابووم، ڕێی ڕزگاربوونم نەبوو، چوومە لای کوڕەکەی حاجی ساڵح و بەدزییەوە مەسەلەکەم پێ وت... دەمویست پەی بە شتێك ببەم و ڕێگەچارەیەك بدۆزمەوە.

کوڕەکەی حاجی ساڵحیش پێم پێکەنی:

– خودا ئاقیبەتی بەخێر بگێڕێت!

- بۆ نمونە چی دەبێ؟
- هیچ.
- توخوا بەڕاست، ئەوەك كار گەنترو پەنتر بێ؟
- ئادەی بزانم چەندێك هەق وەردەگریت؟
- تا ئێستا دەرامەتێکم نەبووە بەڵام لەمەولا...

قاقایەکی درێژی کێشا:

- ئیشەڵڵا ئاقیبەتی باش دەبێ، بەڵام هێندەش ساویلکە مەبە.

زۆر ترسم لەقسەکانی کوڕەکەی حاجی ساڵح هەبوو، ئەو بەجۆرێ قسەی دەکرد مانایەکی زۆریان دەبەخشی.

بڕیارمدا لەگەڵ واسیل یەکلایی بکەمەوە، هەرچی بێت بێ کاریی زۆر باشترە لەم دزیو کەڵەکبازییە.

وەلێ، دەرفەتی ئەوەشم نەبوو، کاتێ باسی مەسەلەکەم بۆ کوڕەکەی حاجی کردبوو، راپۆرتی بۆ دەسەڵاتدارانی سوپا ناردبوو، بۆ رۆژی دواتر منی کلۆڵ کە بەر پرسی کۆگاو لایەنی مامەڵەکەی سوپا بووم دەسگیر کرامو ڕاستەو رێ بۆ زیندانیان بردم.

دوای ئەوە تەنها جارێك چاوم بە واسیل کەوتەوە ئەویش لەدادگا، چونکە ئەویش قەواڵەکەی منی نیشاندابوو، ناچاریان کردم کۆگاکەی تەسلیم بکەمەوەو قەواڵەکەم وەربگرمەوە.

مەگەر خوا بۆخۆی بزانێ رۆژنامەکان چەندین وێنەو بابەتی سەیرو سەمەرەیان لەسەر بلاو کردمەوە.

ئەفسەری ساختە، موسڵمانی ساختە، بازرگانی ساختە، بەکورتی تۆمەتێ نەبوو نەدرابێتە پاڵ منی کلۆڵ، بەمانەشەوە چۆن دەکرا ئەستۆپاکی خۆم بسەلمێنم!!

بەهەر کەسێکم ئەوت بەخوا من بێ تاوانم پێم پێ دەکەنیی...

"جارێك فریو درای، دووان نەتزانی، سیان تێكەوتی... ئەی ئەوانیتر چی؟"

هەقیقەتیش هەروا بوو، بەڵاو نەهامەتی بەدوای یەكدا دەباریین، فشارو ناڕەحەتی دەرونیم گەیشتبویە ئاستێك دەمارەكانم باش كاریان نەدەكرد.

لەزیندانیەكان خۆمم بەدور دەگرت هەمیشە لەبەر خۆمەوە قسەو وڕێنەم دەكرد.

هەندێجار بەخۆمدا دەهاتمەوە خۆمم جڵەو دەكرد، بەڵام سەر لەنوێ ئەو وڕێنە كردنەم دەستی پێ دەكردەوەو لە تەوەری خۆم دەردەچوومەوە..

تا وام لێ هات تەنانەت شەوانە بەدەم خەوەوە ئەم كارانەم دەكردەوە دەنگی سەیرو سەمەرە لە گەرووم دەهاتە دەرەوە.

سەرەتای زیندانیەكەم زیندانیەكان پێیان ڕادەبواردم‌و پێم پێدەكەنین، بەڵام دوایی كاسەی سەبریان سەر ڕێژی كرد، لای سەرۆكی زیندان سكاڵایان لەسەر تۆمار كردم.

هەموو شەوێ دەیانبردمە ژوورێكەوە لەهیچ قاوشێكدا شەوێك نەمدەتوانی بمێنمەوە.

سەرەنجام بردیانم بۆ ئاسایشگە.

ڕاستە من مێشكم تێكچوو بوو، بەڵام هێشتا هێندە ئاوەزم هەبوو بتوانم هەندێ شت لێك جیا بكەمەوە.. بۆیە لەو ژیانە نوێیەم زۆر ناقایل نەبووم، لەشێتخانە ئازادییەكی زێدەترم هەبوو، كۆمەڵێ شتی نەدیتراو دەهاتنە بەر چاوم خۆمیان پێوە خەریك بكەم، لە شێتخانە ئاشنای پیرەمێردێكی شێت بووم، ئەویش بەسەرهاتێكی سەیرو سەمەرەی هەبوو.

ئـەم پیـاوە پێـشتر پـارێزەر دەبێـت ژیـانو گـوزەرانێکی خۆشـی دەبـێ، وەلێ دواتر بەدبەختی یەخەی دەگرێو دووچاری نەخۆشی ڕەخنەگرتن دەبێ، هەموو رۆژێ سێ چوار نامە بۆ پیاوە گەورەکانی وڵات دەنوسـێ گرفتو کێشەی خەڵکی ڕوون دەکاتەوە.

حەو هەشت ساڵێ بەو چەشنە بەڕێ دەکا، سەرەنجام رۆژێ دەیەوێ نامەیـەك بخاتـە سـنوقی پۆسـتخانەوە، دسـگیر دەکـرێو بـە تۆمـەتی سـوکایەتی بـە سـەرانی دەوڵـەت سـەرەتا دەینێرنـە زینـدانو دواتـریش ڕەوانەی شێتخانەی دەکەن!

ئەویش وەکو من بوو هیچ ئەسەرێکی شێتیی پێوە دیار نەبوو..

لێم پرسی:

– بۆ خۆتت توشی ئەم دەردە سەریانە کرد؟

وتی:

– ئێستەش ئازاد بکرێم دووبارە هەر ئەو شتانە دەنوسمەوە.

– ئاخر ئەم کارە چ سوودێکت پێ دەگەیەنێ؟

– لانیکـەم گرێـی دڵـی خـۆم ئەکەمـەوە ... تـۆ نـازانی ئـەم گـەورەو سەردارانە تووشی چ بەڵایەکیان کردم، چەندە مافیان پێ شێل کردووە.

هێنـدەی بـەڵای هـەزار کەسـی بەسـەر هـاتبوو، هێنـدە قـسەی سـەیرو سەمەرەی دەکرد من وردە وردە گومانم لەئاقڵ بوونی پەیدا کردبوو وتم:

– عەباس ئاغا، لەوە دەچێ زۆری پێوە بنێی... خەڵکی هەمووی خراپ نییە.

– بەگیانی تۆ، تووشی هەرکەس دەبووم دەیویست کڵاوم لەسەر بنێ.

– ئـاخر چـۆن، هـەموو ئـەو خەڵکـە بـۆ کردنـی خراپـە لەگـەڵ تـۆ لـە پێشبڕکێدا بوون؟

– ئەرێ، بەگیانـی تـۆ، یـاری تۆپێنـت بینیـوە؟ دیوتـە یاریزانـەکان چۆن

تۆپەکە بۆ یەکتریی دەنێرن تۆپەکە بەر پێی هەر کەس بکەوێ یەکسەر تێی هەڵدەدات؟

گیلە، کەمێ دەنگی خەمبار بوو، وچانێکی گرتو دەستی پێکردەوە:

- لە دنیادا هەندێجار بنیادەم هێندە هەقکوژیی دەبینێ جڵەوی خۆی لەدەست دەدات، وەکو کەسانی مەست هەر کەسێکیان دەست بکەوێ دەیانەوێ سفرەی دڵی خۆیانی بۆ هەڵڕیژن، ئەویش دەچێتە لای هاوڕێیەکی دەردە دڵی خۆی بۆ بکات بەڵام ئەو هاوڕێیەی وادەزانێ ئەم کەسە لارە لارێتیو لەوانەیە بکەوێ بەسەر ئەمداو توشی دەردەسەریی بکات، بۆیە بۆ ڕزگار کردنی خۆی پێ لەقەیەك لەم دەدات بۆ ئەوەی لەخۆی دور بخاتەوە.

کە کەوتیتە بەر پێ لەقەش زیاتر جڵەوی خۆت لەدەست دەدەی، بەم حاڵە خراپەی خۆتەوە دەچیتەی لای کەسێکی دیکەو باسەکەی بۆ دەکەیتو گلەیی لەهاوڕێی یەکەمت دەکەی کەچی دووەم مەحکەمتر تێت هەڵدەدات.

دەچیتە لای کەسی سێیەم کۆمەکێکت بکات، ئەویش دەڵێ لەخۆڕا لێی نەدراوە، دەبێ ئەمە بەشەق لەخۆتی دور خەیتەوە.

حسابی چوارەمو پێنجەمو شەشەمیش دیارە، چونکە تاکو بەسەرهاتی خۆتی بۆ دەگێڕیتەوەو گلەیی لەهاوڕێکانی پێشوو دەکەی لەقەیەکی وات تێدەسرەوێنی سەد مەتر لەولاتر تەوقی سەرت لەزەوی هەڵدەچەقێنێ.

ئەمەش ڕێك ئەو کاتەیە بنیادەم هەموو شتێ دەخاتە ژێر پێی، دۆستایەتی، شەرەف، ویژدان، تەنانەت ئەقڵیشیو ئیتر خۆی شێتو پەتیارە دەکات.

قسەکانی لەمێشکمدا وەك کوتەکێ بوون لەئاسن بدرێن، ئیدی چۆن

بیانەوێ وای لێ دەکەن.

ئەم پارێزەرە بەڕێزە هەرچەند لەڕوکەشدا شێت بوو لەشێتخانە کۆت و بەند کرابوو، چەن قسەی چەورو قەڵەوی دەکرد لەهەر قسەو نمویەکیدا منیش یەکێ لە بەسەرهاتەکانی خۆمم بیر دەکەوتەوە، چەن نمونەی باشی دێنایەوە، قسەش لەوە چاتر نابێ، هەندێ لەمرۆڤەکان وەکو تۆپی یارین، بەر قاچی هەر کەس بکەون... دەستی تەمەننا بۆ هەر کەسێ درێژ بکەن لەجیاتی بەزەیی و شەفەقەت و دڵنەوایی پێ لەقەیان لێ دەدرێت.

من لەم بیرو خەیاڵانەدا بووم عەباس ئاغا بەپشتە دەستی توند کێشای بەسینگمدا.

– ها... لەکوێی. ئەڵێی تلیاکت لێ بڕاوە دەسوڕێیەوە؟

سەرم هەڵبڕی وەڵامم دایەوە:

– دڵم لەلاتە بفەرموو..

– ئەرێ گیانەکەم، بنیادەم دەبێ هەوڵی ئەوە بدا نەکەوێ، پێ لەقە نەخوات، ئەگەر کەوتی چیتر بەتەمای خۆت مەبە وەکو تۆپی یاری پاست پێ دەدەن بەیەکتریی... هەرکەسەو دەوری خۆی دەبینێ بۆ ئەوەی بینەران و هاندەرانی دەورو بەری چەپڵەی بۆ لێدەن شەقێکی توندتر لەتۆپەکە هەڵدەدات..

قسەکانی عەباس ئاغا گەلێ لەدڵ و دەرونمدا جێگەی خۆی کردەوە، منیش وەك تۆپی گۆڵێنم لێ هاتبوو.

منیش کەسێ بوو دەچومە لای هەر کەسێ دەردە دڵی بۆ بکەم پێ لەقەم دەخوارد... یەکەم پێ لەقەم لەقوتابخانەی سەر بازی بەرکەوت، ئەو کاتەی جلی ژەنراڵم لەبەر کرد، دوای ئەوە هاتمە مەیدانی ژیانەوە یاریزانەکان پاسیاندام بۆ یەکتریی.

عەباس ئاغا هەر قسەی بۆ دەکردم من لەجێی خۆم هەستام دەزانی بۆچی؟

بڕیارمدا چیتر نەبمە تۆپی یاریی، یەکڕاست چووم بۆ لای دکتۆری شێتخانەو زۆر بەجدی وتم:

– دکتۆر من چاك بوومەوە!

دکتۆر دەستی کرد بە پشکنینم لەئاکاری تێگەیشتم سەری لەبەر دەرناکا، منیش راستیم پێ وت:

– ڕاستیەکەی ئەمە من لەسەرەتاوە شێت نەبووم خۆمم کردبوو بەشێت. دکتۆر پێکەنی:

– ئەمەش جۆرە شێتیەکە..

دوکتۆر سەر لەنوێ لەشێتخانە هێشتمیەوە... ئەمجارە نامەیەکی سکالاّم بۆ سەرۆکی شێتخانە نوسی کە هیچ پارێزەرێك نەیدەتوانی بینوسیت، ئەویش لەبری ئەوەی هاوکاریم بکا فەرمانیدا پەرستارەکان زیاتر چاودێریم بکەن.

ئەمجارە نامەیەکم بۆ سەرۆکی دادگا نوسی و ناردم، سەرەنجام هێندە بەدواداچونم بۆ مەسەلەکە کرد تاکو فەرمانی ئازاد کردنم دەرچوو بەلاّم نەك ئازادییەك بێمە سەر شەقامەکان بەڵکو لەوێوە راستەخۆ بۆ زیندان.

من کە دەمویست چیتر نەبمە تۆپی گوڵێن ئیدی یەکەم شەقم لەدکتۆری شێتخانەوە بەرکەوت، دکتۆر بەبێ هیچ پاساوێك تەنها لە سەگبابی خۆیەوە راپۆرتێکی لەسەر نوسی بووم ڕاشکاوانە وتبوی ئەو کابرایە شێت نییەو بەدرۆوە خۆی شێت کردووە، لەبەر ئەوەی ئەم کارەش جۆرێکە لەفێڵبازی سەر لەنوێ دۆسییەکیان بۆ پێك هێناو دووساڵی دیکەشیان لەحوکم دا بەکۆڵمدا.

هەردووکمان گەلیّ ماندوو بوو بووین، گێلە بەحاڵ قسەی دەکرد، هەرچەن حەزم دەکرد پاشماوەی بەسەرهاتەکە بزانم نەمدەتوانی لەقسەکانی تیّ بگەم، بڕیارماندا ئەو شەوە پشوو بدەین‌و پاشماوەکەی سبەینیّ بۆم بگێڕێتەوە.

بەیانی بەدەنگی هەراو زەنایەکی زۆرەوە لەخەو ڕاپەڕیم، خەڵکێکی زۆر لە ڕاڕەوەکەدا دەنگی مقۆ مقۆو هات‌و هاوریان بوو...

گێلە کە زانی شتێکی نائاسایی ڕویداوە لەجێی خۆی ڕاپەڕی‌و درزێکی کردە دەرگاکە لەڕاڕەوەکەدا هەراو زەنایەکی سەیر بوو.

موراد ورچ خنکێن لەپێشەوە ڕایدەکرد، قازی عەسکەر لەکاتێکا چمکی کەواکەی بەرز کردبویەوە بەدوایدا ڕای دەکردو هاواری دەکرد:

– بیگرن ئەو سەگبابە... مەهێڵن ڕا بکات.

لەدوای ئەوانیشەوە چەن مەئمورێکی زیندان ڕایان دەکرد ژمارەیەکی زۆریش لە زیندانیە کۆنەکان کە ئەو دیمەنەیان دەبینی بەهەموو هێزیان پێدەکەنین موراد ورچ خنکێنیان هان دەدا.

موراد ورچ خنکێن خوی کرد بەژوورێکدا، چونکە یاساغ بوو قازی عەسکەر بچێتە ژووری قاوشەکانەوە هەر لەویّ لەناوەڕاستی ڕاڕەوەکەدا وەستاو دەستی کردە جنێودان.

– گەوجە، نەفام، هیچ‌و پووچ...

بەندیوانەکان قازی عەسکەریان بردە نوسینگەی زیندان‌و دوو سیّ

کەسیش چوونە ژووری قاوشەکەو موراد ورچ خنکێنیان هێنا.
زیندانیەکان لە یەکتریان دەپرسی:
- مەسەلە چییە؟!
- چی بووە؟
بەڵام هیچ کەس هۆکارەی ئەو ڕوداوەی نەدەزانی...
هەندێ لەزیندانیەکان بۆ زانینی مەسەلەکە بەرەو نوسینگە رۆشتن و ماوەیەك هەراو زەناکە دامرکایەوە.
من و گێلە هاتینەوە ژوورەکەی خۆمان، هێندە تامەزرۆی بیستنی پاشماوەی بەسەرهاتەکە بووم پێش هەموو شتێ وتم:
- باشە پاشماوەی بەسەرهاتەکە بەکوێ گەیشت؟
گێلە بزەیەکی کرد وتی:
- هیچ نەبێ بهێڵە با بەرچاییەك بکەین، سەرو ریشێك بتاشین.
- نا.. تکایە بۆم تەواو بکە، کاتێ تۆ قسەم بۆ دەکەی من بیرم دەچێتەوە لەزینداندام.
گێلە ئاورێکی بە بەزەییانەی لێ دامەوە وتی:
- راستیان وتووە: "دەورانی زیندان وەك تەمەنی دوژمن کورتە."
سەرەنجام رۆژێ هات و ماوەی حوکمەکەم تەواو بوو، لەزیندان کردیانمە دەرەوە، بێگومان سەیرە بەلاتەوە کە دەڵێم " دەریان کردم."
بەڕاستیش هەر وابوو، ئازادی لەزیندان بۆ من و هاو وێنەی من بەدبەختی و نەگبەتییە، چونکە لەدەرەوەی زیندان نە کەسێك چاوەڕێمانە نە شوێنێکمان هەیە بۆی بچین.
وتم: بەڕاست، ئەی دایك و باوکت چییان لێ هات؟
فیکەیەکی درێژی لێدا وتی:
- بەه... قوربانی حەوسەڵەت، دەزانی لەو وەختەی لەماڵی باوکم

دەرچووم تا ئێستا کە بەسەرهاتت بۆ دەگێڕمەوە چەن ساڵە؟ تۆ چەن ئاگات لێیان بوو منیش هەر هێندە.

ئاخر بە چ ڕوویەکەوە دەمتوانی بچمەوە لای ئەوان؟ چۆن دەمتوانی بهێڵم ئەوان لە بەسەرهاتی من و لەحاڵی کوڕەکەیان بزانن؟

– باشە، دوایی چیت کرد؟

– کاتێ لەزیندان دەریان کردم نەمدەزانی چ کارێك بکەم و بچمە کوێ! تەنها ئەوەندەم دەزانی نابێ لەشاری گەورەو لەبەر چاوی پۆلیسدا بم. پیاوی خاوەن پێشینە وەکو گای نێوچەوان مارۆیە. ئەم پێشینە نەفرەتیە داخێکی هێندە نەنگیی دەنێ بەنێوچەوانی بنیادەمەوە ئەگەر سەد فرسەخ ئەولاتر کوشتن و بڕینێك ڕوو بدات پێش هەموو شتێ ئەوان دەگیرێن..

بڕیارمدا ئەمجارەیان لەنیشتەجێ بوونی هەموو شارەکان چاوپۆشی بکەم بچمە قوژبنی یەکێ لە گوندە دوورەکانەوە، دەسبەرداری تێکڕای ئەو هەموو خەیاڵ و ئەندێشانە بووم تەنها هەڵوەدای تیکەیەك نان و سەرپەنایەکی حەوانەوە بووم.

تەنها لەسەر تاقە شتێك خۆمم یەکلایی کردبویەوە ئەویش چیتر نەبمە تۆپی یاریی نەکەومە بەر پێ لەقەی یاریزانەکانی کۆمەڵگا تا هیچ کەسێ لەڕێی خوا شەقێکم تێ هەڵنەدات.

دووسەد سێسەد لیرەیەکم هەبوو، ئەو دەمە بەو پارەیە گەلێ کار دەکرا.

بەر لە هەر شتێ چوومە دوکانێکی جل فرۆشی دەستێ جلی تازەم کڕیی، کراس و بۆینباخ گۆرەوی پێڵاوەکانم نوێ کردنەوە سێ کراس و پانتۆڵێکم کڕی کردمە جانتایەکی بچوکەوە بەتەواوی خۆمم گۆڕی و بوومە پیاوێکی حسابی.

لەدوای ئەوە چوومە تەرمینالێك بلیتی پاسێکم کڕی و سوار بووم. دەمویست بۆ کوێ بڕۆم خۆیشم نەمدەزانی، وتم هەرچی دەبێ با ببێ بابزانم ڕێم دەکەوێتە کوێ؟

لە نیوەی ڕێگا پاسەکە لە بەردەمی چایخانەیەکدا ڕاوەستا، سەرنشینەکان دابەزین تاکو چایەك شەربەتێك شیرینەك بخۆنەوە.

کوڕیژگەیەك لەبەر دەمی چایخانەکەدا شەکلەمەی دەفرۆشت، ویستم دانەیەکی لێ بکڕم هەرکە دەستم برد بۆ گیرفانم هێندەی نەمابوو دڵم بوەستێ..

کیفی پارەکەم پێ نەمابوو چاکیش لەبیرم بوو، کە خستبومە گیرفانمەوە بەڵام ئێستا تێیدا نەمابوو... بەخەیاڵی ئەوەی ئیشەڵلا بەهەڵەدا چووم چەندجارێك دەستم کردەوە بەگیرفانەکانی دیکەمدا بەڵام بێ سوود، زانیم لەڕێگا گیرفانیان بڕییوم.

ترسێکی سەیرم لێ نیشتبوو، تا ئێستا دڵخۆشی ئەو پارەیە بووم. دەموت تاکو دەسگیری کارێك دەبم هیچ نەبێ هەفتەیەکی پێ بەسەر دەبەم بەڵام ئێستا ئیتر چی؟ مات و مەلول لەبەر دەمی چایخانەکەدا وشك بووم! "خودایە! ئەمە چ نەگبەتیەکە بەرۆکی گرتووم؟

ئەمە چ بەدبەختیەکە، پەنا بۆ کوێ ببەم ئەم دەردەم بەکێ بڵێم؟"

هەر وا لەم بیرو خەیاڵەدا بووم دەنگی شاگردی پاسەکە بەرز بویەوە "خێرا سوار ببنەوە" ناچار بەرەو پاسەکە ڕۆشتم و سوار بووم، پێش ئەوەی پێی بزانم پارەکەم لێ براوە کەمێ برسیم بوو، بەڵام هەر کەزانیم پولێکم پێ نەماوە هێندە برسیم بوو ئەتوت دوو ڕۆژە هیچم نەدیوە.

هێندە گێژو کاس بووم نەمدەزانی کات چییەو چەندێکە بەڕێکەوتین و لەکوێین.

هەرچی بوو دنیا تەواو تاریك بوو، زۆرێك لە شەو تێپەڕی بوو کە

پاسەکە بۆ نانخواردن و نوێژ کردن لە بەردەمی چایخانەیەکدا وەستا.

منیش هەستی ناڕەحەتیەکی بەتینم دەکرد، پێویستم بە چوونە سەراو بوو، هەر کە پاسەکە وەستا جانتاکەم هەڵگرت و پێش هەموویان پیادە بووم...

لە بەردەمی چایخانەکەدا دە پانزە کەسی ڕاوەستا بوون، هەر یەکەیان چرا فانۆسێکی بەدەستەوە بوو، هەر کە منیان بینی هاتنە لام و بەخێراتنیان کردم.

– جەنابی مامۆستا بەخێر بێیت...

– لێرەوە تەشریف بێنە...

– خێرو خۆشیت هێنا جەنابی مامۆستا...

منیش ئەوەندە تەنگاو بووم، بەدەست لەخۆم دورخستنەوە لەکاتێکا بە نێویاندا تێدەپەڕیم لە یەکێکیانم پرسی:

– ئاو دەستە لەکوێیە؟

پیاوێك لەهەموویان بەتەمەنتر بوو ئاماژەی بۆ کوڕیژکەیەك کرد:

–کوڕە ڕێنمایی مامۆستا بکە.

کوڕیژکە چرا فانۆسەکەی گرت بە دەستیەوەو بەرم کەوت:

– لێرەوە تەشریف بێنە.

– لەو تاریکیەدا ئەو لە پێش و من لە پاش کەوتینە ڕێ، لەبەر چاوم هێندە ڕێگەکە دوورو درێژ بوو خەریك بوو هاوار بکەم:

"بابە، من ئەم تەشریفاتەم ناوێ... ملت بشکێنەو با من نەجاتم بێ.."

بەڵام ئەو لێم نەگەڕا لەناوەڕاستی کێڵگەکەدا کونێکی نیشاندام کە چواردەوریان بەتەختەو دار گرتبوو ئەنجا خۆی گەڕایەوە.

من هەنگاوێك چوومە پێشەوە لەپڕ زەبەلاحێك لەو تاریکیەدا هێندەی کێوێك دەبوو خۆی تێ سرەواندم و دەنگێکی تۆقێنەرم بیست کە هەموو

ناڕەحەتیەکانی بیر بردمەوە لەترساندا پاڵم دا بە دیوارە تەختەکەی ئاودەستەکەوەو دەستم کردە هاوار کردن:

گەماڵە سەگێکی لای ڕانە مەڕ بوو، ناگەهان پەلاماریدام ئەگەر ئەو منداڵە فریام نەکەوتبایە ئێستا دەمێ بوو لە گۆڕدا بووم.

تکام لە کوڕیژکە کرد لەوێ بێت بەڵکو بمباتەوە بۆ چایخانەکە.

کاتێ گەڕامەوە بۆ چایخانەکە پاسەکە بەجێی هێشتبووم‌و ڕۆیشتبوو.

ئەی دادو بێداد... ئەمە چ نەگبەتیەك بوو، ئێستا چی بکەم؟

پیرەمێرد ڕایکردە بەردەمم لەحاڵێکدا شەیلگەی تا بناگوێی کردبویەوە وتی:

- ئورهان بی، من کوێخای ئاواییم، بڕیار بوو هەردوو بەڕێوەبەری ناحیەو قوتابخانە بێن بۆ پێشوازیت، بەڵام درەنگ بوو دەبێ ببوریت...

دەرکم کرد ئەوان بەهەڵە وادەزانن من مامۆستای قوتابخانەکەیانم، بەڵام بەو نیوەی شەوو گیرفانی بەتاڵ‌و سکە برسیەمەوە لەو چۆڵەوانیەدا نەمدەزانی چارەم چییەو دەبێ چیبکەم...

گەر پارەم پێ بوایە ڕێك‌و ڕاست پێم دەوتن:

"بەخوا لەهەڵەدان، من ئەو ئورهان بییەی ئێوە چاوەڕوانی دەکەن ئەو نیم."

دواییش ملی ڕێی خۆمم دەگرت‌و دەڕۆیشتم . بەڵام ئیستا چی؟

ئێوە حەکەم بن بێجگە لەوەی ملی پێدا بکەم چارێکی دیکە شك دەبەم؟

بڕیارمدا ئەمشەو ڕۆڵی مامۆستا ببینم‌و نانێك بخۆم‌و لە جێیەك بخەوم‌و بۆ بەیانیش غەزەلی خواحافیزییان بۆ بخوێنم.

کوێخا پێشم کەوت دەستی بۆ پشتەوەی دیواری چایخانەکە ڕاکێشا:

لێرەوە بفەرموو، "دروشکە ئامادەیە." دوور نییە. ئاواییەکەی ئێمە نزیکە، جادەی زۆرباش نییە، تۆیش بەپێ ماندوو دەبیت.

لەگەڵ کوێخا سواری دروشکە بوین و کەوتینە ڕێ، ئەوانەی دیکەش کە بۆ پێشوازی مامۆستای ئاوایی هاتبوون بەدوای دروشکەدا ڕایان دەکرد.

زۆر بەزەییم پێیاندا دەهاتەوە، بزانە چەن بەپەرۆشیەوە بۆ پێشوازیم هاتبوون تا نیوەشەو چاوەڕێ بوون؟

سبەی بەیانی بێت و بزانن من مامۆستا نیم ئەو کات چارەم چییە؟

خودایە، بەگەورەیی خۆت لەم داوە ڕزگارم بکە..؟

خۆزگە هەر لە زینداندا بومایەو شەرمەزاری لای ئەم خەڵکە سادەو ساویلکەیە نەبومایە.

"خوایە بۆ خاتری خۆشەویستانی دەرگای خۆت هیچ لاوێك شەرمەزار نەکەی.."

خەریك بووم لەگەڵ خوای خۆمدا ڕازو نیازم دەکرد کوێخاش بەردەوام قسەی دەکرد:

– ئورهان بی، تۆ نازانی لەوەتەی بروسکەی تۆ گەڕاوتەوەو پەسەندت داوە تەشریف بێنیتە ئەم گوندە بچوکەو دەرس بەمناڵەکانمان بڵێیتەوە خەڵکی ئاوایی چەن دڵخۆشن، هەموویان دەیانویست بێن بۆ پێشوازیت بەڵام من نەمهێشت وتم ئۆتۆمبێل درەنگ دێت جەنابی مامۆستا ڕازی نییە.

بەسەر لەقاندن پشتڕاستی قسەکانیم دەکردەوە، کوێخایش لە ئەداو قسەکانیدا دنیایەك ڕاستی و دروستی شەپۆلیان دەدا بەردەوام بوو:

– ئێستا دەبینی چییت بۆ دەکەن.

هەرچەن کوێخا باسی پەرۆشی گوندییەکانی دەکرد من زیاتر ناڕەحەت دەبووم، دوو سێ جار بڕیارمدا تا کار لەکار نەترازاوە دابەزم بڕۆم بەلای کاری خۆمەوە، بەڵام کامە کارو چۆن بتوانم بڕۆم بەڵام خۆزگە هەر

برۆشتمایە.

هێندە لەدەریای بیرکردنەوەی خۆمدا نووقم بووم نەمزانی کوێڕا دروشکە گەیشتە ئاوایی... کۆمەڵێکی زۆر ژن و پیاو تەنانەت مناڵی بچوک کە دەبوو بەیانی دەرسیان پێ بڵێم لەبن دیوارەکانەوە چاوەڕوان بوون، کاتێ دروشکە نزیک کەوتەوە دەستیانکردە چەپڵە لێدان و هات و هاوار.

تاکو کەمێ بەخۆمدا هاتمەوە دروشکە وەستا سێ چوار کەسێکی کەشخە کە دیاربوو شارستانی بوون هاتنە پێشەوە:

– بەخێرهاتنت عەرز دەکەم مامۆستای بەڕێز، من بەڕێوەبەری ناحیەکەم...

– بەخێر بێیت ئورهان بی، من بەڕێوەبەری قوتابخانەم.

– خێرو بەرکەتت هێنا، من مەئمور مەرکەزی پۆلیس ئێرەم.

بێجگە لەوەی پێ بکەنم و سوپاسی هەموویان بکەم چارەیەکی دیکەم نەبوو.

بەڕێوبەری ناحیە قۆڵی گرتم وتی:

– دیارە گەلێ ماندویت بفەرموو ئەمشەو لەماڵی ئێمە پشوو بدە، تا سبەی شوێنێکت بۆ چێ دەکەین.

کاک نەجدەتی بەڕێوەبەری قوتابخانە وەڵامیدایەوە:

– ببورە جەناب، لەماڵی ئێمەش جێگە هەیە، مۆڵەت بفەرموو بەندە میوانداری بکەم.

کوێخاو دووسێ کەسی دیکەی ئاوایی جەختیان کردەوە بمبەنەوە بۆ ماڵی خۆیان.

من ورتەم نەدەکرد، ملم کەچ کردبوو، دواجار بڕیار درا شەو میوانی بەڕێوەبەری ناحیە بم.

خواردنێکی هەمە جۆری نایابی ئامادە کردبوو، مریشك، قەل، کەباب، گۆشتی بەرخ، بەلام چ سوود؟ من بەم هەموو برسێتییەمەوە خەیالم ناڕەحەت بوو هەنگوین بەدەمم ژەهری مار بوو.

سبەی بەیانیش دەرفەتی دەرباز بوونم لەو داوە نەبوو، خەڵکی ئاوایی هێندە تامەزرۆی کردنەوەی قوتابخانەکەیان بوون کە بەر لە خۆر کەوتن لە بەردەمی ماڵی بەڕێوەبەری ناحیەدا ئاپۆرەیان بەستبوو.

ئێمەش ناچار بوین بە پەلە بەرچاییەك بخۆین و بەرەو قوتابخانەی ئاوایی بەڕێکەوین.

کاتی بەرچایی کاك نەجدەت دەستی کرد بەقسە کردن:

– ئەم قوتابخانەیە خەڵکی ئاوایی بەپارەی خۆیان دروستیان کردووە، دوو مانگ لەمەو بەر من لەئەستەمبوڵەوە هاتمە ئێرە زۆربەی کارەکانم ئەنجام داون، بۆ خۆیشت باش دەزانی بەڕێوەبردنی قوتابخانەیەك بەتەنها چەن سەختە، هەر بۆیە داوای هاتنی مامۆستایەکمان کرد، دووسێ رۆژ لە مەوبەر کە بروسکەکەی تۆمان پێگەشتەوە هێندە خۆشحاڵ بوین هەر مەپرسە.

من لە بیرو خەیاڵی ئەوەدا بووم ئەگەر ئورهانی ئەسڵی بگاتە جێ چ قوڕێ بە سەرمدا بکەم وتم:

– رۆژی چەن کەڕەت پاس دێتە ئێرە؟

بەڕێوەبەری ناحیە وتی:

– تەنها شەوانە... بۆچی چاوەڕێی کەسێك دەکەی؟

من لەوەڵامی یەکەمیدا کەمێ دڵم هێور بویەوە، لەپرسیاری دووەمی هێندە پەشۆکام کەهەموویان لێم تێگەیشتن!

کاك نەجدەت وتی:

– بەڕاست وا بڕیار بوو ماڵو منالیش لەگەڵ خۆتدا بێنیت... بەلام ...

بەڕێوەبەری ناحیە پێکەنی:

– ڕەنگە وای پێ باش بێ سەرەتا خۆیان بێن و ئەگەر بەدڵی بوو دوایی منداڵەکانیش بێنێ!

پێکەنینێکی زۆرەکیم کرد:

– بەڵێ، هەر وایە.

نەجدەت، بە نابەدڵیەوە قسەکەی پێ بڕیم:

–خۆ بڕیار نەبوو دەسی دەسیمان پێ بکەی، هەڵبەت ئێرە بۆ تۆ شوێنێکی زۆر بچوکە، بەڵام وێڕای ئەوە خەڵکەکەی گەلێ دڵساف و سەر ڕاستن، تۆیش هەر لەڕوی مرۆڤایەتیەوە نابێ بیری ڕۆیشتن بکەیتەوە.

دووبارە سەرێکم لەقاندو پێکەنیم:

"خوایە گیان، من لە چ حاڵێکدام و ئەمانیش لەچ خەیاڵێك؟"

بەڕێوەبەری ناحیە تکای کرد:

– بفەرموون بڕۆین بۆ قوتابخانە.

بەو کۆڵانە تەسك و پڕ لەخۆڵ و خاشاکی ئاواییدا بەنێوانی خۆشی و چەپڵەی گوندییەکاندا گەشتینە قوتابخانە، لەوەی کە تا نیوەی شەو پاس نایەت تا ئەو کاتەش خوا ئەزانی چی دەبێ، کەمی خەیاڵم ئاسودە بوو، بەڵام ئەی دوای ئەوە چی؟

بینای قوتابخانەکە ئەم هەموو خەڵکە خۆشیان بۆ دەر دەبڕیی تاقە دوو ژووری قوڕینەی بچکۆلانەو دەرگاو پەنجەرەی باشیشی نەبوو.

چەن سنگێکیان بە بن دیواردا چەقاند بوو پلێتیان لەسەر دانا بوو، ئەوە بۆ منداڵەکان و بۆ مامۆستایش نیشتۆکێك.

بەکورتی بەهەزار شایەت نەدەکرا بیسەلمێنی کە ئێرە قوتابخانەیە.

بەڕێوەبەر بە خۆ فشینێکی زۆرەوە لێدوانی کردنەوەی قوتابخانەکەی دەست پێکرد:

"گەلیّ خۆشحالّم بەهەولّو كۆشانیّكی زۆرو كۆمەكی خەلّك توانیمان ئەم قوتابخانەیە بكەینەوە لەلایەن خۆمو سەرجەم خەلّكی ئاواییەكەوە سوپاسی كاك نەجدەتو كاك ئورهان دەكەم كە ئامادە بوون بۆ دەرس وتنەوە بیّنە ئەم گوندە دورەوە."

هەموو دەستیان كرد بە چەپلّە لیّدانو هاوار كردن، قوتابخانە بە فەرمی كرایەوە.

سی چوار منالّی پاكوخاویّن نوقلّو شیرینیان گیّڕاو ئامادەبوان دەمیان شیرین كرد.

بەڕیّوەبەری ناحیە ڕوی كردە من وتی:

– ئورهان بی، خەلّكی ئەم ئاواییە هاتنی تۆ بەرز دەنرخیّنن بەو زوانەش قوتابخانەكەمان فراوان دەكەین ئیّوەش لەهەموو ڕویەكەوە خەیالّتان ئاسودە بیّ، هەتا ئەو كاتەی مالّو منالّەكەت دەگەنە ئیّرە تۆ میوانی منیت كاتیّ كەلو پەلیشت پیّگەیشت ئەوا جیّیەكی باشتان بۆ ئامادە دەكەین.

ئەو نیوەڕۆیە میوانی كویّخا بوین چەن سفرەو خوانیّكی نایابی بۆ ڕازاندبوینەوە.

ئەمە یەكەمجارم بوو كلاّو بكەمە سەری خەلّكی بەلاّم هەرچی دەمویست ئەسلّی مەسەلەكە بدركیّنم زمانم گوّی نەدەكرد، نەمدەزانی دوای دركاندنی هەقیقەت چی بكەمو ڕوو لەكەویّ بكەم.

دوای نانخواردن بڕیارمدا كەمیّ پارە لەبەڕیّوەبەری ناحیە قەرز بكەم، بەرلەوەی بیّتە نیوەشەوو پاس بیّتو ئورهانی ئەفەندی ئەسلّی ببینم. لیّگەڕیّ هیّندە بەدوامدا بگەڕیّن هەتا شلو كول دەبن.

وەلیّ، هەرچی پیّم لەجەرگی خوّم دەنا ڕووم نەهات هیچ بە بەڕیّوەبەر بلّیّم، دەمەو عەسر لەگەلّ بەڕیّوەبەری قوتابخانە دوو بەدوو بوین پیّم

وت:

- جەناب، دەمویست شتێك لەڕوتان عەرز بکەم.

بەڕێوەبەری نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم:

- دەزانم دەتەوێ بڵێی چی؟

گەلێ پەشۆکام! ئەو چوزانێ؟ ناشێ بمناسێ!؟

بەڕێوەبەر دەستی خستە سەرشانم:

- بیری لێ مەکەوە! ئێرە هێندەش خراپ نییە، وردە وردە خوو دەگریت بەشتەکانی ئێرەوە، تۆ نازانی خەڵکی ئێرە چەن ساویلکەو دڵسافن!

نەجدەت، لێکدا لێکدا قسەی دەکرد، وایدەزانی لەهاتنم بۆ ئەم ئاواییە بێزارم، قسەکەیم پێ بڕی وتی:

- دەزانم، کاکە گیان.

هاوارم کرد:

- چی، ئاخر چی دەزانی؟

نەجدەت وچانێکی گرت و لێم ورد بویەوە لە هاوارەکەی من گەلێ واق بوو بوو.

بفەرموو گوێم بۆ شل کردوی:

ئەمجارە سەیر کردنەکەی ئەو جۆرێ بوو من گومانم لە قسە کردنی خۆم هەبوو.

نەجدەت وتی:

- ویستت بڵێی چی؟

- کێ بە ئێوەی وت من مامۆستام؟

بەسەر سوڕمانێکەوە لێم ورد بویەوە.

- خودی خۆت.

– من؟ کەی؟ لەکوێ من شتی وام وتووە؟

بەهێمنی وتی:

– مەگەر خۆت بروسکەت نەناردووە؟

– نەخێر، من بروسکەم نەناردووە!

– نازانم بۆچی بەدرۆم دەخەیتەوە، هێشتا بروسکەکەت لەگیرفانمدایە..

ئەنجا، بروسکەکەی لە گیرفانی دەرهێناو بۆی ڕاگرتم، منیش بێ ئەوەی سەیری کاغەزەکە بکەم وتم:

– ئەم بروسکەیە تەواوە بەڵام چ پەیوەندییەکی بە منەوە هەیە؟

– بۆچی؟ تۆ ئورهان نییت؟

سەرم داخستو بە ئەستەم وەڵامم دایەوە: "نا".

نەجدەت سەری لێ هێنامە پێشەوە بەگومانێکەوە پرسی:

– ناشێ، پۆلیسی نهێنی بیتو بۆ لێکۆڵینەوە هاتبیتە ئێرە؟

ورتەم لەخۆم بڕی، نەجدەت وایدەزانی باش پێکاوێتی وتی:

– بەڵێ، منیش بیستومە لەم ئاواییە چەن باندێکی قاچاخچی هەیە خەریکی دروستکردنی تلیاکن، ئێستا زانیم تۆ لەبەر چی هاتووی؟

ئەم کاک نەجدەتە لەو کەسە ساویلکانە بوو وایدەزانی هەموو شتێ دەزانێ، وەلێ ئەمجۆرە کەسانە خەڵەتاندنیان لەمناڵ ئاسانترە، ویستم قسەکەی پشتڕاست بکەمەوە خۆمی لێ دەرباز بکەم، بەڵام زانیم کارەکە گەنتر دەبێ.

نەجدەت چاوەڕوانی وەڵامی من بوو وتی:

– بەخوا، باشم پێکا.

– من ناتوانم ئەمەت پێ بڵێم هەر ئەوەندە دەڵێم، من ناوم "حەقی"ە و ئورهان نیم، درۆیشم نە کردبوو ناوی ڕاستەقینەم "فەرید حەقی" بوو،

لەقوتابخانەش هەر بە "فەرید" بانگیان دەکردم، لەوە ترسام گەر بڵێم ناووم فەریدە، لەرۆژنامەدا ئەم ناوەی دیتبێ و بیری نەچوبێتەوە هەر بۆیە خۆمم بە "حەقی" ناساند.

نەجدەت وتی:

– کاک حەقی، پێشتر بۆچی ئەم مەسەلەیەت نەدرکاند؟

– ئێوە نەتان هێشت من خۆم بناسێنم، کە لە پاسەکە دابەزیم ویستم دەستێك بە ئاو بگەیێنم هەموو دەوریان لێدام و وتیان "جەنابی مامۆستا" بەخێر بێیت، ئەو کاتە من زۆر تەنگاو بووم، ئەنجا پاسەکەش بەجێی هێشتبووم، بەیانیش کە لە هەموو شتێ تێگەشتم نەمتوانی هیچ شتێ بڵێم چونکە گیرفانیان بڕیبووم پولێکم لەگیرفاندا نەما بوو.

نەجدەت بە واق بوونەوە گوێی بۆ قسەکانم شل کردبوو:

– سەیرە... بەخوا سەیرە... چۆن گیرفانی پۆلیسێکی وەك تۆیان بڕیوە!!؟

– من پۆلیس... پۆلیس نیم.

نەجدەت دووبارە پێکەنینێکی تایبەتی کرد:

– دەزانم، دەزانم، دیارە تۆ ناتوانی بڵێی پۆلیسم، وەلێ، متمانە بەمن بکە، من کەسێکی دەمشڕ نیم، من ئەسڵەن شتێکم لە تۆ نەبیستووەو ئاگاشم لە هیچ نییە.

– تکات لێ دەکەم... من سوپاست دەکەم، پۆلیس نیم.

– دیارە... دیارە... دیارە پۆلیس نیت، ئەمەش باشترەو نابێ کەس تۆ بناسێ.

بەدەست ئەم کابرایەوە خەریك بوو شێت دەبووم، هێشتا لەقوڕێك دەرنەهاتبووم دەستی دەگرتم و لەقوڕێکی دیکە هەڵدەچەقاندم، دەترسام قوڕێکی دیکەم بەسەردا بکات و ئەمجارە بەناوی پۆلیسی ساختەوە ملم

بکرێت بە پەتەوە!

– کاك نەجدەت، پۆلیس نیم، بەخوا پۆلیس نیم.

– باشە، پۆلیس نیت، زۆر باشە.

ئەم قسەیەی جۆرێ کرد هەزار مانای لێ دەکەوتەوە، هەرچەن نکوڵیم کرد پێی بسەلمێنم کە پۆلیس نیم ئەو نەیبیست.

نەجدەت پرسی:

– ماوەی چەندێك لێرە دەمێنیتەوە؟

– نازانم، بەڵام هەرکاتێ بۆم هەڵکەوت تێی دەتەقێنم.

– دیارە ئەوکاتەی کارەکەت تەواو دەبێت!

– چ کارێ، بابە گیان چ زۆرێکم لێ دەکەی بمکەیتە پۆلیس؟

دووبارە پێکەنی:

– ببورە، توخوا تکایەکت لێ دەکەم بۆ تۆیش زۆر باشە!

– چ تکایەك؟

– تاکو لێرەیت هاوکاریم بکە مەهێڵە بفەوتێم!

– مەبەستت ئەمەیە من مامۆستا بم؟

– بەڵێ، لێگەڕێ با هەموو وابزانن تۆ مامۆستایت، ئەمەش بۆ تۆ گەلێ باشترە.

– چاوەکەم ئورهانی ئەسڵی دێت و کارەکەش گەنتر دەبێ.

– ئاخر بۆچی لەم وڵاتەدا تەنها یەك ئورهان هەیە؟ ئەو ئورهانێك و تۆیش ئورهانێکی دیکە؟

نەجدەت جۆرێ دەدوا وەك ئەوەی من بڕۆم ئیدی ئەو قوتابخانەیە کاول دەبێ یان ئەو نانبڕاو دەبێ، ڕاستیش دەکرد منێك شوێنکم نییە بۆی بڕۆم و پولێکیشم پێ نییە، چی دەبێ پێشنیارەکەی پەسەند بکەم.

– بە قسەت دەکەم، بەڵام بەو مەرجەی کەس ئاگای لەم کەین و

بەینەمان نەبێ.

– خاترجەمبە، من کەسێکی دەمشڕ نیم.

چاکمان لێ کرد بەلاداو دەسبەکار بوین...مرۆڤەکان بە تێپەڕینی زەمەن باوەڕ بە درۆکانی خۆیان دەکەن... ئەوانەی خاوەن پێشینە بوون‌و لە زینداندا مابونەوە ئەمە باش دەزانن، چونکە بە هۆی گوشاری دەورنیەوە وادەزانن تێکڕای دەرگاکان بەڕویاندا داخراوە، جۆرە حالەتێکی خۆباوەڕیی لەناخیاندا چەکەرە دەکات.

منیش یەکێ بووم لەو کەسانە، لەیەکەم رۆژەوە تەنانەت لەخەیالی ئەوەی ئەگەر لەجیاتی ئورهان بم گیانم وەك بی دەلەرزیی کەچی دوای چەن رۆژێ باوەڕم کرد من ئورهان بیم.

زۆر ئاسایی‌و بێ هاندان دەچوومە پۆلەوەو دەرسم بە قوتابیەکان دەووتەوە، تەنها خەمی ئەوەم بوو "ئورهان بی ئەسلی بۆچی نەهات؟" کاك نەجدەت لەهەموو ڕویەکەوە پێویستی ژیانی منی دابین کردبوو. ژوورێکی بچوك‌و کەلو پەلی خاوێنی بۆ کڕیبووم، خەلکی ئاواییش رێزێکی زۆریان لێ دەگرتم..

بە کورتی حالێکی زۆر باشم هەبوو، بێ خەم بووم، ژیانێکی ئارام‌و بێ دەردەسەرییم ڕادەبوارد، کاتێکیش لای نەجدەت نیگەرانی خۆم سەبارەت بە درەنگ کەوتنی ئورهان دەردەبڕیی ئەو پێدەکەنی.

تۆ لەکاری پەروەردەیی سەر دەرناکەی، پەوەردە ئێمە وەکو پەڕی لولی پۆڕهەلەك تێك ئالۆزاوە بەو زوانەش خاو نابێتەوە، دیارە هەر ئەو رۆژەی ئەو ویستویەتی بێت بۆ ئێرە ناردویانەتە شوێنێکی دیکە، یان هەمان ئەو رۆژە پلەی بەرز کراوەتەوە، یان کێ نالێ دەریان کردووە.

ئەوەی بەسەر خۆی هاتبوو بۆی گێڕامەوە، لەماوەی سالێکدا ڕەوانەی سێ شاریان کردبوو، هەرچەن یەك وشە زمانی ئینگلیزی نەدەزانی

جارێکیش بە مامۆستای زمانی ئینگلیزی دایانمەزراندبوو.

بۆ کلۆڵی من دوو سێ هەفتە دوای ئەوە نەجدەت لەوێ گوازرایەوە فەرمانێکی باڵا لە پەروەردەوە گەیشت کە من واتە ئورهان بییان کردە بەڕێوەبەری قوتابخانە.

چیتر لەمە زیاتر بەرگەی ئەو نەگبەتیەم نەدەگرت نەشمدەزانی چارەم چییە، لەنەجدەتم پرسی:

– من دەبێ چی بکەم؟

– هیچ مەکەو نیگەران مەبە، تۆ لێرە ئەرکێکی دیکەت لەئەستۆیە دەبێ سەر پەرشتی قوتابخانەکە بکەی تاکو بەڕێوەبەری ئەسڵی بۆ دێت.

نەجدەت لەوەی کە گوێزرا بویەوە دەچویە شوێنێکی باشتر زۆر دڵخۆش بوو وەلێ منی نەگبەت چی؟ کاتی رۆشتنی نەجدەت نەمتوانی جڵەوی خۆم بگرم دەستم کرد بەگریان.

– دوای تۆ من لێرە ناتوانم بمێنمەوە.

زۆری بۆ دوپاتکردمەوە:

– دانیشە، لەخۆڕا کارەکان مەشێوێنە.

هەرچیم کردو کۆشام نەجدەت تێگەیێنم کە من پۆلیس نیم، مەخابن نەکراو نەکرا..

دوای رۆشتنی ئەو ئەرکی من گەلێ دژوارتر بوو، چونکە دەبوو هەم قوتابخانە بەڕێوە ببەم هەم دەرسیش بە منالەکان بڵێمەوە.

بەڵام، من لەکار کردن وەڕز نەدەبووم، ئاواتەخواز بووم لەراستیدا مامۆستابم تاکو مردن لەخزمەتی ئەو خەڵکە ساویلکەو دڵپاکەدا بومایە.

سەری مانگ مووچەکەم لەڕێی ناحیەوە بۆ ڕەوانەکرا، دووبارە دردۆنگ بووم لەوەی ئەو پارەیە وەربگرم یان نا.

چاریشم نەبوو بڕێکی زۆرم کەلو پەل کڕی بوو قەرزار بووم، هەر کە

چاوم بەلیستی موچەکە کەوت خەریك بوو مێشکم تێك بچێ تێگەشتم ئورهان بی یەکێکە لەمامۆستا کۆنەکان و موچەکەی مانگی شەش سەدو هەشتا لیرەیە.

کاتێ موچەکەم وەرگرت وەك ئەوەم لێ هات تاوانێکم کردبێ، هێندە بێ تاقەت بووم ئەو رۆژە نەمتوانی بچم بۆ قوتابخانە، بە بیانوی نەخۆشیەوە لە ماڵەوە مامەوە تاکو بیرێك لەم نەهامەتیە بکەمەوە.

هات بەخەیاڵمدا تا پارەم پێیە لێرە هەڵێم لێ، قوتابخانەکە چی لێ بکەم؟ چارەی منالەکان چییە؟

تازە رۆشتنی من لێرە کارێکی هەروا سانا نەبوو، هەموو دەزانن و ناهێڵن برۆم.

خۆزگە رام بکردبایەو چاوەڕوانی کوێرەوەری دواترم نەکردبایە.

********

ئەو هەراو زەنایەی لەپارەوی زیندان بەرز بویەوە مەودای چیرۆکەکەی بچڕاند. گێلە لەشوێنی خۆی هەستاو چویە دالأنەکە منیش بەدوایدا.

موراد ورچ خنکێن، لە ناوەراستی زیندانیەکاندا وەستا بوو چیرۆکی قازی عەسکەری دەگێڕایەوەو کوڕەکانیش قاقا پێدەکەنین.

– مەسەلە چی بوو؟

دیاربوو هەموو رۆژێ بەیانی کە قازی عەسکەر دێتە زیندان هاوڕێکانی موراد لەبەر دەرگای دەروەی زیندان وەستاون‌و دوایی بە بیانوی تەوقەکردن کەمێ تلیاکیان بە دەرزی لە چمکی عەباکەی کردووە.

ئەویش بێ ئەوەی بەخۆی بزانێ کە تلیاکی هێناوەتە زیندان‌و مورادیش کە یەکێ بووە لە مورێدە ملکەچەکانی هەر کە هاتۆتە ژوورەوە دوای کەوتووە تلیاکەکە لێ کردۆتەوە.

ئەو رۆژە هەرچەن دەست لەعەباکەی دەدات تلیاکی تێدا نادۆزێتەوە، ئەمیش بەگومانی ئەوەی تلیاکەکە کەوتبێتە نێو بەری عەباکەوە زیاتر دەستی دەباتە پێشەوە تەنانەت دەستێك بە بەینی رانیدا دێنێ.

قازی عەسکەریش ئەم ئەداو ئەتوارەی ئەو بەخراپ لێك دەداتەوە، بەگومانی ئەوەی مەرامی گلاوی هەبووە دەنیشێتە سەری‌و ئەو فەرتەنەیە دەنێنەوە، بێ ئاگا لەوەی ئەو رۆژە هاوڕێکانی درەنگ هاتوون تلیاکیان نەناردووە.

قۆڵی گێلەم گرت تکام لێ کرد بچینەوە ژوورەوە... گێلە چاوێکی تێ بڕیم‌و بزەیەکی تایبەتی کرد:

- ئەڵێی زۆرت حەز لەم چیرۆکەیە؟

- من شەیدای ئەم بەسەرهاتانەم.

گەڕاینەوە بۆ ژوورەوەو لەگێڕانەوە بەردەوام بویەوە:

- هەموو ڕێگاکانم لێ داخرابوون تەنها ڕێگای چەرمەسەرێ نەبێ کراوە بوو، نەمدەزانی بۆ قوتاربوون لە دەست ئەم نەهامەتیە چی بکەم؟

دواجار بڕیارمدا خۆم بدەمەوە دەستی چارەنوس تا بزانم چی بەرۆکم دەگرێتەوە...

لە شوێنی وا بچوکدا خەڵك زوو ئالودەی یەکتری دەبن بەتایبەت ئەوان کەناچارن شەوو ڕۆژ پێکەوە ژیان بکەن، ئێمەش شەوانە لەگەڵ بەڕێوەبەری ناحیەو سەرۆکی بنکەی پۆلیس و نوێنەری جوتیاران و کوێخاو چەن کەسێکی دیکەدا پێکەوە دەبوین، کۆڕی خواردنەوە قوماركردن ساز دەکرا.

من مەشروبم نەدەخواردەوە دەمزانی ئەگەر سەرخۆش ببم ڕاستیەکان دەدرکێنم و دەبمە تەختەی سەرئاو.

شەوێکیان بە بۆنەی بوونە بەڕێوەبەری منەوە هاوڕێیان ئاهەنگیان ساز کرد ئەم نەگبەتیە بەرۆکی گرتم.. سەرەتا زۆر کۆشام مەشروب نەخۆمەوە بەڵام کاتێ بەڕێوەبەری ناحیە پێکەکەی بەخۆشی سەری من هەڵدا، بۆ من بێ ئەدەبی بوو لە خۆشی سەری ئەو نەخۆمەوە.

کاتێ بەڕێوەبەری ناحیە سەرخۆش بوو هەستایە سەر پێ و دەستی کرد بە قسەکردن:

- ئورهان بی، یەکێکە لە خۆ بەخشەکانی دەستەی پەروەردەکەمان کە ڕەنجێکی فرەی کێشاوە شایستەی پلەو پایەی بەرزترە.

لە دڵی خۆمدا وتم: "خوایە لەم لاڕێ بوونە ڕزگارمکە."

بەڕێوەبەری ناحیە سەرێکی بەلای مندا سوڕاندو بزەیەکی کرد:

- هاورێیـان بـا بخوێنـەوە بـە خۆشـی سـەری هـاورێی ئـازیزو خۆشەویستمان بەڕێز ئورهان بی..

هەموو پێکەکانیان بەرزکردەوە، من هێندە لەو وەسف‌و پیاهەڵگوتنەی بەڕێوەبەر خۆشحاڵ بووم پێکە عارەقەکەم هەڵگرت‌و بینم پێوەنا و چۆڕم لیٚ بڕیی.

- بە خۆشیتان..

کوێخا هاواری کرد:

- ئـەم شـارەدێیەی ئێمـە هـەرگیز ئورهـان بـی لـە بـیر ناکـات... بەخۆشیتان..

من پێکێکی دیکەم هەڵدا.

نوێنەری جوتیارانیش هەستایە سەر پێ..

- مـن ئـەم ئـاوە تاڵـە بـەیادی بیرەوەریـە شـیرینەکانی هـاوڕێی ئـازیزم ئورهان بی دەنۆشمەوە.

من پێکێکی دیکەم هەڵدایەوە.

لـە خۆشـیدا گریـانم دەهـات، بە زۆر خـۆمم لـەو حاڵەتـە رۆحیـەی خـۆم دزییـەوە نـەوەك كـەس پـێم بزانـێ، هێنـدە لەژیانمـدا کوێرەوەریم دیتبـوو هـەرگیز نـەدەهات بـە خەیاڵمـدا کەسـێ هـەبێ لـە دنیـادا چـاکەم لەگـەڵ بکات‌و خۆشی بوێم.

کـە پێنجـەم پـێکم خـواردەوە بـەر چـاوم تاریـك بـوو جـۆرە هەسـتێکی شەرم‌و کەرێتی داگیریان کردم چنگیان لەناخم دەشێواند، من تاوانبارێك بووم کڵاوم لەسەری هەموویان کردبوو.

لەوەی کە ئەو مرۆڤە چاك‌و نیەت پاکانەم فریو دابوو شەرمەزار بووم.

ئەگـەر پـێم بـزانن مـن خـاوەن پێشـینەیەکی کـڵاوم، ئـاخۆ چـیم لەگـەڵ دەکەن؟

نۆبەی قسەکردنی من هات، چی دەبێ با ببێ؟

کاتێ پێکەکەم هەڵدا گوێچکەکانم کپ بوبون بەدەست خۆم نەبوو زمانم کەوتبویە گەڕ:

– هاوڕێیـانی خۆشەویـست لـەوەی کـە مـن ئێـوەم فریـوداوە داوای لێبوردنتان لێ دەکەم، ڕەنگە باوەڕ بە قسەکانم نەکەن بەڵام ئەوە ڕاستیە.

میوانـەکان دەسـتیان کـرد بـە چـپە چـپ، منـیش بـەقووڵی لێیـان ورد بوومـەوە، دەمزانـی ئـەم قـسانەم بـێ مانایـە لـێ، بەدەسـت خـۆم نـەبوو "مەستی و ڕاستی." دەمێك بوو حەزمدەکرد ئەم قسانە بکەم، دەمزانی سـەرەنجام ڕۆژێ گـیر دەخـۆم هـەموو ئـەم بەسـەر هـاتی ژیانـەم دەزانـن، کەوابوو لەوە باشتر نابێ خۆم هەموو شتێکیان بۆ ئاشکرا بکەم.

– هاوڕێیان من دان بەوەدا دەنێم شایستەی ئەم میهرەبانیەی ئێوە نیم، من مامۆستایەکی ساختەم، پیشەی پیرۆزی مامۆسـتایەتی لـە کـوێ و مـن لە کوێ؟ من کڵاوم لەسەری هەموتان ناوە.

گریان بەری پێ گرتم و نەمتوانی لەسەری بـڕۆم، بەڕێوەبەری ناحیـە بە دەنگی بەرز وتی:

– تۆ نمونەی کەسێکی لە خۆ بوردوو ئەرکناسیت!

گریانەکەمم قووتدایەوە هاوارم کرد:

– بەخوا بەڕاستمە.. من مافی کەسێکی دیکەم زەوت کردووە.

نوێنـەری جوتیـاران و کوێخـا کـە لـە تەنیـشت یـەکترەوە دانیـشتبوون بەهێواشی بە یەکتریان وت:

– فلانیی مەست بووە!

نوێنەری تەندروستی وتی:

– بـەڵێ، ئێمـە هـیچ کامێکمـان هێنـدەی ئـەوەی وەریـدەگرین مانـدوو نابین.!

هـەر یەكـەو شـتێكی دەوت، زۆری نـەمابوو لـەداخانا شـەق ببـەم، نەیانهێشت من قسەكانم تەواو بكەم.

– بەڕێزان مۆڵەت بفەرموون.

سەرۆكی پۆلیس كە لەتەنیشتمەوە دانیشتبوو پێكێ ئارەقی دیكەی دامێ و داوێنی گرتم و لەسەر نیشتۆكەكە دای نیشاندمەوە.

من پێكە ئارەقەكەم هەڵدایەوەو دووبارە هەستامەوە:

– هاوڕێیـان، مۆڵـەت بـدەن دان بەتاوانەكەمـدا بنـێم لەمـە زیـاتر بەرگـە ناگرم من توشی ئازاری ویژدان بووم وەرن قۆڵبەستم كەن.

سەرۆكی پۆلیس دووبارە دای نیشاندمەوە چیتر لەهۆش خۆم چووم.

بـۆ سـبەی زانـیم دوو سـێیەك لـە هاوڕێیـان بردومیانتـەوە بـۆ ماڵـەوەو خەواندومیان.

بە هۆی ئەم بەد مەستیەوە ڕۆژی تا ئێوارێ لەماڵەوە كـەوتم و نـەمتوانی بچمەوە بۆ قوتابخانە.

شەوی دواتریش لە شەرمەزاریدا نەچووم بۆ كۆڕی هاوڕێیان و هـەر لـە ماڵەوە بووم تـاكو نیوەشـەو هـەر بەخەبەر بووم و بیرم لـە نەهامەتیەكانی خۆم دەكردەوە لە پڕ چەنجارێك لە دەرگا درا..

تا ئێستا ڕوینەدا بوو كەسێ دوای نانی ئێوارێ بێت بۆلام لەو گوندەدا شـەوانە خامۆشـی و بێدەنگیـەكی نـامۆ بـاڵی دەكێـشا و گوندییـەكان زۆر زوو دەخەوتن.

جـەرگ و هـەناوم داتـەپی، هەسـتم كـرد شـتێكی گرنگـەو حەتمـەن سەرۆكی پۆلیس بۆ دەسگیر كردنم هاتووە.

هێنـدە ترسـەكە بەسـەرمدا زاڵ بـوو تاوێـك نـەمتوانی لـە جێـی خـۆمم ببزووم.

ئەوەی لەو دیوی دەرگاكەوە بوو چەن مشتێكی توندی لە دەرگاكە داو

بەخرۆشانێکەوە وتی:

- مژدەم بەرێ ژن و منالەکەت گەیشت!

ئەگەر زەمین لەرزە ڕوی بدایە، ئەگەر بۆمبی ئەتۆم بتەقیبا، دنیام بەسەردا کاول بوایە هێندە زەندەقم نەدەچوو وا لەبیستنی ئەو هەواڵە تۆقیم، ئەی هاوار ئەمەیان چی لێ بکەم؟

مێشکم لە کار کەوتبوو، بەڵایەکی هێندە ناگەهان داباری بوو، هیچ ڕێچارێکی نەبوو، تا کەمێ هاتمەوە سەر خۆم دەنگی پێی شەش حەو کەس و دەنگی تریقەو پێکەنین و قسەکانیان لەو دیوەوە بیست.

- بابە خەوتووە.

- خەبەری مەکەرەوە.

- ئەو دەرگایە بکەرەوە، خۆ نەمردووە؟

چارەیەکم نەبوو بێجگە لەوەی هەڵێم و گیانی خۆم دەرباز بکەم.

جلەکانم خستە بن دەستم لەو دەلاقە بچوکەی لەپشتی ژوورەکەوە بوو بازمدایە کۆڵان، بەرەو دەرەوەی گوندە ڕامکرد تا مەودایەکی زۆریش دەنگی قاوو قیژی ژن و منالەکانی ئورهانم دەبیست، وەلێ بێجگە لەمە هیچ چارەیەکم نەبوو.

سەگەکانی ئاوایی لێم هاتنە وەڕین، هەڵاتنی من لەو نیوە شەوەدا هەراو هوریایەکی وای بەرپا کردبوو هەموو گوندییەکانی لەخەو بێدار کردەوە.

دەشمزانی هەڵاتنم بێ هوودەیە بەمەش هەوڵمدا بەهەر کولەمەرگیەك بووە خۆم بگەێنمە سەر جادەو بەڵکو لەدەستی ئەوان رزگارم بێت.

هێشتا نەگەیبومە بەردەمی چاخانەکە پۆلیسەکان لە دوامەوە گەشتنە سەرم، تێخوڕین و شریخەی ڕاکێشانی میلی تفەنگەکانم گوێ لێ بوو.

وەکو داری وشك لەجێی خۆم وەستام و لەگەڵ پۆلیسەکان گەڕامەوە بۆ

ئاوایی.

ژن و منالّەکانی ئورهان بەدیتنی من هێندە هاواریان کرد پێنج تا دە گوندی ئەو دەورو بەرە بەئاگا هاتن.

ژنەکەی ئورهان مێردەکەی لە من دەویست و منالّەکانیش باوکیان.

کارمان گەیشتە دادگا، دەرکەوت ئورهانی ئەسلّی ئەو کاتەی رۆشتووە بۆ کارەکەی لە ئۆتۆمبێل پەڕیوەو گیانی سپاردووەو بەناوێکی نەناسراوەوە ئەسپەردە کراوە.

دووبارە منیان خستەوە قەفەزی تاوان و لێکۆڵەر ڕایگەیاند من بۆ زەوتکردنی شوێنەکەی ئەو ئەم پلانەم داناوە هۆکاری مردنی ئورهان لە ئەستۆی منە.

ئێستا وەرە ئەم کەرە لەقوڕ دەربێنە، پێشتر ئەگەر بە تۆمەتی فێڵبازی زیندانی دەکرام هەر ئومێدێکی رزگاربوونم هەبوو، بەلاّم ئەمجارەیان چی؟ مەسەلەی کوشتنی بە ئەنقەست هەر وا هەوانتە نەبوو.

هەرچەن سوێندم خواردو هەرچی پاساوم هێنایەوە کەس گوێی لیّ نەگرت، دەرکەوتەی مەسەلەکەش بەجۆریّ بوو هەموو گومانێکی دەڕەواندەوە.

بە دۆسیەیەکی زل و زەبەلاحەوە بە پلیکانەکاندا هاتمە خوارەوە بزانین ویستی خوا چۆنە؟

سبەی بەیانی سەر لەنویّ رۆژنامەکان هەراو زەنایەکیان بەرپا کردەوە: "مامۆستای ساختە، بازرگانی ساختەو لە زینداندا گەلیّ شت گۆڕانکاری بەسەردا هاتبوو."

سلێمان دایکی خۆفرۆش و موراد ورچ خنکێن، چەن ساڵ دوژمنی قەستە سەری یەکتریی بوون پێکەوە کلکیان گریّ دابوو بەرەیان لەژێر هەمووان هەڵتەکاندبوو.

لە هەموویشی خراپتر ئەو ساڵە ساڵێکی سەخت بوو، کەس زستانی وا سەختی نەدیتبوو، زیندانیەکان لە ژوورەکانیاندا وەکو بیی دەلەرزین، منیش گیرفانم خاڵی بوو، بۆیە بەپێچەوانەی جارانەوە کە زیندانیەکان میوانداریان دەکردم هیچ، کەسیٚ وەك سەگێك تەماشای نەدەکردم.

هەمیشە لە زستاناندا، موشتەری زیندان زۆرترە بەڵام ئەو ساڵە قەرەباڵغی بیٚ حەد بوو، یەکسەر چوومە لای ئەو چەرپایەی جاران لەسەری دەخەوتم بەڵام بینیم کەسێکی دیکەی لەسەر ڕاکشاوە.

وتم: "کیٚ ئەم چەرپایەی منی داگیر کردووە؟"

کەس وەڵامی نەدامەوە، ئەو پشتی و بەتانیەی لەسەری بوو فڕێمدایە خوارەوەو بەتانی خۆمم لیٚ ڕاخست.

پاش تاویٚ، سلێمان دایکی خۆفرۆش هات بیٚ ئەوەی سەیرێکم بکا وتی:

– چ دایك و باوك واو وا لێکراویٚ ئەم بەتانیەی فڕێداوەتە خوارەوە؟

هەر لەو جێیەی لیٚی دانیشتبووم قیڕاندم:

– ئاگات لەدەمی خۆت بیٚ... تۆ منالی دوێنیٚی... هێشتا پێنج ساڵ نابیٚ هاتویتە زیندان چ مەرگێکتە..!

چاوە خوێنگرتوەکانی تێبڕیم:

– دابەزە ئەو جێیە خاوەنی هەیە.

– با، خاوەنەکەی بچێتە سەر بەرد ڕاکشێت کەس دەستی نەگرتووە.

لە زینداندا وا باوە مل هوڕو گوندەکان چەرپاکانیان بەرامبەری دەرگا دادەنێن، حیکمەتی ئەمەش لەوەدایە دوژمن ناتوانیٚ زەفەریان پیٚ بێنیٚ ئەوان هەرکات بیانەویٚ دەتوانن مەترسیەکان لە دورەوە ببینن.

من دەمزانی ململانیٚ لەگەڵ ئەمانەدا بیٚ سوودە، بەڵام خۆ ئیدی لەچی بترسێم؟ لەسەروو ڕەنگی ڕەشەوە مەگەر ڕەنگێکی دیکە هەیە؟

کاتێ بڕیارە من بۆ پیاو کوژییەك کە ڕۆحیشم لێی بێ خەبەرە بخزێمە سوچی زیندانەوە کەواتە لێگەڕێ با داخی دڵی خۆم بڕێژم.

ڕەفتاری من هەرایەکی وەهای لێ کەوتەوە زۆربەی زیندانیەکان وایاندەزانی کەس نییە شان لەشانی سلێمان دایکی خۆ فرۆش بدات لەقسەکان واقیان وڕ مابوو، ئەوان دەرکیان بەوە نەدەکرد من بەچی دەنازم پشتەسوری چیم وا ئەم قسانە دەکەم.

لەمەش سەیرتر خودی سلێمان خۆی بوو، هەڵبەت ئەو دەتوت گای بنەیەو شکاندنی ئازای ئەنامی من بەلای ئەوەوە وەکو ئاو خواردنەوە بوو، بەڵام لەوەی من بەگژیدا چوومەوە خۆیشی مات و مەلول بوو بوو!

من بێ ئەوەی گوێ بدەمە ئەو هەرایەی ناومەتەوە زۆر بێ باکانە لەسەر چەرپاکە ڕاکشام و بەتانیەکەم لەخۆم ئالاند، لەتاو سەرما لە ژێر بەتانیەکەوە چوقەی دانم دەهات خۆمم گرموڵە کردبوو، وەکو بیی دەلەرزیم بینیم داستان قەدری بەسینیەك چاوە هات:

– ئەمە سلێمان بۆی ناردویت.

– نامەوێ..دەستێکم پێوە نا پیاڵە چاکە کەوتە خوارەوە.

کاتی نانخواردن دیسان قەدری بەسینیەك خواردنەوە هات وتی:

–ئەمە کاك سلێمان بۆی ناردویت!

سینیەکەم هەڵدا:

– بیبەرەوە با دایك و باوکی بیخۆن..!

– باش نیە کوڕە لەکەری شەیتان دابەزە بەڵایەکت بەسەر دێنێ.

– هەر ناماقوڵیەکی لەدەست دێت بێ منەت بێ ... من لە چەقۆی ئەو ناترسم.

خۆیشم نەمدەزانی بۆ هێندە کەڵەسەریی دەکەم، توشی توڕەییەك بوو بووم ئامادە بووم بە بەهای ڕۆحی خۆم لەگەڵ خەڵك شەڕ بکەم...

کاتی نوستن دیسان قەدری هاتەوە چەن کراسێکی خوریو پاڵتۆیەکی بەسەر دەستەوە بوو، کاتێ پاڵتۆکەی بۆ ڕاگرتم وتم:

– پارەم پێ نییە.

– چ سەگبابێك داوای پارەی لێ کردوی، تۆ وادەزانی لەدنیادا پیاوەتی نەماوە؟ ئەمانە سلێمان بەگ بۆی ناردوی.

لەکاتێکا لە تاو سەرما هەڵدەلەرزیم پاڵتۆکەم دایەوە بەسەروچاوی قەدریدا.

– بۆی ببەرەوە با دایکی لەبەری بکات، تۆیش ملت بشکێنە، ئەمجارە بێیتەوە ئێرە قەڵەمی دەستو پێت دەشکێنم.

قەدری تفێکی کردە زەویو ڕۆشت:

– بەخوا سلێمان ناهێڵێ ئەمانەت بەسەرەوە بچێ، ئەو تا ئێستا پێنج کەسی کوشتووە!

ڕاستیەکەشی هەر وا بوو، سلێمان دایکی خۆ فرۆش کەس نەیدەوێرا پێ لەبەر پێی بنێت، بەڵام، دەربارەی من چ پیلانێکی هەبوو، حەتمەن چاوەڕێی فرسەتێ بوو.

سات بە سات بەڵا بەسەرمدا دەباری، وەلێ، من بێ گوێدانە چارەنوس بۆی چوومە خەونی شیرینەوە.

بۆ بەیانی هێشتا لەژێر بەتانیەکەمەوە جوڵە جوڵم بوو، بەندیوانی قاوشەکەمان هاواری کرد:

– فەرید بێت بۆ نوسینگە.

بەدڵە خورپێوە هەستامو خۆم گۆڕی، دەمزانی بۆ تەحقیق دەبرێم.

چوومە بەر دەرگای نوسینگە، مەئموری خەفەر وتی:

– لەسەرەوە داوا کراویت بۆستە با بە مەئمورێکدا ڕەوانەت بکەم.

لەسەر پلیکانەکان ڕاوەستا بووم بیرم لە ئاخرو ئاقیبەتی کاری خۆم

دەكردەوە.

ئادەم بابا، لەو سەری دالآنەكەوە هات، ئەمە یەكێ بوو لە زیندانیە قەدیمیەكان بەلآم سەرو سەكوتی هێندە شپرز بوو كەس تاقەتی نەبوو قسەی لەگەڵ بكات، جل‌و بەرگی هێندە شڕو شێواو بوو هەموو ئازای ئەنامی بەدەرەوە بوو.

بتلێكی بەتاڵی بەدەستەوە بوو، هەركە نزیكم كەوتەوە بتڵەكەی هەڵێنایەوە، من تا فریای خۆم كەوتم بەرچاوم بریسكەی دایەوە تەنها گوێم زیڕەی وردە شوشەكان بوو ئیتر نەمزانی دنیا چییە.

هەموو وایاندەزانی چیتر من لیٚ بوومەوە، كەچی عەسری هەمان رۆژ لە نەخۆشخانە بەهۆش هاتمەوە.

چونكە ئەستۆپاكیم دەركەوتبوو حوكمی ئازادبوونم بۆ دەرچوو بوو، هەر ئەو شەوە لە نەخۆشخانەوە بەرەلآیان كردم.

سەرم پێچرا بوو جلەكانیشم خوێناوی بوون، بەم سەرو سیمایەشمەوە بچومایەتە هەر شوێنێ پۆلیس دەسگیریی دەكردم، بۆیە بریارمدا بچمە گوندێكی دوورە دەست..

سواری پاسێك بووم كە بۆ ئەرزروم دەچوو، بەو پارەیەی لەسەردەمی مامۆستاییەكەمدا پاشەكەوتم كردبوو لەسوچێكی ولآتدا تیكە نانێ پەیدا بكەم.

لەم كاتەدا دەنگێ لەدالآنەكەوە بەرز بویەوە كە سەرتاپامی هێنایە لەرزین، كەسێك بەناو نازناوی خۆمە بانگی كردم.

بزەیەكی كاڵ‌و كرچ كەوتە سەر لێوی گێلەو هەناسەیەكی هەڵكێشا وتی:

– ئیشەڵلآ فەرمانی ئازادبونت گەیشتووە؟

من هێندە شپرزە بوو بووم، نەمدەتوانی لەجێی خۆم ببزوم، گێلە

درزێکی کردە دەرگاکەو پرسی:

– چی بووە؟

– هاوڕێکەت ئازاد بوو.

وەك بارێکی گرانم لەسەر شان داگرن سووك بووم، وەك باڵندەیەکی سووکباڵ لەجێی خۆم هەستام بە شپرزەیی خواحافیزیم لە گێلە کرد.

ئەوەندە خۆم دۆڕاند بوو، بیرم نەبوو پاشماوەی داستانەکە لە گێلە بپرسم؟

گێلە خۆی بیری خستمەوە:

– هاوڕێ هیچ نەبێ ئەدرێسەکەتم بدەرێ بێم بۆ لات و پاشماوەی بەسەرهاتەکەت بۆ بگێڕمەوە.

پۆزشم بۆ هێنایەوە لەکاتێکا چوومە دەرەوە ئەدرێسەکەم پێدا. بڕیارماندا ئەگەر ماوەیەکی زۆر لەزینداندا بمێنێتەوە خۆی پاشماوەی داستانەکەم بۆ بنوسێت و بۆم ڕەوانە بکات.

ماوەیەکی خایاند، خەریك بوو بیرەوەریەکانی سەردەمی زیندانم بیر دەچویەوە کە نامەیەکم لە گێلەوە بەدەست گەیشت.

ناوەرۆکی ئەم نامەیە بەسەرهاتی سەیرو ناباوەڕیی ئەوە، کە تەژییە لە جۆش و خرۆش، دیارە ئێوەش ئۆقرە ناگرن تاکو پاشماوەی داستانەکەتان لەکتێبێکی سەربەخۆدا بۆ بلاو بکەمەوە.

ئەو نامەیەی گیلە بۆی ناردبووم بە بێ ناوو نیشان بوو، بەمجۆرە دەستی پێکرا بوو:

"بڕیارم وا نەبوو بەسەرهاتەکەم بنوسم... دەترسم بلاو بونەوەی ئەم بەسەرهاتە وەیشومەیەك بنێتەوە، ناوی من دەمێکە لەبیر چۆتەوەو فەرامۆشکراوە دووبارە بێتەوە ویردی سەر زمان."

"لە لایەکی دیکەشەوە باش نییە بلاو بونەوەی ئەم بەسەرهاتەو

بکەوێتــە دەســتی فێڵبــازان، ئــەوان بەخوێندنــەوەی داســتانەکەی مــن لەشەرمەزاریدا دەتوێنەوەو لەوەی کە کردەوەو ڕەفتاری ئەوان بەتۆزی پێی مندا ناگات دیارە هەست بە کەمیی و سوکێتی خۆیان دەکەن.

چــونکە مــن هــیچ کاتــێ مــەرامی فێڵبــازیم نــەبوو... بــەخوا... ئەگــەر تۆزقاڵێ مەیلم بەلای ئەوەدا چوبێ زەرەر لەکەسێ بدەم یان کەسێ فریو بــدەم... بــەڵام چــی بکــەم کارەســاتەکان لــە مــن بــاڵا دەســتتر بــوون لــە چارەنوسمدا."

تــەنها عــەیبێکی زەقــم هــەبوو، هــەر کــارێکم پــێ بــسپێردرایە بــە دڵسۆزییەوە دەمکــرد... بــەرتیل خــۆر نــەبووم... ســەرم بــۆ کــەس شــۆڕ نەدەکرد... بێ شەرەف نەبووم، هەر بۆیە هەموو دەرگانم بەڕودا بەسرا بوون نەیان دەهێشت بچمە ژوورەوە.

هەرچی دەمویست بەرەو ڕێی پاك‌و بێگەردیی بچم هەموو بەرەو لارێ بوون‌و کوێرەوەریی پاڵیان دەنام.

"ئەگــەر لــەیادت بــێ بــۆم گێڕایتــەوە کــە بەســەری شــکاوو پێــچراوەوە سواری پاسێك بووم بەرەو ئەرزڕوم کەوتمە ڕێ بەڵکو لە قوژبنێکدا تیکە نانێکی بێ سەر ئێشە پەیدا بکەم.

ئەو شوێنەی دەمویست بۆی بڕۆم تەنها ناوەکەییم دەزانی، کوڕێکی خەڵکی ئەوێ کە ماوەیەك پێکەوە زینـدانی بوین زۆر باسی ئاواییەکەی خۆیانی بۆ کردبووم سوێندی دابووم دوای ئەوەی لە زیندان ئازاد کرام سەردانی بکەم.

ئەوەشم پــێ وتیت ئێمەی خاوەن پێشینە ناتوانین لەشاری گەورەدا بژین‌و لەبەر چاوی پۆلیسدا بین.

خــەڵکیش چــیتر پیــاو قبــوڵ ناکــات، کاتــێ بنیــادەم پێــی هەڵــدەخزێ هــەمووان دەڵــێن نــەوەك بەســەر منــدا برمێــت، بۆیــە یەکــەم کــەس بــەپێ

لەقەیەك لەخۆی دورت دەخاتەوە دووەمو سێیەمو چوارەمیش...

هەر وا لەناو پاسەکەدا بەرەو چارەنوسی نادیارم ملم دەناو خەریکی نەخشە کێشانی ئایندەی خۆم بووم:

"ئێمە کە لە کۆمەڵگا دابڕاوینو تاڕادەیەك دوڕاوین کەسانێکی سەرسەرین، بەڵام باوەڕ بکەن هاوشێوەی ئێمە کەسانێکی بەشەرەفو نیەت پاکین."

شەوێکی تاریكو ئەنگوستە چاو بوو، زۆربەی سەر نشینەکان وەنەوزیان دەدا.

دەنگی پاسەکە لە بێدەنگی ئەو چۆڵەوانیەدا ڕیتمێکی ترسێنەری هەبوو کە گوێی ئازار دەدام.

ئەو کەسەی لە لامەوە دانیشتبوو، سەرو سەکوتێکی شێواوی هەبوو بەڵام پیاوێکی کەڵەگەت بوو لێم پرسی:

– کەی دەگەینە ئەو ئاواییە؟

کابرا دەستێکی بە قەفی سمێڵە شۆڕەیدا کەتا سەر چەنەی هاتبوو هێناو بە دردۆنگیەوە وتی:

– خوا... خۆی دەزانێ ئەگەر...

– ئەگەر چەتە ڕێمان لێ نەگرن بۆ بەیانی دەگەینە ئەوێ.

– چەتە؟ چەتەی چی؟

بەدەست خۆم نەبوو دەستم خستە سەر ئەو پارەیەی لە گیرفانمدا بوو وتم:

– لێرە چەتە هەیە؟

– بۆ، شوێنێك هەیە چەتەی لێ نەبێ؟ نەخوازەڵا ئەم ناوچەیەش کەهەموو شاخو کێوە، ئێرە ئەو جۆرە چەتەو ڕێگرانەی لێیە لە دنیادا وێنەیان نییە.

کابرای تەنیشتم باسیی چاو نەترسیو سەرەڕۆیی دزو چەتەکانی لەمەڕ خۆیانی بۆ دەکردم منیش وەك گونی هەلاج دەلەرزیم.

وتم:

– بۆچی، لێرە پۆلیسی لێ نییە؟

بزەیەکی بەکاکڵی کرد:

– هە... یە... بۆچی دێیەك هەیە پۆلیسی لێ نەبێ؟ هەڵبەت پۆلیس هەیەو چەتەیش هەیە! خودا بۆ خۆی ڕزقی هەر بەندەیەکی لە جێیەکەوە بۆ دەنێرێ، کاری چەتە شتێکەو کاری پۆلیس شتێکی دیکەیە دیارە هەندێجار دەست دەخەنە کاری یەکتریشەوە.

کابرا کە زانی من واقم وڕماوە پرسی:

– ئەی تۆ خەڵکی کوێیت؟

– خەڵکی ئەستەمبوڵم.

– مەگەر لەئەستەمبوڵ دزی لێ نییە؟ لەوێ گیرفانبڕو فێڵبازی لێ نییە؟

– بەڵێ، لێیەتی.

– ئەی پۆلیسی لێ نییە؟

– ئەویش هەیە.

– ئێستا زانیت، پۆلیس هەیەو دزیش هەیە، لێرەش هەر وایە، چەتە هەیەو سوپاس بۆ خوا پۆلیسیش.

– باشە ئێستا ڕێمان پێدەگرن؟

– کەس نایزانێ براکەم، ئەمە قیسمەتو نسیبە، ئەگەر ئەمشەو نۆبەی ئەم جادەیە نەبێ بێ ئارەق بۆی دەردەچین، ئەگەر نۆبەی ئێرەش بێ ئەوا تیاچووین، ئەتوت باسی بەرنامەی ڕۆشتنی کەشتیم بۆ دەکات.

ترسم لێ نیشتبوو دڵم بە بەریەوە نەما بوو.

" خوایە گیان هاوار نەکەوینە بەر دەستیان، دیسان کارێکم پێ

بسپێرن... پارەکەم دەبەن قەینا، دەترسم سەرلەنوێ توشی پۆلیس ببمەوە ماوەیەکی دیکەش ماڵوێرانو سەرگەردان ببمەوە تا دەیسەلمێنم دەمویست بچم بۆ کوێو مەبەستم چی بووە کەوڵم دەکەنەوە."

لەم بیرو خەیاڵانەدا بووم چاوەکانم قورس بوون لەپڕ دەنگی سێ چوار فیشەکێ هات، شۆفیرەکە دیار بوو چاوەڕوانی ڕودانی شتێك بوو، زۆر لێزانانە دوسێ کەڕەت سوکانەکەی باداو پاسەکەی بەدەنگێکی ناخۆش وەستاند.

سەرم بەتوندی بەر میلە ئاسنەکانی پاسەکە کەوت، ژنو منداڵەکان دەستیان کرد بەهاوارو قیژە قیژ.

پێش هەمویان شۆفێرو شاگردەکە پیادە بوون، بە دوای ئەوانیشدا سەر نشینەکانو پاشان ڕیز بوون.

لە خوار پلەی پاسەکەوە دوو کەس دەموچاویان لە گۆرەوی ژنانە هەڵکێشا بوو، پەنجەیان لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکانیان بوو.

شۆفێرو شاگردەکەی وەکو منداڵ دەستیان هەڵبڕی کەمێ قاچیان بلاو کردبویەوە.

کیفی پارە، سەعات، ملوانکەو ئەنگوستیلەی ژنانەیان لە گوێنی دەئاخنی، دوو سێ کەسی مابوو نۆبەی من بێت.

زیندانیەکان یاسایەکیان هەیە "دز هیچ کاتێ دزیی لە دز ناکات."

دەمویست پێیان بڵێم یاران منیش لەخۆتانم منیش لە زیندان گەورە بوومو فێڵبازم.

بەلام تا فریای ئەم قسەیە کەوتم یەکێ لە دواوە لولەی تفەنگەکەی خستە سەر شانم:

– دەست هەڵبڕە... خێراکە...

زمانم بەسرا، وەکو زەمبەلەکیان لەبن باخەڵم نابێ دەستم هەڵبڕیی.

دەمامکدارەکە گیرفانی پشکنیم، هەموو پارەکانم تەنانەت قەڵەم و چەقۆو چەرخەکەشی دەرهێنام بەمەش کۆڵی نەدا دەستی برد بۆ پێڵاوەکانیشم.

- پێڵاوەکانیش داکەنە!

پێڵاوەکانم تازە کڕی بوون لەم سەرماو سۆڵەیە دانەچۆقەم بوو، ئەوانەشیان ببردبایە بۆ خۆم دەبومە تەختە سەهۆڵ.

بە پاڕانەوە وتم:

- توخوا ئەمەیانم لیّ مەسێنن.

کابرا مشتێکی وەهای تێسرەوانم جەرگی تەزانم.

- خێراکە ... باوك...

- بەچاوان.

خێرا پێڵاوەکانم داکەندو وەکو منالّی هەتیو دەستەکانم خستنە بن باخەڵم و لەو لاوە بێدەنگ وەستام.

خوا خوام بوو زوتر کارەکەیان تەواو بیّ و ملیان بشکێنن تاکو بچمەوە ناو پاسەکەو ئاهێکی گەرمم پیا بێتەوە.

کاتێ سەرجەم شتەکانیان کۆ کردەوەو لەچەن ئێستریکیان بار کرد. هەندێکیان لەگەڵ ئێسترەکان رۆشتن سێ کەسیشیان بە سەر نشینەکانیان وت سواری پاسەکە ببنەوە.

دوایی خۆیشیان هاتنە ناو پاسەکەوە فەرمانی لیّ خوڕینیاندا.

هەر چوار پێنج کیلۆمەترێ ڕێمان دەبڕیو دوو سێ سەرنشینیان لەو چۆڵوانیە پیادە دەکرد. لە تاو سەرما چۆقەی ددانم ئەتوت دەستەیەکی ٢٤ کەسیی کۆنسێرتێکی گەورە ساز دەکەن، باوەڕ بکەن لەو کاتەدا لەناخەوە مەرگی خۆمم بە ئاوات دەخواست، ئاخر ئەمە ژیانی پیّ دەوترێ؟ بنیادەم ببێتە دەنکە تەسبیح لە قامکی چارەنوسدا ژێرەو زەبەر

بێت!

دوو سێ کەرەت تەکانی خۆممدا هەستم و ئامبازی یەکێ لە چەتەکان بم، بەڵکو بمکەنە قوربانی گوللەیەك و ڕزگار ببم. بەڵام، لەلایەك سەرما لەلایەکی دیکە ترسی گیانی خۆم دەتوت بەکوشنکەوە دایان کوتاوم.

پەیتا پەیتا خەریك بوو دنیا ڕوناك دەبویەوە، دیمەنی دەرەوە خەریك بوو دەبینرا، گەشتینە هەورازو ملەیەکی سەخت، لای ڕاستی جادەکە کەندو هەڵدێرێکی سەخت بوو، لای چەپی جادەکش شاخ و کێوێك تا کەمکەشانی فەلەك لوتکەیان هەڵچوو بوو.

چەتەکان فەرمانی وەستاندنی پاسەکەیاندا لەجێی خۆیان هەستان تاکو پیادە بن، یەکێکی لەهەمویان تێك سمڕاوتر فەرمانی بەدووانەکەی دیکە کردو سەری کێشایەوە ناو پاسەکەو دەستی بۆ من ڕاکێشا.

– هەستە، هەتیو، دابەزە!

من لە ترسا هەموو ئازای ئەنامم شەلاڵەی ئارەق بوو:

"ئەی هاوار ئەمانە چییان لەمن دەوێ؟"

وەکو بوکە سەماکەرە هەستام و ملم کەچ کرد، وەختێ بە بەردەمی کابرای سمێڵ فشیی تەنیشتمدا تێپەڕیم بەچاوی واق ورماو سەیرێکی سەرتاپێی کردم بەڕیتمێکی تایبەت وتی:

– بەدبەختە تیاچوو!

پیرەژنێکی قەڵەوی ورگن کە تەنها ژێرکراسێکی کەتانی تەنکیان لەبەردا هێشتبویەوە سەرێکی بەحەسەرەتەوە راوەشاند:

"بنیادەم بکەوێتە بەردەم گورگی بیابان و نەکەوێتە بەدەمی ئەم پیاو کوژانە."

ئەم قسانە بۆنی مەرگیان لێ دەهات، بۆنی ئازارو ئەشکەنجەو نەهامەتیان لێ دەهات.

باوەڕ بکەن هێندەی لەئەشکەنجە دەترسام هێندە باکم لە مردن نەبوو، لەوە ناڕەحەت بووم ئەم ڕێگرانە لە نێوان ئەم هەموو ژن و پیاوەدا چییان لە من دەویی و بۆچی منیان هەڵبژارد؟

لەبەر خۆمەوە هەرچی دوعایەکم دەزانی خوێندم و فووم کرد بەخۆمدا.

خوایە بەپشتیوانی تۆ... لە پاسەکە دابەزیم.

لە ملای جادەکەوە دوو کەسی دەمامکدارو بە چوار ئەسپەوە ئامادە بوو.

سەر دەستەی دزەکان تفەنگی گرت بەدەستەوە و چەن گوللەیەکی نابە تایەی پاسەکەوە و کونکونی کرد.. پاشان ئاماژەی بۆ ئەوانیتر کرد سواری ئەسپەکانیا بن و منیش سواری پاشکۆی یەکێکیان بکەن.

ئەسپەکان بەتاو بەرەو کوێستان دەرۆشتن، بڕستم لێ بڕا بوو، هەر ساتەو چاوەڕوان بووم ئەسپەکان ڕاوەستێنن و بمکەنە قوربانی گوللەیەك.

لە قوتابخانەی سەربازیی مامۆستایەکمان هەبوو پیاوێکی زۆر بە ئەزموون و دنیا دیدە بوو، هەمیشە پێی دەووتین:

"کوڕینە، لەهەمبەر تەنگانەدا هەمیشە پشوو درێژ بن، زۆرێك لە ڕوداوەکان لە ڕوکەشدا ناخۆشن بەڵام ئاکامی باشیان هەیە بەپێچەوانەشەوە."

نمونەی فرەی بۆ دەهێنایەنەوە، بەهەزارو یەك بەڵگە دەکۆشا فێری خۆ باوەڕیمان بکات، بۆ ئەوەی لەهەمبەر نەخوازراوەکاندا چاونەترس و بوێر بین.

ئەو دەمە هێندە گوێم بەو قسانە نەدەدا... بەڵام، لەم کاتەدا کە بێ ئاگا بووم لە وەی چارەنوسم بە کوێ دەگا، خۆشم نازانم چۆن ئەوەم بیر کەوتەوە بۆیە هۆی سەبووری و ئارامی دڵ و دەرونم.

ئێستە ئەسیر بوون لەدەستی ڕێگرەکان چۆن دەکرێ ئاقیبەتی خێر بێ؟ خۆیشم ئەمەم نەدەزانی! دنیا تەواو ڕوناك بویەوەو گزنگی خۆر دەرکەوت، دیمەنی خانووە گڵێنەکانی گوندێك لە دوورەوە دەرکەوت.

سەردەستەی چەتەکان ئەسپەکەی ڕاگرت و ئەوانەشی بەدوایەوە بوون وەستان. هەمووومان پیادە بوین، ڕێگرەکان گۆرەوییەکانیان لەدموچاویان داماڵی بوو، هەر کە چاوم بە سەرو سیمای سەردەستە کەوت ناسیمەوە. ئەو "ئاڵتانە شەل" بوو هاوزیندانی پێشووم بوو.

ئاڵتان بە دەنگی بەرز پێکەنی:

– ها... فەریدە گێل تۆ لەکوێ و ئێرە لەکوێ؟!

چوومە بەر دەمی و خۆمانە وتم:

– دەك خوا کوێرتکا.. بۆ زوتر قسەت نەکرد، ئەم ساختەچێتیە چی دەستت داوەتێ؟

– ... نەمدەویست پیاوەکانم دەرك بکەن.

من لە زینداندا خزمەتێکی فرەی ئاڵتانم کردبوو... ڕۆژێکیان سێ چوار گوندە بەگیریان هێنا بوو من لە سەرم کردەوە.

ئاڵتان بەدەست و مشتە قورسەکانی کێشای بەشانمدا:

– دەی، هاوڕێ پێت نەوتم لەم ناوە چی دەکەی؟

– کورە، بلێم چی! دەستێ چاکەت و پانتۆڵی نوێم هەبوو هێنام پێشکەشی ئێوەی بکەم!!

ئاڵتان لەم گەپە پێکەنینی هات:

– خەمت نەبێ سێ ئەوەندە هەقت بۆ دەکەمەوە... من هیچ کاتێ چاکەی هاوڕێی دڵسۆز فەرامۆش ناکەم.

پاشان دەستی بۆ گوندەکە درێژ کرد:

– ئێرە ماڵی خۆمانە... کەس نازانێ ئێمە خەریکی چ کارێکین، لەهیچ

مەترسە، دەستم بەرێ و کارمان لەگەڵ بکە، بەڵێنت پێ دەدەم بەساڵێك ببیتە ملیۆنێر پاشان هەر شوێنێکت پێ خۆش بوو بڕۆ و تا ئەو ڕۆژەی دەمریت بەخۆشی ڕابوێرە.

هەموو ئازای ئەنامم کەوتە تەزوو کردن... سەیری چارەنوسی منی نەکبەت؟ هەر ئەوەم مابوو ببمە چەتە، من خۆم لە تاو دزی و گەندەڵی سەری خۆمم هەڵگرتبوو، وەرە ئێستا توشی چی بووم؟

بێجگە لەوەی پەسەندی بکەم هیچ چارەیەکی دیکەم نەبوو... بزەیەکی زۆرەکیم بۆ کرد:

– باشە! بەڵام ترسی ئەوەم هەیە نەتوانم خزمەتێکی باش بکەم.

– نا... بە پێچەوانەوە تۆ بەم هۆش و زرنگیەوە بۆ باندەکەمان گەلێ بەسوود دەبێ، بۆ لێزانێکی وەك تۆش حەیفە تەمەنی خۆت بە شتی پڕوو پوچەوە بەهەدەر بدەی!

بڕیاری تەواومان لێداو بەرەو ئاوایی بەڕێ کەوتین، ئاڵتان ژیانێکی شاهانەی هەبوو، هەموو پێویستی ژیانێکی خۆش و ئاسودەیی فەراهەم کردبوو.

وەلێ، بۆ منێك کە دەمویست بەسەربەرزی ژیان بکەم و لەڕێیەکی حەڵاڵەوە تیکە نانێك پەیدا بکەم تێوەگلان بەکاری ئەوانەوە سزایەکی سەخت بوو.

هەر لەیەکەم ساتەوە کەوتمە بیرو خەیاڵی ڕاکرد، هەرچەن ئەوەشم دەزانی بێت و بگیرێم سەرم لە لاشەم دەکرێتەوە، وەلێ، بێجگە لەهەڵاتن چارەیەکی دیکەم نەبوو.. بەهەر کولەمەرگیەك بوو ئەو ڕۆژەم بەڕێ کرد، بۆ شەوێ ئاڵتان و هاوڕێکانی خۆیان بۆ شکار ئامادە کرد، من بە بیانوی ماندوێتی و سەرماوە لەماڵەوە بەجێ مام.

ئاڵتان بەو هەموو متمانەیەی بە من هەیبوو جلەکانمی کردە دۆڵاب و

مۆڵەتی پشوودانی پێدام.

نیوەشەو ئەوان بەڕێ کەوتن، کاتێ دڵنیابووم لە رۆشتنیان لەماڵ هاتمە دەرەوە بەهەمان ئەو کراس و بیجامەو نەعلانەوە بەو جادەیەی نەمدەزانی بەرەو کوێ دەچێت بەرەو چارەنوسی نادیارم ملی رێم گرت.

ماوەیەکی زۆر بەرێدا رۆشتم، بیرم دەکردەوە گەر بکەومە بۆسەی چەتەوە یان پۆلیس بمبینێ چ وەڵامێك بدەمەوە.

خامۆشی شەوو رێگای ناهەموارو لەهەموشی خراپتر تینی سەرما خەریك بوو لە گڵ و گۆی دەخستم کە بەدبەختیەکی دیکە بەرۆکی گرتم، هەورێکی رەش و چڵکن بەری ئاسمانی تەنی و بارانێکی بەخوڕ دایکرد.

خودایە... ئەمە چ نەگبەتیەکە خۆ ناشکرێ بەو بارانە رێگە تەی بکەم.

هەمووگیانم خوسابوو، وەك مشکی تەڕم لێ هاتبوو ناچار خۆمدایە پەنای گاشە بەردێك...

لەو دیو گاشە بەردەکەوە ئەشکەوتێکی بچوك هەبوو، خۆم پیاکردو سەیرێکی دەوروپشتی خۆمم کرد نەوەك ئاژەڵێکی درندەی تیا بێ و پەکالآم بکاتەوە.

لەسوچێکەوە بوخچەیەك سەرنجی کێش کردم، بە وریایی چوومە پێش و بەئەستەم دەستم لێدا پاڵتۆیەکی تیا بوو.

بە پەلە خۆم رووتکردەوە کراس و بیجامەکەم داناو پاڵتۆکەم لەبەر کرد، کەمێ گەرم بوومەوە، وەلێ، نەمدەزانی سەرە شکاوە پێچراوەکەم چی لێ بکەم، تەڕایی و سەرما کاری لە برینەکەی سەرم کردبوو زۆر ئازاری دەدام.

دانیشتم دەستم خستە بن هەنگڵم بۆ ئەوەی کەمێ برینەکەم هێور بێتەوە سەرم بەملاولادا دەخست.

نازانم چەندێك بەم حاڵەوە مامەوە لە بەر بێخەویی هۆشم بەخۆمەوە نەبووز ژانە سەرەکەشم هەدای نەدەدام، بەدەم ئەم ئێش و ئازارەوە ڕەنگە وڕێنەم کردبێ و گلەییم لە بەختی خۆم کردبێ، لەپڕ دەنگێکم بیست، کەچاوم کردەوە کەسێکم بینی لە بەر دەممدا وەستاوە دەچەمێتەوەو ڕاست دەبێتەوە دوعاو سەنا دەخوێنێ.

بەدەم ئەم حاڵەتە سستیەی خۆمەوە پرسیم:

– تۆ کێیت!؟

– بەندە، خاکو خۆڵی بەر پێی حەزرەتی شێخم.

واق وڕماو بووم چاوەکانم تەواو هەڵێنان ئەوەی لە بەر دەمما وەستا بوو موویەکی درێژو ڕدێنێکی ئەستوری هەبوو، بەسەرو سیمایدا دیار بوو دەروێشێکی گۆشەگیرەو بەئەداو ڕەفتاریدا تێکەشتم منی بە پیرو مورشیدەکەی خۆی زانیوە.

دیسان زۆری نەمابوو دەست بکەم بە پێکەنین، ئەگەر ڕۆژی ڕۆشن بوایە گەر زانیبام سبەی بۆ کوێ دەچم و بەرنامەم چییە هەر لەوێدا ڕێك و ڕاست دەمووت:

"مامە گیان، دەروێش گیان، لەهەڵەدای، من نەپیرو نە مورشیدم، من پاشەڵ پیسێکی لەهەموو جێ دەرکراوم لەبەر داماوی و ناچاری پەنام هێناوەتە ئەم ئەشکەوتە لەتاو سەرمایش ئەوەتا پاڵتۆکەی تۆم لە بەر کردووە."

وەلێ، لەو کاتەدا چارەیەکم نەبوو، دەبوو گوێ لە قسەکانی بگرم و بەسەر ڕاوەشاندن پشتیوانی لە قسەکانی بکەم.

دەروێش وایزانی من لە جیهانی "حاڵ"دام هێشتا ویردەکانم تەواو نەکردوون، بە ئەسپایی لە ئەشکەوتەکە چوە دەرەوە بەو سەرماو سۆڵەیە لە بەردەمی ئەشکەوتەکەدا دەستی لە بن باخەڵی داناو وەستا.

یەك دوو سەعاتێکی بەسەردا چوو، هەرچەند بیرو خەیاڵم جەمو جۆر دەکردو گوشارێکی فرەم لەمێشکی خۆم کرد دەبێ چی بکەمو چارەم چییە، هیچ ڕێگەیەکی ئەوتۆم نەپێکا، بێجگە لەوەی ماوەیەکی ئەم دەورە ببینم.

بیستبووم زۆرێك لەخەڵکی لەم ڕێگەیەوە هەموو شتێکیان مسۆگەر کردووە ئێستاش بەبێ ماندوبونی من خۆی شتەکە هاتۆتە پێشەوە ئیدی من بۆچی لەقە لەبەختی خۆم بدەم.

ڕۆژ بەتەواوی ڕوناك بوو بویەوە لەدەورو پشتی ئەشکەوتەکە گوێ بیستی ژاوەژاوێك بووم، گوێم هەڵخست بزانم چ باسە، دوو سێ شوان قسەیان لەگەڵ دەروێش دەکرد، ئەمانە ژەمی ڕۆژانەیان بۆ دەروێش هێنا بوو، دەروێش هەواڵی هاتنی مورشیدی گەورەی پێ دەدان، رایدەسپاردن هەرچی زوترە هەواڵ بدەنە خەڵکی ئاوایی نانو خواردنم بۆ بێنن..

"ئەی خوایە هاوار... خەریکە کارەکە دەشێوێ... نەکا بەجارێك بشێوێ؟"

دەروێش پریاسکەیەکی هێنایە ژوورەوە لەبەر دەممدا داینا و بەحاڵەتی ڕێزگرتنەوە وەستا، بەسەر ئیشارەتم بۆ کرد بچێتە دەرەوە، خێرا ملکەچی نواندو چوە دەرەوە.

پریاسکەکەم کردەوە نانو پیازو گۆشتی سورەوە کراو بوو، لەتاو برسێتی دەستو پێم دەلەرزین دوو سێ پاروومم لێ خوارد کەمێ هاتمەوە سەرخۆ، دووبارە پریاسکەکەم گرێ دایەوە خەریکی سەر بادانی خۆم بوومەوە.

خۆر تەواو لەدەمکەل بەرز بوو بوویەوەو ناو ئەشکەوتەکەی کردبوو بە چراخان، هەر ئەوەندەمزانی هەراو هوریا لە دەرەوە بەپا بوو.

دەنگـی پیـاو...ژن.. منـاڵ گـەنج و پـیر تێکـەڵ بـوو بـوون. کۆمـەڵێ دەیانویست چاویان پێم بکەوێ بەڵام دەروێش نەیدەهێشت.

– راوەستن، ئارام بگرن تا مۆڵەت لە شێخ وەردەگرم.

بە پەلە کەوتمە خۆ، دەروێش هاتە ژوورەوە هەروا دەستەو نەزەر لەبەر دەممدا وەستا وتی:

– چەند کەسێ هاتوون بۆ زیارەتی تۆ.

سـەرێکم بـۆ لـەقان یـانی بابێنـە ژوورەوە، دەروێـش چـوە دەرەوە بەدەپانزە ژن و پیاوەوە گەڕایەوە.

ئەوان بە رێزو شـەرمەوە هاتنـە پێشەوە دەستیان مـاچ کـردم هێنایـان بەشان و ملی خۆیانداو پاشەو پاش گەڕانەوە دواوە.

ڕەنگە ئێوە وابزانن خۆم ئەم قسەیەم ساز کردبێ، بەڵام سوێند دەخۆم راستیەو مـن هـەر بـەو ئاسـانییە بـووم، پـیری تەریقـەتی ئـەو ناوچـەیەو لەقەبی "پیری عوریان" برا بە بالأم.

دوایی زانیم ئەم پلەو پایە بڵندە هەروا لـە خۆڕا بە مـن نـەدراوە، بـەڵکو دەمێك بوو خەڵکی ئەم ناوچەیە چاوەڕوانی هاتنی پیری تەریقەت بوون و ئەم داستانەش ڕەوەنـدێکی سـەیرو سـەمەرەی هەیـەو لـە شـوێنی خۆیـدا بۆتان دەگێڕمەوە.

هەر چۆن بوو هێنـانی تەشـریفی مـن لەگـەڵ خۆشـی و شـادی خەڵکیـدا ئـاوێزان بـوون و تێکـڕای گوندنـشینەکانی دەورو بـەریش بـە لێـشاو بـۆ زیارەتم دەهاتن!!

هـەر یەکـەو خـەڵات و دیـاری خـۆی پێـشکەش دەکـردم و لەجیاتیانـدا کەمێ خاك و خۆڵی بەردەم ئەشکەوتەکەیان بۆ تەبەڕوك دەبردەوە!

زۆربەی زۆریان پێشنیاریان بۆ دەکردم بچمە گوندەکـەی ئـەوان، ئامـادە بوون تـەکێ و خانـەقام بۆ دروسـت بکـەن، بـەڵام مـن بـە سـەر ڕاوەشـاندن

نکوڵیم لێ دەکردن.

کەس نەیدەپرسی کێم و لە کوێوە هاتووم یەکێ دەیوت: "لە سەمەرقەندو بوخاراوە هاتووە." هەندێ دەیانووت: "لە شیرازو حیجازەوە هاتووە." هەندێکی دیکە دەیانووت: "پێشتر لە عەشقئاوا بووە."

هەموو بەشێلگیریەکی سەیرەوە تکایان لێ دەکردم هەر لەوێ بمێنمەوە..

من وەڵامێکی نەخت و پوختم بە پێشنیارەکانیان نەدەدایەوەو بێ ئەوەی مەرامێکی تایبەتیم هەبێ خۆمم دابویەوە دەست ڕێڕەوی ژیان، هەرچی دەبێ بەخێر بێ.

خەڵکی هەر لەو شوێنەدا خانەقایەکی گەورەیان بۆ دروست کردم و دوو پاسەوانیشیان لەسەر حسابی خۆیان بۆ دامەزراندم.

ئەو مەڕو پەزانەی ڕۆژانە بە دیاری بۆم دەهاتن هێندە زیادیان کردبوو شوانێکیان بەکرێ بۆ گرتن.

نزیکەی سێ چوار هەفتەیەك بەسەر ئەم دۆخەدا تێپەڕیی و من هێشتا نەمدەزانی لەگەڵ دەروێش ڕاوێژم چییە؟

تا ئێستا لە دە پانزە وشە زیاترم لەگەڵ نەدرکاندبوو.

لەم بێدەنگی و خامۆشیەی کە ناچار بووم وابم، خەریك بوو دڵم دەتەقی، ترسی ئەوەم هەبوو گەر خۆمانە بەو مەسەلەکەی تێگەیێنم کارەکە گەنتر بێ، گەر بمەوێ تا ئەو ڕۆژەی دەمرم ئەم دەورە ببینم ئەوا لە تەنیاییدا شێت و هار دەبم.

بۆیە زۆربەی کات بە بیانوی عیبادەت و زیکرو ویردەوە لە ژوورەکەمدا خەڵوەتم دەکردو دەخەوتم.

دەروێش بەڕێزێکی تایبەتەوە ئەرکی دەرگەوانی خۆی بەجێ

دەگەیاندو لە هاتنە ژوورەوەی خەڵکیش بە بێ مۆڵەتی خۆم ڕێگریی دەکرد.

ڕۆژێکیان دەروێش خۆی کرد بەژووردا وتی:

– ئاغا، دەیەوێ بێت بۆ زیارەتت... مۆڵەت دەفەرمووی؟

هەموو وایاندەزانی من هەموو شتێکی غەیب دەزانم بۆیە نەمتوانی بپرسم ئاغا کێیە... وتم:

– با، بێتە ژوورەوە!

من وامزانی خودی ئاغا هاتووە، وەلێ، پاش کەمێ چاوەڕوانیم کرد، دەرکەوت خزمەتکارەکەی ناردووە مۆڵەتی بۆ بخوازێو خۆی دوایی دێت.

دوای نوێژی نیوەڕۆ دووبارە بەبیانوی نوێژەوە لە ژووروەوە خەڵوەتم دەکردو خەوتبووم کە لەدەنگی هەراو زەنایەك خەبەر بوومەوە، جوان گوێم هەڵخست لەدەرەوە چەن کەسێ لەگەڵ دەروێشدا مشتومڕیان بوو. دەروێش دەیوت:

– شێخ، خەریکی زیکرو تەسبیحە تاکو تەواو نەبێت ناتوانم مۆڵەتی لێ بخوازم، کەسەکەش دەیوت:

– ئاخر باش نییە ئەو دوا بخەین.

لە مشتومڕەکەیان تێگەیشتم کاربەدەستانی فەرمی دەوڵەت هاتوون بۆ دیدەنیم، دوایی زانیم ئەمە ئاغایە...

هەر لە ژوورەوە بانگم کرد:

–لێگەڕێن با ئاغا بێتە ژوورەوە.

لەوەی کە من لەژوورێکی داخراودامو دەزانم کێ دەیەوێ بێتە ژوورەوە دەروێش گەلێ سەری بەرز بوو وتی:

– دیتان؟ مورشید ساحێب کەرامەتەو لەو دیوی دیوارەوە ئاگای

لەهەموو کاروبارێکی ئەم دنیایە هەیە؟ دیتان؟

توندتر هاوارم کرد:

– ئاغا، ڕامەگرن...

دەروێش لە دەرەوە هاتە وەڵام:

– فەرمانتە... ئێستا دێت!!

– من لەسەر تەختە دارینەکەم چۆکم داداو پاڵتۆکەم لەخۆمەوە بە توندی پێچا.

لەو ڕۆژەوەی هاتبووم ڕیشم نەتاشی بوو، بەو سەرە پێچراوو قژە ئاڵۆزکاوەمەوە هەیبەتێکی سەیرم هەبوو..

دەرگا کرایەوە، جوانخاسێك بەخۆیی و پێنج شەش خزمەتکارەوە خۆیان کرد بەژووردا...

ئاغا سەرو سیمایەکی نایابی هەبوو، وەلێ، پیاوەکانی مل هوڕو سمێڵ فش و ناقۆڵا بوون.

من وەکو پەیکەرێکی بەردین و بتێك بێ هەست و خوست دانیشتبووم، ئاغا تەعزیمێکی[1] بەرزو باڵای کردو بەڕێزەوە هاتە بەر دەمم و دەستی گرتم و ماچی کرد..

منیش بەسەر ڕاوەشاندنێك هەوڵمدا دەنگم گڕو شێخانە بێت وتم:

– خوا بتپارێزێ.

– کە بەوردی دیقەتم لێدا بینیم ئاغا هێندەش گەنج نییەو تەمەنی خۆی لە چل ساڵێك دەدات.

ئاغا هەر بەو جۆرەی دەستی لەحاڵەتی ڕێزدا بە بەرۆکەوە گرتبوو وتی:

– بەندە، هاتووم تاکو لەدەم و نفوسی پاکتەوە دوعای خێر وەربگرم.

---

[1] تەعزیم: کڕنوش بردن، خاکبۆس.

لەکاتێکا بە قامکەکانم ڕیشم دا دەهێنا وتم:

– دوعای خێری ئێمە هەمیشە هەموو ئەهلی ئەم ناوچەیە دەگرێتەوە.

ئاغا، سەرێکی بۆ نەوی کردم، منیش لەدڵی خۆمدا دەموت: "بێت و ئەم ئاغایە بزانێ من کابرایەکی پاشەڵ پیسم دەبێ چی بڵێ؟"

ئاغا وتی:

–من خاوەنی گوندەکانی ئەم ناوەم، تکات لێ دەکەم هەنگاوی زەحمەت هەڵگریت و کەیلە شرەکەی ئێمەیش بە پێ و قەدەمی خۆتان پیرۆز بکەن.

– بەچاوان... کاتێك دێمە لاتان.

ئاغا، داوێنی ماچ کردم و پاشەو پاش گەڕایەوە، منیش هەروا بێ جووڵە لەجێی خۆم دانیشتبووم تەنها سەرم دەلەقاند.

چەن ڕۆژێ دوای ئەوە کە بڕیار بوو بچین بۆ ماڵی ئاغا دە کەس لە پیاوەکانی ئاغا هاتن بە شوێنمداو دە ئەسپی یەدەگیشیان بۆ پیاوەکانی من ناردبوو، بەدبەختی لەوەدا بوو من هەرگیز سواری ئەسپ نەبوو بووم، لەهەموو تەمەنمدا تا ئەو ڕۆژە ئەسپ سواریم نەکردبوو.

دڵم کەوتە لەرزین، نەکا ئەسپ هەڵمدرێ و بە جارێ ئابرووم بتکێ.

بەسەر دەستەی پیاوەکانی ئاغام وت:

– کوڕی خۆم... من هەرگیز دڵم نایەت ئازاری ئاژەڵ بدەم، هەمیشە بەپێ دەڕۆم، هەموویان بنێرەوە خۆت بمێنەوە پێکەوە بەپێ دەڕۆین..

مەکۆ، لەبەر ئەوەی هێشتبووم بەتەنها بێت و لەگەڵ خۆمدا بێت زۆری پێخۆش بوو، ئەمەش مانای ئەوە بوو من متمانەیەکی زۆری پێ دەکەم.

خێرا فەرمانیدا ئەوان بگەڕێنەوە بەڕێزەوە پێی وتم:

– ئەگەر بەلاتەوە گران نەبێ ئێمە ڕێگاکە ناوقەدبڕ بکەین لەوان زووتر دەگەین.

وتم:

- خاترجەمبە، من لەهیچ شتێ ناڕەحەت نابم.

مەکۆ، تێکڕای کوێرە ڕێگاکانی ئەو شاخ و دوندەی دەزانی بەڕێگەیەکی پێچ و پەنادا بردمی، ڕێگەیەکی زۆر سەخت و پڕ مەترسی بوو، بەڵام دەمزانی بچوکترین بۆڵە بکەم پاکو پوختە ئابڕوم دەچێ.

ئەوان لە کەراماتی من چاوەڕوانی زۆر شتی گەورەتر دەکەن.

لە دڵی خۆمدا هەزار جنێووم بە خۆمدا بەهەر فەلاکەتێ بوو بەو خڕو بەردانەدا سەرکەوتم.

نزیکەی سەعاتێ بەڕێوە بوین من خەریك بوو لەترس و دڵە ڕاوکێدا لە پێ دەکەوتم کە ئاوایی ئاغا لەدوورەوە دەرکەوت.

پاشماوەی ئەمجارەی ڕێگەکەمان نشێو بوو، پاش چەن خولەکێ گەیشتینە قەڵای ئاغا.

خودی ئاغاو پیاوەکانی هاتنە پێشوازیم و دەستی ماچ کردم وتی:

- ئەوانیتر لە کوێن؟

مەکۆ، لە جیاتی من وەڵامیدایەوە:

- ئەوان بەڕێوەن.

لەڕاستیشدا ئێمە لەوان زوتر گەیشتبوین، ئەمەش ئاغاو پیاوەکانی سەرسام کردبوو.

چوینە قەڵای ئاغاوە، لەدیتنی ئەوماڵە نایاب و کەل و پەلە شاهانەو ئەنتیکانە مات و حەیران بووم.

هۆڵەکەی لە هۆڵی ملیۆنەرەکانی ئەستەمبوڵ شیکتر بوو، کتێبخانەیەکی گەورەی تەژی لە کتێبی زانستی و هونەری تێدا بوو.

قاوەیان هێنا، سەری قسە دامەزرا، ئاغا دەیوت لە ساڵێکدا تەنها سێ مانگی لێرە دەژی و ئەویتری لە ئەستەمبوڵە، دوو کوڕی لە بەریتانیا

دەژین و کچەکەیشی لە سویسرا شووی کردووە، سەرسامی من سات بە سات زیاتر دەبوو، پیاوەکان نیو سەعات دوای ئێمە گەیشتنە جێ.

دوای تاوێك یەکێ لەپیاوەکانی هاتە ژوورەوە وتی:

– نانی نیوەڕۆ ئامادەیە.

ئاغا، پیاوەکانی مەرەخەس کردو بە ڕێزێکەوە ڕێنمایی کردم بۆ ژووری نانخواردن، تا ئەو کاتە هەرگیز لەتەمەنمدا خوانی ئاوا ڕازاوەم نەدیتبوو.

لەسەر مێزەکە چەندین جۆری خواردن ڕیز کرابوو، لەناوەڕاستیشدا سینیەکی پڕ لەخواردنەوەی هەمەجۆر دانرا بوو، ئاغا پێکێکی پڕ کرد وتی:

– تۆ چ مەشروبێك دەخۆیتەوە؟

من بە ڕوخسارێکی بێزەوەر سەرێکم ڕاوەشاند:

– ئەم جۆرە خواردنەوانە بۆ ئێمە حەرامە.

بریا زمانم لاڵ بوایەو ئەوەم نەوتبایە، ڕێزی خۆمم بگرتایە، هەر کە ئەم قسەیەم بە زاردا هات ئاغا، بە ڕیتمێکی تایبەتەوە وتی:

– سەگباب... لەگەڵ منیش درۆ دەکەی؟

لەم قسەیە سەر تاپێم هاتە لەرزین، وامزانی گاڵتە دەکات، بەڵام کاتێ لە چاوەکانی ورد بوومەوە بینیم زۆر بەڕاستێتی...

کۆشام، خۆم نەدۆڕێنم، بزەیەکی کاڵ و کرچم کردو وتم:

– ئێوە فەرموون نۆشتان بێ بەڵام لە من ببورە...

قیڕاندی:

–گەماڵە پیر، ها... بیگرە بیخۆ لەگەڵ تۆمە...

بەم فەرمانەی دواجار جەرگ و هەناوم داتەپی لەژێرەوە سەیرێکی چاوەکانیم کرد.

سیمای ڕێك وەكو دڕندەیەكی كێویی بوو. بۆم دەركەوت بێجگە لەملكەچیی بۆ فەرمانی ئەو هیچ چارەیەكی دیكە شك نابەم، نەمدەزانی ئەم گۆڕانە كتوپڕەی مانای چی بوو، چۆن بوو ئاغا بەو هەموو ڕێز لێ گرتنەی منەوە هەروا بەجارێ گۆڕا.

بێ ئەوەی ورتە بكەم پێكەكەم هەڵگرت و یەك بینە هەڵم چۆڕاند.

زۆر حەزم دەكرد زوتر بزانم دوای ئەو هەموو ڕێز گرتنە ئەم ڕەفتارەی ئەو بۆچی گۆڕاوە؟

ئاغا، بەگەرمی دیقەتێكی دام و وتی:

– ئافەرین، گەر نەتخواردایەتەوە هێندە مشتەكۆڵەم لە پشتە ملت دەسرەواند خۆتت پیس بكردایە.

پێكی دووەمم هەڵدا، ئەمجارەیان ئاغا بەدەستی خۆی مەزەی كرد بە دەممەوە وتی:

– ئێستا خاترجەم بووم ئەم كارەت لێ دەوەشێتەوە!

زۆر بەئاڵۆزی قسەی دەكرد، هێشتا نەمدەزانی مەبەستی لە "ئەم كارە" چییە؟

لە خەیاڵی ئەوەدا بووم. كە خوایە ئەمە چ بەڵایەكە توشی بووم؟

ئاغا پێكی سێیەمی بۆ پڕ كردم و پرسی:

– چۆن بوو ڕێت كەوتە ئەم ناوە؟

نەمدەزانی چی پێ بڵێم، ڕاستیی پێ بڵێم یان كەمێ درۆی تێكەڵ بكەم.

ئاغا، لەقسەكاندا كاراسانی بۆ كردم وتی:

–تا ئێستا زیندانی كراویت یان نا؟

بزەیەكم كرد:

– ببورە. جەناب كارم بە زیندان چییە؟

وتی درۆم لەگەڵ مەکە، سەرتاپێت دیارە خاوەن پێشینەیت.

بێدەنگ بووم وەك ئەوە بوو ئاغا ئاگای لە هەموو ژیانی من بێت.

بە پێکەنینەوە وتی:

– ئەگەر زیندانت نەدیتبێ ناهێڵم یەك خولەك لێرە بمێنیتەوە.

زانیم ئەم قسانەی بەڕاستیە ناکرێ درۆی لەگەڵ بکرێ.

– ڕاستت دەوێ چەن ڕۆژێ زیندانی کراووم.

ئاغا، تیری خۆی هاویشتو بە قاقای پێکەنینەوە وتی:

– ماشەڵڵا ئێستا هێندە پیاوچاکیت نوێژ لەسەر داوێنت دەکرێ، باشە بڵێ بزانم بۆچی زیندانی کرایت؟

خۆ نەدەکرا بڵێم لەسەر فێڵبازیی... وتم:

– لەگەڵ کەسێك شەڕم کرد.

– تۆ لێت نایە لەخەڵك بدەی، ڕاستی بڵێ، دیارە دزییت کردووە؟

– ڕاستیەکەی لە خوتو خۆڕایی بە تۆمەتی فێڵبازیی زیندانی کرام.

– ئەها... ئەمەیان تەواوە، چیتر لەتۆ ئەولاترمان دەسگیر نابێ! من لەئاسماندا بۆت دەگەڕام لە زەوی چنگم کەوتیت.

پرسیم:

– ببورە... دەکرێ بفەرموی بۆچی بەدوامدا دەگەڕایت؟

– ئێمە هەمیشە کەسێکمان پێویستە خەڵکی سەرگەرم بکات، بەر لە تۆ کەسێك لێرە بوو، وەلێ، نەیتوانی بیباتە سەر پەتی کەوتە سەر ئاو، بەڵام تۆ بەجوانی دەسبەکار بویت گەر بتوانی هەر بەمجۆرە بچیتە پێشەوە تا کۆتایی تەمەنت نانت کەوتۆتە ڕۆنەوە.

کاتێ پیاوەکانم هەواڵیان هێنا کەسێکی ڕوتو قووت لە ئەشکەوت پەیدا بووە نایەوێ ڕوو بکاتە ئاوایی زۆر دڵخۆش بووم لە دڵی خۆمدا وتم دیارە ئەمە یەکێکە لەو ساختەچیانە.

فەرمانم پێکردن پێویستیەکانی ژیانت بۆ دابین بکەن بۆ ئەوەی ڕێزت لای هەمووان زیاتر بێت هاتم بۆ دیدەنیت.

ئەمە یاسایەکی گشتیە، ئاغاو شێخ دەبێ هەمیشە دور لەخەڵکی ژیان بکەن.

کوێر ئۆغڵی وتەنی:

"لەوەتەی دیموکراسی هاتۆتە کایەوە گەورەیی فەوتاوە."

هەر گەورە پیاوێ هامشۆو ڕەوتی خەڵکی بکاتو ڕووی خۆشیان بداتێ ڕێزی کەمتر دەبێتەوە... شێخی پێشوو چونکە پەیڕەوی لەم یاسایە نەکرد ناچار بوو شەو لێرە بۆی دەرچێ.

پرسیم:

- پەیڕەوی لە کامە یاسا نەکرد؟

وتی:

- سێ یاسا هەیە دەبێ بەوپەڕی دیقەتەوە پەیڕەوی لێ بکەیت بۆ نمونە کەسێ دەیەوێ لە زینداندا هیرۆیین بفرۆشێت دەبێ سەرەتا چی بکات؟

یەکەم دەبێ لەدەرەوە فرۆشیارێکی هیرۆیین زامن بکات.

دووەم لە زینداندا دەبێ کەسێکی بەهێز بێت هەمووان ڕێزی لێ بگرن.

سێیەم دەبێ کاربەدەستانی زیندان لەژێرەوە ئاگایان لەم مەسەلەیە بێت.

ئەم کارە وەکو پایە بنەڕەتیەکانی بینایەکە، گەر یەکێ لە پایەکان لاواز بن، ئەوا لە ناو زیندانەوە فرۆشتنی هیرۆیین مەحاڵە.

کاری تۆیش کتومت وەك ئەمەیە، سەرەتا دەبێ دڵی ئاغای ئەم ناوە ڕازی بکەی کە ئێستا لەبەردەمتدا دانیشتووە تەواو لەگەڵ تۆدا کۆکە.

دووەم، قەدرو ڕێزی خودی خۆتە کەئێستا خاوەنی ئەو ڕێزەیت،

هەموو خەڵکی ناوچەکە بەشێخێکی گەورەو ساحێب کەراماتت دەزانن.

ئێستا لەهەموو کۆڕو ئەنجومەنی ئەم ناوچەیە باس هەر باسی تۆیە، خەڵکی قسەی سەیرو سەمەرە دەکەن ئەڵێی پێکەوە پێشبڕکێی درۆیان هەیە، هەرچەن هەموشیان دەزانن قسەکانیان درۆیە دەکۆشن بەهەزار سوێندو ئایەت کەراماتو کاری ناباوەڕیی بدەنە پاڵ تۆ.

هەر ئەمڕۆ کە تۆ بەڕێگەی شاخو ناوقەدبڕدا هاتویتو پیاوەکانی من درەنگتر لە تۆ گەیشتونەتە جێ بۆتە مقۆ مقۆی ناو خەڵکیو تەنانەت چەن کەسێ سوێندی ئەوە دەخۆن بەچاوی خۆیان تۆیان بینیوە بەسەر هەورەکانەوە فڕیویت.

ئەم خەڵکە خوویەکی سەیریان هەیە، جاری وا هەیە ئەو شتە بە جۆرێ لێ دەکەن خۆشیان لێیان تێکدەچێ باوەڕ بە درۆکەی خۆیان دەکەن.

شێخەکەی پیشوو دووچاری ئەو بەدبەختیە بوو، تۆش دەبێ ئاگات لەخۆت بێ، خۆتت لەبیر نەچێ یانی لەخۆت بایی نەبیت، ئەگینا بەناشیرینترین شێوە لێرە دەرت دەکەن سەر لەنوێ ئاوارەو دەر بەدەر دەبیتو دەست دەکەیتەوە بە دزی کردنو جارێکی دیکە دەبیەوە میوانی زیندان.

پرسیم یاسای سێیەم کامەیە؟

ئاغا سەرێکی راوەشاند:

– یاسای سێیەم ڕازی کردنی دڵی پۆلیسە.

هەر کە ئاغا وشەی پۆلیس لەدەمی ڕەها بوو من هێندە دڵم داخورپا خەریك بوو سەکتە بکەم.

هەی دادو بێداد... من هەرچەن لەدەستی پۆلیس ڕا دەکەم چارەنوس بەوانەوە گرێم دەداتەوە.

ئاغا کە زانی من ڕەنگم تێکچوو خەم دایگرتم وتی:

– چییە... ئەڵێی ناوی جنۆکەم بردووە...؟ پۆلیس بۆ ئەوە نابێ لێی بترسیت؟ ئەگەر لەپاشەڵی خۆت دەترسیت خاترجەمبە تا ئەوکاتەی لەبەرژەوەندی ئەوان کار بکەی هەقیان نییە بەسەرتەوە، کاربەدەستانی دەوڵەت نایەن بەم ناوەدا.

تەنها نوێنەرانی پەرلەمان نەبێ ئەویش کاتی هەڵبژاردنەکان دێنە ئێرەو ئەمەش یەکێکە لەدژوارترین ئەرکەکانی تۆ کە دەبێ بە کارامەیی دەوری خۆت ببینی.

لەداوێکی باش کەوتبووم وتم:

– ئاغا ئەو کەسەی بیرت لێ کردۆتەوە من ئەوە نیم من شایستەی شێخایەتی و ئەم گەڕبازییەم نییەو من کەسێکی خاوەن پێشینەو تەڵەکەبازم، هەموو کەسیش دەمناسن هیچم لێ ناوەشێتەوە... لێگەڕێ بچم بەلای کارە خۆمەوە.

– بۆچی وادەزانی ماڵی پورتە هەرکات ئارەزوت کرد بێیت و هەر کاتێکیش بێ تاقەت بوی ئۆغر بکەی... بۆ دەکرێ یاری بە ئەقڵی ئەم خەڵکە بکەی.

دەبوو پێش ئەوەی بکەوتیە نێو چاڵ ئەم بیرو خەیاڵەت بکردبایەوە نەك ئێستا کەهەموویان بە پیری تەریقەتی خۆیانت دەزانن و تاکە ئومێدیشیان هەر تۆیت.

بە پاڕانەوە وتم:

– خۆ ئاسمان تەختی زەوی نابێ ... یان زەمین لەرزە ڕوو دەدات ئەگەر من ئەستۆی خۆم بشکێنم و بچم بەلای کاری خۆمەوە، یەکێکی دیکە بەرز بکەنەوە.

– جارێ لە تۆ باشترمان دەست ناکەوێ لەهەموو رویەکەوە بێ کەم و کورتی بێت، خۆ ئەگەر دەستیشمان بکەوێ ئەوا ماوەیەك دەخایێنێ

ئێمەش قایل نین تەنانەت رۆژێك چییە بەبێ شێخ بین.

وتم:

– مەبەستت چییە؟ بۆچی ناتوانن بەبێ شێخ بن؟

خـۆ دیـارە، خــەڵکی ئێـرە پزیـشکیان نییــە، مامانیــان نییــە، داوو دەرمانیـان نییـە، پارە ئـەوە هـەر هـیچ، هـیچ نـەبێ خـۆ دەبـێ شـێخێکیان هەبێ ئێش‌و ئازارەکانیان تیمار بکات.

هەبونی تۆ بۆ ئەمانە مایەی ئومێدە بۆیان، ئەمانە کە خاك‌و خۆڵی بەر پێـی تـۆ بـۆ تەبـەڕوك دەبـەن، بێـت‌و هیـوابڕاو بـن یـاخی دەبـن دەبنـە دەردەسەریی بۆ منیش‌و بۆ دەوڵەتیش، منیش بۆیە هاتم بۆ دیدەنی تـۆو لەبەرچاوی ئـەوان دەسـتم مـاچ کردیـت، هـەی دەبـەنگ مـن لـە پایتـەخت جوابی سەلامی مل هوڕەکانیش نادەمـەوە نـەخوازەلا بکا بـەوەی ڕێزیـان لـێ بگرم یـان دەسـتیان مـاچ بکـەم، بـەلام لێـرە لەبـەر برەوی کـاری خـۆم لەبەردەم دزێکی پاشەڵ پیسی وەك تۆدا چۆکم بۆ دادایت.

هــەم مــن‌و هــەم ئاغـایش ســەرخۆش بـوین، کەچــی بــەو حاڵەشــەوە حەوسـەڵەمان بـاش کـاری دەکـرد، لـەو حاڵەشـدا پێکـەوە بەڵێنمانـدا مـن بەچوسـت‌و چـالاکیەوە خـەریکی کـار بم ئاغـایش کـارێکی وا ڕێکبخـات لەگەڵ فەرماندەی پۆلیسی ناوچەکە دیمانەیەکمان بۆ ساز بکات.

ئـەو شـەوە هێنـدە سـەرخۆش بـووم نـەمتوانی بێمـەوە بـۆ خانـەقا، بـۆ سبەینێ ئاغا بۆ گەڕانەوەی من تەشریفاتێکی نایابی ڕێك خستبوو، دە پانزە خزمەتکاری بۆ بەڕێکردنم ئامادە کردبوو.

من دەمویست دیسان سواری ئەسپ نەبم‌و بەپێ بەڕێگە شاخاویەکەدا بڕۆم کەچی ئاغا چپاندی بە گوێمدا:

– دەبـەنگ، لەمـسەرەوە بـەپێ بـڕۆی هـەورازە لانیکـەم هەشـت سـەعاتە ڕێیە ناتوانی بەپێ بیبڕیت، من کە لەئەسپ دەترسام وتم:

– ئەی چارم چییە؟

ئاغا فەرمانیدا پیاوەکانی خۆی هەوساری ئەسپەکەی من ڕاکێشن. کاتێ دەمویست سوار ببم خۆی هات و ڕکێفەکەی بۆ گرتم.

چپاندم بەگوێیدا:

–ئەو قسەو جنێودانە دوێنێ چی بوو ئەم ڕێزو تەقدیرەی ئەمڕۆ چییە؟

ئاغا پێکەنی تەعزیمێکی کردو بەئەستەم لە بەر خۆیەوە وتی:

– دەبێ من ڕێزت لێ بگرم تاکو خەڵکی بکەوجێنم.

بەڵام ئاگات لەخۆت بێ خۆت لەگێلیی نەدەی لەخۆت بایی نەبیت تەوقی سەرت لە زەوی دەدرێ.

لەو ڕۆژە بەدواوە ژیانی من جۆرێکی دیکە گۆڕا، پەردەی فەرامۆشی کە چەن هەفتەیەك بوو بەسەر کردارو بیرو خەیاڵمدا کشا بوو ڕەوییەوە.

تاکو نەچوبومەماڵی ئاغا جار جارەیەك خۆمم لێ دەگۆڕا، ئەو کاتەی گوندییەکان دەس و دیارییان بۆ دەهێنام و داوای دوعایان لێ دەخواستم خۆمم فەرامۆش دەکرد، وامدەزانی بەڕاستی پیاوێکی شەریف و ئەولیای خوام، بەڵام ئەمجارەیان بۆ ساتێکیش لەخەیاڵی دەغەڵبازیو دیتنی ئەو دەورەی پێم سپێردرا بوو غافڵ نەبووم.

شەوانە کە بێدەنگی باڵی بەسەر هەموو لایەکدا دەکێشا بیرو خەیاڵی سبەینێ و ترسی ئەوەی ئاقیبەتی کارم بە کوێ دەگات دڵ و دەرونی دەهەژاندم.

بۆ ئەوەی خۆم لەدەست ئەم بیرو ئەندێشانە ڕزگار بکەم پەنام بۆ مەی خواردنەوە دەبرد، بە ڕۆژدا زۆربەی کاتەکان بە بیانوی نوێژو زیکرەوە خۆم دەخزانە ژوورەوە لێی دەخەوتم، لەو کاتانەدا کەس مافی هاتنە ژوورەوەی نەبوو، دەروێش گەلێ بەپەرۆشەوە ئەرکی پاسەوانی خۆی

ئەنجام دەدا.

رۆژێکیان کە لەخەڵوەتتدا بووم خەریکی خواردنەوەی شەراب بووم دەروێش بەپێچەوانەی هەمیشەی خۆیەوە بەبێ مۆڵەت خۆی کرد بەژووردا.

من لەو جورئەتەی ئەو ڕاچڵەکیم، ئەگەر کاتێکی دیکە بوایە دەرسێکی وەهام فێر دەکرد تا مردن هەڵەی وای نەکردایەتەوە، بەڵام ئەو رۆژە بە دوو هۆکار نەمتوانی ورتەم لێوە بێت، یەکێکیان ئەوەی خوانی مەشروبەکەم لەبەر دەمدا بوو، دووەم دەمزانی هەواڵێکی گرنگی پێیە ڕەنگە هەواڵەکە زۆر پەلەو مەترسیدار بێت.

دەروێش کەخوانی مەشروبەکەی بینیم هیچ بەلایەوە سەیر نەبوو دەتوت دەزانێ من لە چ حاڵێکدام.

بەشپرزەیی دەموچاویدا دیار بوو، هەواڵەکە گرنگەو بۆ ئەو کارە گرنگە ناچارە بەپەلە خۆی بکات بەژوورەکەمدا.

بێ ئەوەی پۆزش بێنێتەوە یان چاوەڕێی پرسیاری من بێت وتی:

- فەرماندەی پۆلیس دەیەوێ بێت بۆ دیدەنیت.

لەبیستنی ناوی فەرماندە وا پەشۆکام زۆری نەمابوو سەکتە بکەم.

بە پەشێواوی پرسیم:

- کاری بە من چییە؟

دەروێش بێدەنگ بوو، منیش لەدەریای بیر کردنەوەدا نووقم بووم! ناشێ لەحاڵی من بزانێ و بۆ گرتنم هاتبێ؟

تێکرای ئەو تەشریفات و ڕەفتارانەی پێشتر بەکارم دەهێنان خستمە ئەولاو لە دەروێشم پرسی:

- ئەم فەرماندەی پۆلیس چ جۆرە پیاوێکە؟

دەروێش لەوەی کە من نایناسم زۆر سەرسام بوو وتی:

– مەگەر تا ئێستا چاوت پێی نەکەوتووە؟

– نا.

– ئەی چۆن هاتویتە ئێرەو بویتە شێخ.

نەمدەزانی چی پێ بڵێم، وچانێکم گرت و وتم:

– کاری من لەسەرەوە ڕێکخراوە پێویستم بەدیتنی ئەوانە نییە.

دەروێش پێکەنینێکی تویکڵداری کرد کە هەزار مانای لێ دەکەوتەوە وتی:

– وا باشترە لە پێشدا وەڵامی نێردراوەکەی نەقیب بدەیتەوە دوایی قسە دەکەین!

نەمدەزانی چ وەڵامێکی بدەمەوە بەدەروێشم وت:

– بە بڕوای تۆ چی لێ بکەین باشە؟

– بفەرموو باتەشریفی بێتە ژوورەوە، بەبێ ڕەزامەندی ئەو هیچ شتێ لێرە سەر ناگرێ.

بەسەر ئاماژەی باشەم بۆ کرد، کاتێ دەروێش ویستی بڕواتە دەرەوە وتم:

– خێرا بگەڕێوە کارم پێتە.

دەروێش ڕۆشت من کەوتمە گێژاوی بیرو ئەندێشەوە.

"خودایە... من چارەم چییە؟ ئەمانە چ وەیشومەیەکن توشیان دێم، ئەگەر بمناسێت دەمکاتە چ مەسخەرەیەك؟.

هەتا دەروێش بڕیاری هاتنی جەنابی نەقیبی ڕێکخست و گەڕایەوە من نیوە گیان بووم.

هەر کە هاتە ژوورەوە ئاماژەیەکم بۆ کرد دانیشێت ئەویش بێئەوەی ورتە بکات بەرامبەرم چۆکی داداو پیاڵەیەك ئاڕەقم بۆ ڕاگرت.

– بخۆرەوە، با کەمێ کەیفت ساز بێت.

پیاڵە ئارەقەکەی لێ وەرگرتم‌و بە قومێك نۆشی کردو بە لەپی دەستی سمێڵە شۆڕەکەی سڕیی، چاوەکانی حاڵەتێکی سەیریان هەبوو. بنیادەم نەیدەتوانی چەن ساتێ لێیان ڕامێنێ.

بۆ خۆیشم کە لە بیستنی هەواڵی هاتنی فەرماندەی پۆلیس هۆشیار بوبومەوە دوسێ پێکی یەك لەدوا یەکم تێ کردو دەمێ بەخۆمدا هاتمەوە پرسیم:

– باشە، ئەم عالی جەنابە کەی تەشریفی دێت؟

– ئەمڕۆ دەمەو ئێوارە.

– زۆر باشە... پێم بڵێ ئەم بەڕێزە چ جۆرە جانەوەرێکە؟

دەروێش دەستی کرد بە تاریفکردن:

– بەر لەوەی جەنابی نەقیب ببێت بە بەرپرسی ئەم ناوچەیە تەواوی ئەم شاخ‌و کێوانە پڕ بوو لە چەتەو ڕێگر، هێزەکانی نیشتمانی هەرچیان دەکرد نەیاندەتوانی جڵەویان بگرن... هەموو ڕۆژێ چەندین ئۆتۆمبیلیان تالان دەکرد، بەڵایەکی وایان بەسەر ماڵ‌و منداڵی ئەو خەڵکەدا دەهێنا وێنەی نەبوو، هەموو هەفتەیەك فەرماندەی پۆلیسیان دەگۆڕی بەڵام هیچ کامێکیان شتێکی ئەوتۆیان لێ نەدەوەشایەوە ڕۆژ بە ڕۆژ دۆخەکە خراپتر دەشێوا، وای لێ هاتبوو هەر بنە بەردێکت دەبینی دووسێ چەتەی لێ بوو کەمە کەمەش یەکتریان ڕووت دەکردەوە تا ئەم جەنابی نەقیبە تەشریفی هێنا بن‌و بنەچەی چەتەکانی دەرهێنا.

پرسیم:

– ئەم کابرایە چۆن ئەو چەتانەی بنەبڕ کرد؟

– ئەها... چەتەکان لەگەڵ شێخی پێشوو کە لێرە بوو کلکیان گرێ دابوو... شێخ دەیپاراستن، جەنابی نەقیب بەپیلانێکی تایبەت شێخی قایل کرد، بچێتە ئەستەمبوڵ، هەر کەشێخ پێی لێرە ترازاند، دەمودەست

تەسلیمی زیندانی کردو گەڕایەوە دوای نەمانی شێخیش لێرە چەتەکان کلکیان کلاّفە کردو تێیان تەقاند.

تەنها من مابومەوە لە دوای ڕۆشتنی شێخ بەسەرسەختی خۆم بەرگریم دەکرد.

دەروێش وچانێکی گرت و منیش لە بیستنی ئەم قسانە سەرم دەخولاندەوە لەژێر چاوەوە سەیرێکی دەروێشم کرد بەواق بونێکەوە وتم:

– بەخوا بەسەر هاتێکی سەیرە!

دەروێش سەرێکی راوەشاند:

– بەلێ، تاکو دوو مانگ لەمەوبەر رۆژێکیان جەنابی نەقیب پەیامێکی بۆ ناردم بۆ چاوپێکەوتن.... لەتاو تەنیایی خۆم و گوزەران لە شاخ و کێو تەنگم پێ هەڵچنرابوو، ئاغاش زۆری بۆ هێنا بووم، ئەوە بوو شەوێك چوومە لای ئاغا وتم من چارەم چییە؟

ئاغا فەرمانی کرد بچمە لای جەنابی نەقیب و بزانم چی دەڵێ...من لەخۆمەوە قسەکەم بە دەروێش بڕیی:

– بۆچی تۆ کەین و بەینت لەگەڵ ئاغا هەیە؟

– پەکوو... ئەی چۆن، بۆ بەبێ ڕەزامەندی ئاغا دزی و ڕێگریی دەکرێ..؟ بۆ مەگەر خودی تۆیش بەبێ ڕەزامەندی ئاغا هاتویتە ئێرە؟

لەناخی دڵمەوە هەزار جنێوم بەم بەخت و شانسەی خۆمدا: "تۆ سەیری من هەوارم لە کوێ هەڵداوە... تەنانەت هەناسەکانیشم دەبێ مۆڵەتی کەسانی دیکەی بۆ بخوازم!" ئاخرو ئاقیبەتی ئەم کارە بەکوێ دەگەیشت نازانم.. پێکەکانما نۆش کردو پرسیم:

– ئێ باشە دوایی چی بوو؟

– بەترس و لەرزەوە چوومە لای جەنابی نەقیب، وامزانی هەر بمبینێ

باوو باپیرم لەگۆڕ دەر دێنێ... بۆیە هەر کە چوومە ژوورەوە خۆم خست بەسەر پێڵاوەکانیدا وتم:

– هەڵەم کرد... چیتر ئەم کارانە ناکەم، مووچەیەکی بژێو مەمرەم بۆ دابین بکەو ئەگەر لەجێی خۆم بزوام ملم بقرتێنە.

جەنابی نەقیب پێکەنی و هەڵیساندمەوە:

– ئافەرین... هیچ لەو باوەڕەدا نەبووم هێندە بەماریفەت بیت هەستە من دەتکەم بە سوڵتانی کێوەکان، بەپێچەوانەی ئەوەی وتت تۆ نابێ دەست لە چەتەیی هەڵگریت بەڵکو خەریکی کاری خۆتبە بەلام دەبێ ملکەچی فەرمانەکانی من بیت.

– هەرچی تۆ بفەرمویت ملم لە موو باریکترە.

– بارەکەڵلا... دەبێ بەپەلە بگەڕێیتەوە بۆ شاخ و بچیتەوە ئەشکەوتەکەی شێخ بێ ئەوەی کەس بزانێ من تۆ پێکەوە کەین و بەینمان هەیە، من چەند کەسێکی هەواڵنێرو وێنەگر دەنێرمە لات ئەوان وێنەت بگرن، هەواڵساز بکەن و لەڕۆژنامەکاندا بلاوی بکەنەوە.

تەنها ئاگات لەوە بێ لەوەلامی هەواڵنێرەکاندا قسەی نەشیاو نەکەی نەڵێیت لەتاو برسێتی و نەگبەتی دزیی دەکەی یان نەخەڵەتابی بڵێی موچەیەکە کەمت بدەنێ دەسبەردار دەبیت؟ بێت و ئەم ڕێکەوتنە ئاشکرا بکەی وەکو سەگ دەتتۆپێنم!

وتم:

– ئەی چ وەلامێکیان بدەمەوە؟

– ها... دەڵێی من بۆ بەرگریی لە شەرەفی خۆم ئەم ڕێگەیەم گرتووە تێدەکۆشم بۆ کۆمەکی زەحمەتکێشان و ئالەم جۆرە قسە چەورو قەڵەوانە دەکەی.

بێجگە لە ملکەچیی چارەیەکم نەبوو، کورت و کۆتا گەڕامەوە ئێرەو

چاوەڕێی هاتنی هەواڵنێرەکان بووم.

خوردو خۆراکم لە لایەن جەنابی نەقیبەوە بۆ دەهات دەکۆشام موو بە موو فەرمانەکانی ئەو جێبەجێ بکەم.

من تەواو خۆمم ونکردبوو پرسیم:

– مەبەستی لەم کارانە چی بوو؟

– ئەو ئەفسەرێکی بە ئەزموون‌و دنیادیدەیە، دەزانێ ئەگەر ڕەگ‌و ڕیشەی چەتە بنەبڕ بکرێ نانی ئەویش لەت دەبێ، کەواتە چ شتێ لەچەتەیی باشترە بەڵام لەقسەی ئەو دەرنەچی.

سەرەنجام ڕۆژێك هەواڵنێرەکان هاتن، منیش هێندە بەچاکیی دەوری خۆمم بینی کە هەواڵنێری داماویش بەزەیی پێمدا دەهاتەوە وتی:

– ئامادەم لە ڕۆژنامەدا داکۆکیت لەسەر بکەم‌و لەلای کاربەدەستانیش کارت بۆ هەموار بکەمەوە.

دیسان خوا ڕەحمی کرد تەسلیمی قسەکانی هەواڵنێر نەبووم ئەگینا کارێکیان پێ دەکردم با بەدەواری شڕی نەکات، وێڕای ئەمەش ئەو دوکەڵە هەر چوە چاوم، چەن ڕۆژێ دوای ئەوە یەکەمجار نەقیب‌و دوای ئەویش ئاغا پێیان ڕاگەیاندم بەو زوانە شێخێکی باش پەیدا دەکەن پلەو پایەی منی پێ دەبەخشن.

تا ئەو ڕۆژەی تۆ هاتیت من سەعاتێ خەوو ئاسودەییم نەبوو: "ڕاستیان وتوە: لەچاوەڕوانی ناخۆشتر نییە." پێکەکانمان هەڵداو لە دڵی خۆمدا بە ساویلکەیی دەروێش‌و یاری زەمانە پێکەنینم دەهات، کەواتە لەبەر ئەمەبوو هەر کە یەکەمجار دەروێش چاوی بە من کەوت دەستی کرد بەتەعزیم کردن.

مەتەڵی بەشێخ بوونی من ورد وردە دەرکەوت.

تومەز ئەمە بوو کە ئاغا وایدەزانی من مەئموری جەنابی نەقیبم لەژێرە

شەرکیم لەگەڵ ئەو هەر ئەمەش بوو کە دوو بەدوو بوین ئەو هەموو جنێوە ساردو سوکەی پێدام.

کارەکە خەریك بوو ڕیشەی دادەکوتا ئەوەتا ئەمڕۆ بەهاتنی جەنابی نەقیب کارەکە هێندەی دیکە گەنتر دەبێ، چی بکەم... چارەم چییە؟

هێندە توشی گێژاوی ئەم خەیاڵ و ئەندێشەیە بووم بیرم نەمابوو دەروێش بەرامبەرم دانیشتووە ئاگای لە ئەداو ڕەفتاری منە.

بە خەیاڵی خۆم وتم:

"فەرماندە بەپێشینەی منی زانیوە ئێستا هاتووە دەسگیرم بکات و پەڕاوی لێکۆڵینەوەم بۆ ساز بکات، بەجوڵاندنی سەرو دەستم نیشانەی ناڕازی بوونم دەربڕیی".

دەروێش پێکەنین گرتبوی، بەدەنگی پێکەنینەکە هاتمە سەرخۆ وتم:

– باشتر وایە من جارێ پشوو بدەم با بزام تا ئێوارە چی دەبێ؟

ئێوارە کە دەروێش هەواڵی پێدام ئەوا فەرماندە تەشریفی هێنا من لەجێی خۆم ناوقەدم وشك بوو، نەمدەزانی چۆن ڕووبەڕوی ببمەوە، بچمە پێشوازی یان لەجێی خۆم نەبزووم؟

سەرەنجام بڕیارمدا پێش ئەوەی جەنابی نەقیب بێتە ژوورەوە من بەپێوە بم، بۆ ئەوەی ناچار نەبم لەبەری هەستم ئەویش وا تێ نەگات بێ ڕێزیی بەرامبەر کراوە... ئۆتۆمبێلەکەی لەبەر دەم خانەقادا وەستاو چەن کەسێکی لێ پیادە بوون.

لەتاو پەرێشانی و نیگەرانی نەمزانی کێی لەگەڵ هاتووە، چۆن ئۆتۆمبێل هاتۆتە سەر ئەم کێوە، بەتایبەت کاتێ دەنگی نەقیب بەرز بویەوە پرسی:

– جەنابی شێخ تەشریفی لە ماڵە!

هیچی نەمابوو خۆم پیس بکەم، قسە کردنەکەی لە قسەی بنیادەم

نەدەچوو لە گرمەی هەورو زریان دەچوو.

پیاوەکانی من جۆرێ شپرزە بوون نەیانتوانی وەڵام بدەنەوە، جەنابی نەقیب دووبارە بەو دەنگە سامدارەوە وتی:

– کوڕە، ئەوەك جەنابی شێخ خەریکی نوێژو زیکر خوێندن بێت؟

هیچی نەمابوو بڵێم "بەڵێ خەریکی زیکر خوێندنم."

لەساتێکدا هەموو ژیانی رابردووم هاتەوە بەر چاوم، ئاخر کوڕی باوکم تۆ چیت دابوو لە شێخایەتی؟ گەوجە، بۆ نەچوویت کارێکی پیاوانە بۆ خۆت بدۆزیتەوە؟

لەدڵی خۆمدا وتم "چۆنە لە دەلاقەی دواوە خۆم دەرکەمو تێی قوچێنم پارەشم پێیە تا کار لەکار نەترازاوە خۆم قوتارکەم؟" بەڵام گەلێ درەنگ بوو، چیتر دەرفەتی هەڵاتنم نەمابوو.

جەنابی نەقیب لە بەردەمی ژوورەکەمدا بوو، بەهەمان دەنگی بەشکۆ وتی:

– مۆڵەت دەفەرموی جەناب؟ یاالله...

بە وتنی ئەم وشەیە وەها دەرگای کردەوە گەرچی لاتەنیشتەکانی هەڵوەریی... قاچی ڕاستی بەو چەکمە گەورەو بریقەدارانەوە هێنایە ژوورەوە.

من تا ئەو کاتە بەڵاو نەهامەتیم بەسەر هاتبوو، شاهێدی دیمەنی سەیرو سەمەرەی زۆر بووم، وەلێ هەرگیز وەك ئەو ساتە نەترسابوومو دەستو پێی خۆمم ون نەکرد.

هێندە پەرێشان بووم بۆ یەکەمجار بەڕاستیو لەناخی دڵمەوە گرێدرامەوە بەخوداوە.

ئیلاهی کەرامەتی شێخی ئەسڵیم پێ ببەخشە تاکو بەدوعایەك بیکەم بە بەرد؟ پێ مەکەنە، پێ مەکەنە، ئەمە گاڵتە نییە پێشتریش بۆم باس

کردوی، ئێمەی خاوەن پێشینە باوەڕ بەو کارە درۆیینانە دێنین کە بۆخۆمان دامانتاشیوون جۆرێکمان لێ دێت وادەزانین بەڕاستی شتەکە ڕاستیەکی تەواوە.

بەدوای چەکمەی زەبەلاحی جەنابدا هەیکەلی زل و قەبەی هاتە ژوورەوە، بە بینینی ئەو سەرو سیماو بیچمەی خۆمم دۆڕاند دەسبەجێ لەبەر خۆمەوە دەستم کرد بەدوعا کردن.

نازانم فەرماندە بیری لەچی کردەوە هەرکە چاوی بە من کەوت پاشەو پاش گەڕایەوە بەیەکێ لەپیاوەکانی من کە دەستەو نەزەر وەستا بوو وتی:

– سەگباب! ئاخر لێم نەپرسیت بزانە شێخ خەریکی زیکر خوێندن نییە؟ بۆچی پێت نەوتم؟

دوایی شازللەیەکی وەهای تێسرەواند داماوە چوار پێنج کەڕەت بەدەوری خۆیدا خولایەوەو خۆی کێشا بە دیوارەکەدا.

من زۆرم لەو چەورەییانە دیتبوو، جەنابی نەقیب بەم ڕەفتارەی دەیویست هەیبەتی خۆیم بۆ دەربخات.

لە ناو زیندان و لە نێوانی هەرزەو لات و پوتەکاندا باوی ئەم ڕەفتارەیە کاتێ زیندانیەکی شەقاوە دێتە نێو زیندانەوە شەقاوەکەی پێشوو بۆ نواندنی پۆزی خۆی ئەم دەورە دەبینێ.

ئەم ڕەفتارەی نەقیب وەکو ئاگرێك بوو لە باروتی نزیك بخەنەوە ئەسەری بزوێنەرێکی بەهێزی هەبوو، بەجۆرێکی وەها منی گۆڕی بۆ ساتێك لەو حاڵەتی بێدەنگی و خامۆشیە رۆحانی و شێخێتیە هاتمە دەرو بوومەوە بەهەمان ئەو گێلەی لە زیندان لەگەڵ دەستەیەك لات و پوتی شەقاوە ڕووبەڕو بومەوە.

هەروەك لەزیندان هەرکەسێ بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی بساچێنێ ناچارە

بچێتە ژێر ڕکێفی شەقاوەیەکەوە منیش خۆم تاودا بۆ ئەوەی بەرپەرچی ئەو گوندەییەی نەقیب بدەمەوە.

وەکو مەکینەیەك تایم درابێ بەبێ ویستی خۆم دەمم کرایەوە هاتمە گۆ:

"هێی"

بەڵام هێشتا قسەکە بەتەواویی لەدەمم دەرنەچو بوو دەنگی "یٚ" لەبەینی ددانمدا گیر بوبو وەك کارەبا بمگرێ دەمم قوفڵ بوو.

ئەفسەرێك ئەم هەموو ئازایەتی و هێزو کەللە شەقییەی لێ بگێڕنەوە "شاهین چنگڵ"ی هاوپۆلیی کۆنم بوو، لە قوتابخانەی سەربازیی.

لەرزێکی بەتین سەر تا پێمی تەنی، وەکو ئاوێك بکەن بەسەر ئاگردا لەجێی خۆم سارد بوومەوە، لەدڵی خۆمدا وتم:

" ناشێ ئەویش من بناسێتەوە؟" بەزەحمەت جڵەوی خۆمم کردو بەدەنگێکی لەبار وتم:

– حەزرەتی نەقیب، بفەرموون، ئەم کەیلە شڕە دەروێشانەی من قابیلی تۆی نییە.

جەنابی نەقیب بەهەنگاوە توندەکانی هاتە بەردەمم هەردوو دەستە قەڵەو و قورسەکانی خستە سەر شانمو بەزۆر لەسەر دۆشەکەکە داینشانمەوە، بەم ڕەفتارەیشی دەیوست هاوشانی نواندنی ڕێز زەبرو زۆریش بنوێنێ.

من پیاوێکی شەڕانی نیم بەڵام لەقوتابخانەش لە هاوڕێکانیشم قبوڵ نەدەکرد، ئێستەش بە چەشتنی ئەم هەموو ڕەنج و ئازارەمەوە ئەگەر جەنابی نەقیب کەسێکی ئاسایی بوایە دەرەقەتی دەهاتم، وەلێ ئەم پلەو دەسەڵاتەی دەوڵەت کە هێزی باڵای ئەفسەرانە تواناو دەسەڵاتێکی بێسنوریان پێ دەبەخشێ.

بۆیە لای خواروم لیٚ گرت و وتم:

– تا جەناب عالی دانەنیشیٚ بەندە جەسارەتی وا ناکەم.

– ببورە من خاك و خۆڵی بەر پیێتانم.

دەنگەکانی وەك ئس. ئس س س لەدەمم دەهاتە دەر دەمویست بڵێم "ئەستەغفیر الله!"

جەنابی نەقیب لەو لای دۆشەکەوە چۆکی داداو وتی:

– هیوادارم ببوریت لەوەی کە درەنگ هاتومەتە خزمەتت.

لە کۆنەوە وتویانە: "لە بچوکان خەتایەو لەگەورەکان عەتایە."

نەمدەزانی بڵێم چی تەنها سەرم دەجوڵاندو دەنگێکی تایبەت لە دەممەوە ڕەها بوو، جەنابی نەقیب وتی:

– جەنابیٚ، خۆت هەموو شتیٚ باش دەزانی من زۆر کاتت ناگرم، هەر هێندە هاتووم لەفەیزی نەفەسی خۆتەوە لەدوعاکانت بیٚ بەشم نەکەی.

پێکەنینێك گرتبومی خەریك بوو دەتەقیم بەزەحمەت ددانم بەخۆمدا گرت.

– کوڕم هیوتی سەرکەوتنت بۆ دەخوازم، بیستومە بۆ قەڵاچۆ کردنی چەتەکان زەحمەت دەکێشی!

جەنابی نەقیب بەسەر تەعزیمێکی بۆ کردم وتی:

– لەسایەی جەنابتەوە، شوکر بۆ خوا دۆخەکە ئارامە، دیارە تاقمەکەی من کەمن ئەگەر کەسێکی وەك جەنابت نەبیٚ ئەوا ئێمەیش هیچمان لەدەست نایەت، ئەم سەر زەمینە هەوەڵ بەخواو دوایی بەتۆ سپێردراوە.

من لە سەرسامیدا خەریك بوو شاخم لیٚ دەڕوا، ئەم جەنابی نەقیبە بەم هەموو تواناو دەسەڵاتەوە زۆر بەماریفەتتر لەئاغا دەدوا.

خەریك بوو پەیتا پەیتا شەیدای قسەو ڕەفتاری دەبووم لەپڕ پرسی:

– بیستومە جەنابت ئەهلی سەمەرقەندو ئەو دەورو بەرەیت؟

باش بوو چاوەڕێی وەڵام نەبوو، ئەگینا هەر لەوێدا "ڕیسەکە دەبویەوە بەخوریی". هەروا کەچاوێکی زبرو قورسی تێبڕی بووم بۆ زیاد کرد:

– تۆ زۆر هاوشێوەی یەکێ لە هاوڕێکانی منیت.

ئەگەر بۆمبێکیان لەپەنا گوێمدا بتەقاندبایەو ئەگەر سەقفەکەم بەسەردا ڕوخابایە، هێندەی ئەو قسەیەی ئەو نەدەترسامو شپرزە نەدەبووم.

لەپەشۆکاویدا سەرم داخستو یاریم بەڕیشم دەکرد، جەنابی نەقیب کۆڵی نەدا وتی:

– توخوا بە ئەرك نەبێ کەمێ بەلای پەنجەرەکەدا ڕوو وەرگێڕن.

سەرم وەرگێرا، وەکو بەرگدروو کە قوماش دەدەنە بەر ڕوناکیو هەڵی دەسەنگێنن بەدیقەتەوە لێم ڕاماو وتی:

– کتومت هەر لەو دەچیت، ئەگەر ڕدێنت نەبوایە ڕێك لە فەرید پەتاتە دەچویت، پلشلن دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی ئەو کاتە.

هەر چەن خولەکێ جارێ وچانێکی دەگرتو دووبارە لێم ڕادەمایەوە.

ترپەکانی دڵم هێندە بە پەلە بوون خۆم گوێم لێیان بوو، دەترسام لەناکاو بمناسێتەوە.

بۆ ئەوەی بزانم ئاخۆ بەسەرهاتی من دەزانێو ئاقیبەتی هاوڕێکەی بەچی گەیشتووە وتم:

– ئێ باشە هاوڕێکەت چی بەسەر هات؟

– لە قوتابخانە دەریانکردو دەمێکە هەواڵم لێی نییە، ڕۆژێك نەبێ وێنەکەییم لە ڕۆژنامەیەکدا بینیەوە.

دووبارە قسەکەی بڕییەوە چاوی تێ بڕیمەوە.

دیاربوو ئەویش منی ناسی بویەوە، بەڵام هەردووکمان خۆمان لەگێلی دەدا. جەنابی نەقیب پرسی:

– ناشێ تۆیش فەرید پەتاتە بناسیت؟

– نەخێر من نایناسم، دەی چی کردبوو وا وێنەیان لە ڕۆژنامەدا بلاو کردبویەوە؟

نەقیب پێکەنی:

– فێڵبازیی، ئەویش نەجارێك‌و دوان بەڵکو شەو ڕۆژی سێ چوار کەڕەت.

یارییەکی مەترسیدارمان دەست پێ کردبوو، دەمویست کۆتایی پێ بێنین پرسیم:

– ئیستا لەکوێیە؟

– ڕەنگە لە بەندیخانە بێت چونکە هیچ هەواڵێکی نییە.

هەردووکمان وچانێکمان گرت‌و من وتم:

– چون بوو توشی ئەو خراپەکارییە بوو؟

نەقیب لەم پرسیارەی من گۆڕا هەناسەیەکی هەڵکێشا وتی:

– کوڕێکی خراپ نەبوو، لە قوتابخانە هەموان خۆشیان دەویست کەس بەخەیاڵیدا نەدەهات ڕۆژێ بێت‌و لە قوتابخانە دەریکەن، بەلام چارەنوس دەستی خۆی وەشاندو ئەو کوڕەی بەلاڕێدا برد، بێگومان گەر وا نەبوایە ئەفسەرێکی کارامەی لێ دەردەچوو.

گریان بەر بینی گرتبووم، خەریك بوو فرمێسکم بێتە خوار، بەزەحمەت دانم بەخۆمدا گرت وتم:

– ئەی بۆچی هاوکاریتان نەکرد؟ جەنابی نەقیب بزەیەکی وشکی کرد وتی:

– ئەو هیچی بە ئێمە نەوت کاتێ من پێم زانی کار لەکار ترازا بوو چیتر بەکەڵکی ئەوە نەدەهات شتێکی بۆ بکرێ.

پرسیم:

– ئەگەر ئێستا بێت‌و داوای یارمەتیت لێ بکات چی بۆ دەکەی؟

– فەرمانی گرتنی دەدەم!

– بە بێ ئەوەی تاوانێکی کردبێ؟

– کەسێ خووی گرت بە شتێکەوە چیتر ناتوانێ تەرکی بکات!

هەردوکمان وچانێکمان گرت، نەقیب جگەرەیەکی داگیرساند:

– لەوەی کە هاتومەتە خزمەتت بۆ بەجێ گەیاندنی ئەرکێکە پێم سپێردراوە.

ئەم قسەیەی توێکڵدار بوو، لەگەڵ ئەو قسانەی چەن خولەکێ پێشتر فەرقێکی زۆری هەبوو، جەرگو هەناوم داتەپی وتم:

"نەقیب هاتووە بمگرێتو بەندم بکات".

ئەم ڕدێنە درێـژەش نیعمەتێکی باشە بەتایبەت ڕدێنی ڕەشو پڕی منیش کە نیوەی دەمو چاوی داپۆشیبووم، ئەگەر ئەم ڕدێنەم نەبوایە نەقیب جوان دەیبینی من ڕەنگم لە ڕوو بڕاوەو دەیزانی ئەم کاسەیە بێ ژێر کاسە نییە، هەتا بۆم لووا سەرم لە گەردنمدا نووقم دەکردو یاریم بە ڕدێنم دەکرد چاوەڕێ بووم نەقیب فەرمانی دەسگیرکردنم دەر بکات.

دواتر دەرکم کرد، ئەو لە چ خەیاڵێکدایەو گرفتی ئەوەیە زوتر قسەی خۆی بکات هێندە منجە منجی کرد تا وتم:

– بەڵێ، بفەرموو چ ئەمرێکت بە من هەیە؟

– چی بێ لە تۆ نهێنی بێ نامەیەکیان لە ئەنقەرەوە ناردووە کارێکی سەختیان لێ خواستووم، کە پەیوەستە بە جەنابتەوە.

"دەك لە وەجاخدا نەمێنی، خێرا ملت بشکێنەو قسەکەت بکە، لەترسا خەریکە زراوم بتۆقێ".

نەقیب تفەکەی قووتدایەوە وتی:

– ئەمڕۆو سبەی بورهان دێتە ئێرە.

تەواو خۆمم بیرچوویەوە وتم:

– کام بورهانە؟

نەقیب پێکەنی، ئەویش یەکێکە لەو هاوڕێیانەی سەردەمی خوێ قوتابی بووین، من و فەرید پەتاتەو بورهان شەیپوریی، سێ هاوڕێی گیانی بەگیانی بوین، لە نێوانماندا ئەم لەهەموومان باشتر دەرچوو، گەلێ ژیرو زرنگ بوو، دوو ساڵ بەر لە ئێستا لەخزمەتی سوپا دەرچوو ئێستاش دەیەوێ ببێتە نوێنەری پەرلەمان.

هەناسەیەکی ئاسودەییم هەڵکێشا، لە قوڵایی مەسەلەکە گەیشتم وتم:

– هەرچی بەقیسمەتی بنیادەم بێ هەر ئەوە باشە، لە سێ هاوڕێ یەکێکیان فەرماندەی پۆلیس یەکێکیتر ئەندام پەرلەمان، نەقیب قسەکەی پێ بڕیم وتی:

– بڕیارە لەم ناوچەیە هەڵبژێردرێ هەر بۆیە بۆ دیدەنی و وتوویژ لەگەڵ خەڵکی ئەم ناوچەیە دێت، جاران گەلێ باش بوو کاندیدەکان پێویستیان بەم کارانە نەبوو، لەوەتەی یاسای دیموکراسی هاتۆتە ئەم وڵاتەی ئێمەوە کاری ئەندام پەرلەمانەکانیش شێواوە ناچارن کاتی دەنگدان پێنج شەش ڕۆژێ بچنە ئەو شوێنەی دەنگی تێدا دەهێنن و حاڵ و هەواڵی خەڵکی بپرسن...

– منیش بۆیە هاتمە خزمەتی جەنابت و ئەزێتم دایت، هەڵبژاردنی بورهانیش بەدەست تۆیە، هیوادارم ئەو لیستەی ئێمە سەرکەوتن بە دەست بێنێ، لەئێوە هیمەت و لە ئێمەش غیرەت، هەڵبژاردنی بورهان لە دەستی تۆدایە هیوادارم لەم لوتفەی خۆت دریغیمان لێ نەکەی.

– تکا دەکەم، چی لە من دەوەشێتەوە؟

– جەنابت دەتوانی زۆر شت بکەی هەر هێندە بەو خەڵکە کاڵفامە بڵێی: "دەنگ بدەن بەفلانە کەس ئیدی ئێمە بەسمانە." ئەوان هەرگیز سەرپێچی لە فەرمانی ئێوە ناکەن، ئەگەر ئێمە بڵێین دەنگ بدەن بە

بورهان ئەوان پێچەوانەی ئەوە دەکەن، تۆ بەوە تێ مەکەوە ترسیان لە من هەیە ڕێزم دەگرن، ئەمانە هەموو ساڵێ چەردەیەك پارە لە حەمید ڕەسوڵی وەردەگرن بێجگە لەقسەی تۆیش قسەی هیچ کەسێ ناچێ بە گوێیاندا، تەنانەت قسەی خەسرەو خانی ئاغایش ڕەواجی نییە.

بە واق بونەوە پرسیم:

– چۆن گوێ لە قسەی ئاغا ناگرن؟ چۆن دەوێرن سەرپێچی لە فەرمانی ئەو بکەن؟

سەرێکی لێ ڕاوەشاندم:

– بیستومە پێکەوە بەینتان زۆر خۆشە؟

– بەڵێ، پیاوێکی زۆر باشە.

– ڕاستە من پەیوەندی بەتینم لەگەڵ ئەودا هەیە، بەڵام باوەڕ بفەرموو جێبەجێ کردنی کارو باری دەوڵەت وابەستەی دۆستایەتی و خۆشەویستی نییە.

ئەنگوستی خۆم گەست، دەرکم کرد جەنابی نەقیب و ئاغا زۆر کۆك نین.

پرسیم:

– چۆن، مەگەر ئاغا مەرامێکی دیکەی هەیە؟

– بەڵێ، بەڵام خراپ تێگەیشتووە، لەگەڵ مندا پێی ناکرێ.

خۆمم لە گێلیی داو وتم:

– ڕەنگە خراپ تێگەیشتنێ لەنێوانتاندا ڕویدابێ؟

– نەخێر، ڕاستەوخۆ چوم بۆ لای وتم: "هاتووم دەستەو دامێنت دەبم، وتی: "فەرموو هەرچیت هەیە بەچاوان."

وتم: "دەبێ هاوکاریمان بکەی تاکو بورهان دەنگەکان مسۆگەر بکات."

وەك ئەوەی جنێویان پێدابێت چاوەکانی دەرپەڕاندو وتی:

– تۆ بڵێ، سێسەد سوارم بۆ ئامادە بکە دەڵێم فەرمانتە، بڵێ کوڕەکانی خۆتم بدەرێ دەیانبەم بۆ سەربازی ناڵێم نا، بڵێ ئەوانە دوژمنی قەستە سەری منن بنەبڕیان بکە بەسەر چاو، دەمو دەست هەمووی لەناو دەبەم، بەڵام ئەو داخوازییەم لێ مەکە کە دەنگ بە حەمید ڕەسوڵی نەدەین، ئەمەم لەدەست نایەت، هیوادارم دڵت لێم زویر نەبێ.

بۆیە هاتووم بۆ خزمەتی جەنابت، تەنها تۆ سەرێکمان بۆ بلەقێنی کارمان تەواوە.

– بورهان کەسێکی بەدین‌و ڕۆشنبیرە، بەتایبەت بۆ جەنابیشت خاکی بەر پێتە، ئەو کاتەی دێت بۆ زیارەتی دەستەکانت خۆێشت دەیبینیت.

لەدڵی خۆمدا وتم:

"لەعنەت لەدایك‌و باوکی پیاوی درۆزن."

جەنابی نەقیب پێکەنینێکی تایبەتی کرد وتی:

– لەبەر ئەوەی قسەو قسەڵۆکی لێ نەکەوێتەوە ئەو ڕۆژەی ئەو دێت بۆ ئێرە من نایەم، تکات لێ دەکەم کارەکەی بۆ جۆر بکە چیتر خۆت‌و هیممەتی خۆت.

ئەم ڕستەیەی کۆتایی بە جۆرێ دەربڕیی مانای ئەمە بوو: "ئەگەر ئەم کارە نەکەیت وەهاو ئەمەت لێ دەکەم!"

جەنابی نەقیب هەستاو ویستی بڕوات، لەپەنجەرەکەوە سەیرێکی دەرەوەی کردو نەڕاندی:

– ئەوە لە چ دۆزەخێکن؟

پۆلیسەکان بە پەلە کەوتنەخۆیان‌و کۆ بوونەوە، دەستەو نەزەر لەبەر دەم دەرگاکە وەستان‌و جەنابی نەقیب لەبەر دەرگا بەملکەچی‌و تەعزیمێکەوە وتی:

– جەنابی شێخ تکایە لە دوعای خێر بێ بەشمان مەکە.

کاتێ دەنگی ئۆتۆمێلەکە دوورکەوتەوە لەوە دەچوو سێ رۆژو سێ شەو نەخەوتبێتم، بەشەکەتی خۆمدا بەسەر دۆشەکەکەدا وتم: "بابە بەخوا من لەسیاسەت هیچ سەر دەرناکەم".

بیرو خەیاڵی سەیرو سەمەرە بەمێشکمدا دەهات، نەمدەزانی ئەم نەگبەتییە چۆن چارەسەر بکەم، لەدڵی خۆمدا وتم: "تا کار لەکار نەترازاوە هەڵێم باشترە، بەلاّم بۆ کوێ بچمو چۆن هەڵێم ئەمەش بۆ خۆی کێشەیەکی گەورە بوو".

مەگەر بەو سانایییە دەکرا لەچنگی ئەم فەرماندەیە دەرباز ببیت؟

نا... ئەمجارەیان بەیەکجاریی رێگەی دەرباز بوونم لێ تەنراوە، وا بەتەوقی سەردا دەدەم لەزەوی هەناسەدانیشم بیر دەچێتەوە، هەراو زەنای ریسوایی و بەدناویی ئەمجارەم دەگاتە کەهکەشانی فەلەك. بەکورتی ئەقڵم هیچ رێچارێکی نەپێکا، دیسانە وەکو جارەکانی پێشوو خۆم دایەوە دەستی چارەنوس.

ئەو رۆژەی کە بڕیار بوو بورهان شەیپوری بێت، جەنابی نەقیب بە پۆلیسێکدا پەیامێکی بۆ ناردم:

" ئەمرۆ لە ئەنقەرەوە میوانەکەتان دەگاتە مەنزڵ، تکا دەکەم لەگەڵ کۆمەڵێ لە خەڵکی ئاوایی بچن بەپیرییەوە".

هەر بەو پۆلیسەدا وەلاّمم بۆ ناردەوە کە" دڵنیا بن."

پۆلیس رۆشتو هێشتا من نەمتوانی بوو هیچ بڕیارێك بدەم، کوێخاو گوندییەکان پۆل پۆل داباریـنە سەرم هیچ کامێکیان دەست بەتاڵ نەبوو هەر یەکەو دیاری بۆ هێنا بووم.

هێندە رۆنو پەنیرو کەرەیان بۆ هێنا بووم ئەگەر ساڵێ خەریکی خواردنیان بومایە هێشتا دوایی نەدەهات.

بۆ من شتێکی جوان نەبوو بیانفرۆشمەوە، ئەگەر هەڵیشم گرتبایە

خراپ دەبوون، وام بەباشتر زانی بەسەر گوندییەکاندا دابەشی بکەم ئەم کارەش متمانەی منی لای هەمووان زیاد کردو ڕێزی گەلیّ بەرزتر کردمەوە.

دەمەو ئێواریّ بورهان شەیپوری لەگەڵ سیّ چوارێك لە هاوڕێکانیدا گەیشتن، من خۆم زۆر قورس کردو لەجێی خۆم جوڵەم نەکرد.

بورهان شەیپوری لەگەڵ هاتە ژوورەوە ڕای کردە سەر لایەکی دۆشەکەکەمو چۆکی داداو سەرەتا چمکی عەباکەم دواتر دەستی ماچ کردم.

وتم:

-کوڕی خۆم، خوا پشتو پەنات بیّ.

خۆیشم پێکەنینم بە خۆم دەهات، هیچی وای نەمابوو دەست بکەمە ملی ئەو هاوڕیّ دیرنەمو دوو سیّ ماچی تەڕو پاراوی بکەم، بەڵام خۆمم جەمو جۆر کردو وتم:

- بورهان بەگ بەخێر بێیت؟

بورهان بە جۆریّ تەعزیمی بۆ کردم ترسام سەری بدات لەزەوی وتی:

- جەنابی شێخ... نازانیت چەندە تامەزرۆی زیارەتی تۆ بووم.

پرسیم:

- هۆی زیارەت کردنی من چییە؟

بورهان کە لەمن زرنگتر بوو دەسبەجیّ وەڵامیدایەوە:

- دیارە جەنابی شێخ هەموو شتیّ دەزانیّ، بەندە لەئەنقەرەوە هیندە باسی پیاو چاکیو کەراماتی جەنابتم بیستووە کە بێجگە لە زیارەتو دەست ماچکردن هیچ ئاواتێکی دیکەم نەبوو، بەتایبەت چەن ڕۆژیّ لەمەوبەر کە خەونم پێوە بینیت، چیتر نەمتوانی ئۆقرە بگرم هەرچەن جەنجاڵیەکی زۆری ژیانم هەیە، وەلیّ هەموویم خستۆتە پشت گویّو

هاتووم بۆ دەستی ماچکردنی جەنابت.

هێندە ڕقم لێی هەستا بوو دەمویست تفێکی پاراو بکەمە سەرو سەکوتی، سەگبابە سەرو فەساڵی خۆی وا لێکردبوو هەر کەس بیدیتبا لەخشتەی دەبرد، پاشان هەرچیەکی دەوت سەیرێکی سەرو سیمای گوندییەکانی دەکرد. دەیویست تێیان بگەیێنێ چەندە ڕێز لە شێخەکەیان دەگرێ.

دوای ئەوەی قاوەمان نۆشیەوە وتی:

– جەنابی شێخ، من نوێژی نیوەڕۆو عەسرم نەکردووە، مۆڵەت دەفەرمویی لە قوژبنێك نوێژەکەم بکەم دەترسم نوێژەکانم بڕوات.

لەدڵی خۆمدا وتم: "بزانە ئەم سەگبابە چۆن ئەو خەڵکە دەگەوجێنێ". پێم خۆش بوو ڕێك و ڕاست پێی بڵێم :"ئاخر کێ نوێژی کردوە تاکو تۆ بەجێ مابێت؟"

بەڵام خۆ نەدەکرا ئەمەی پێ بوترێ، وای لەو ڕۆژەی پەردەی ساختەو ڕیاکاری دەدڕێت، پێکەنینێکی زۆرەکیم کرد وتم:

– بفەرموو نوێژەکەت لەو ژوورەی پشتەوە بکە.

لە دوای نوێژ ژوورەکەمان چۆڵ کردو چوینە سەر ئەسڵی بابەتەکە.

بورهان بەپاڕانەوەو دەسەوداماناوە دەیویست بەڵێنم لێ وەربگرێ کە پشتگیریی دەکەم، ویستم بزانم دەمناسێتەوە یان نا، مەسەلەی سەردەمی ناوەندیو ئەو بەسەر هاتانەی لەو ڕویان دابوو هێنامە ئاراوە، بورهان سات بەسات زیاتر واق دەبوو، بەڕاستی باوەڕی کردبوو من خاوەنی کەشف و کەراماتم و رابردوی هەموو کەسێ دەزانم. بەتایبەت کاتێ مەسەلەکەی نەقیب بالیۆز هەقی و تێ هەڵدانەکەی بورهانم گێڕایەوە سەرپەنجەی خۆی گەست و چیتر ئاگای لەوە نەما ئەو لەحوزوری شێخی گەورەدایە بەدەنگێکی بەرز وتی:

"ئەم سەگبابە ئەڵێی عیلمی غەیبی پێیە؟"

دەشمزانی کاتێ بڕواتەوە هەموو قسەکان بۆ شاهین دەگێڕێتەوە ئەو کاتەش بەگومانی شاهین کارەکە گەنتر دەبێ، وەلێ نازانم چ دەردێك بەرۆکی گرتبووم لەو واق بوونەی ئەو چێژم دەبینی.

دواجار بەڵێنم پێدا تەواوی دەنگەکانی ئەم ناوچەیە مافی خۆیەتی و ئەو سەرکەوتوو دەبێت.

ئەو دەورەی چەن خولەکێ پێشتر بۆ بورهانم دیتبوو ئەم بەشەی قسەکانی من بەلایەوە وەکو وەحی بوو بۆی.

زۆر بەملکەچیەوە چۆکی داداو داوێنی ماچ کردم و مۆڵەتی مەرەخەسی لێ خواستم.

– بەسەلامەتی کوڕی خۆم، هیچ خەمێکت نەبێ.

بورهان رۆشت و من تووشی ناڕەحەتی و دڵە ڕاوکێ بووم، خودایە من چی بکەم، بێت و یارمەتی بدەم ئەوا ئاغا پێی ناخۆشەو ئەزێتم دەدات، ئەگەر یارمەتی نەدەم جەنابی نەقیب گۆڕی باو و باپیرم هەڵدەتەکێنێ، وەکو باراشێکی نێوان دوو بەرداش بێجگە لە هاڕین و لەناوچوون هیچ چارەیەك نییە، بۆ منیش ڕێگەی ئومێدو دەرباز بوون نەما بویەوە.

سەریشم لەوجۆرە کارانە دەرنەدەچوو نەمدەزانی چی بکەم.

لە ترسی ئابڕوچونی خۆیشم نەمدەوێرا پرسیار لەکەس بکەم، بێت و گوندییەکان پرسیارم لێ بکەن کە ئەو کابرایە دەناسیت یان نا من چ وەڵامێکیان بدەمەوە؟ هێندە بیرم لێ کردەوە توشی ژانەسەر بووم، ئاقیبەت نەمتوانی ڕێگەی دەرباز بوون بدۆزمەوە، دڵنیابووم ئەمجارەیان دەقەومێت.

ئاقیبەت شاخم لەشاخی یان ئاغا یان فەرماندە دەگیرێت و توشی گێرەو کێشە دەبم.

جار جارێك ڕۆژنامەكانی ئەستەمبوڵم بە دەست دەگەیشت، وەلێ حەوسەڵەی خوێندنەوەی ڕۆژنامەو گۆڤارم نەبوو، هەروا چاوێکم بەسەر مانشێت و وتارەکاندا دەخشاندەوە، بەڵام ئێستا لەبەر نزیك بوونەوەی كاتی دەنگدان دەبوو ڕۆژنامەكان ببینم.

لە ڕۆژنامەکاندا بابەتیی سەیرو سەمەرە دەبینرا، لەسەر وتارەکاندا نوسرا بوو: "پەرلەمانی داهاتوو یاسای دابەشکردنی زەوی جێبەجێ دەکات".

لە داهاتودا هەموو جوتیارەکان دەبنە خاوەنی زەوی و زاری خۆیان.

بە کورتی هەر یەکێ لە کاندیدەکان بانگەشەیەکیان کردبوو بەرنامەیەکی سەرنج ڕاکیشیان پێش کەش کردبوو: "ئەگەر دەنگمان پێ بدەن ئەمەو ئەوەتان بۆ جێبەجێ دەکەین،" هەموو قسە چەورو شیرنەکانی ڕۆژنامەکانم لەبەر کردبوو تاکو لەکاتی لێدواندا بۆ گوندییەکانی باس بکەم.

نەخشەی کارەکەم دوو سێ کەڕەت لەبەر خۆمەوە تاو توێ کردبوو چارەیەك نەبوو، بێجگە لەوە لە فەرماندە بکشێمەوەو لەبەرژەوەندی بورهان دەسبەکار بم.

ئەم کارە دوو خەسڵەتی هەبوو هەم دەمتوانی سوود لە بورهان وەربگرم هەم دڵی فەرماندەش کە لە ئاغا گرنگتر بوو قایل دەکرد، بەم حاڵەش ئۆقرەم لەبەر بڕا بوو نەمدەتوانی خۆم قایل بکەم.

ئەو شەوە هەرچەن شەرابێکم هەبوو هەموویم خواردەوە، بەڵام، هەر بێ هوودە بوو، وەکو کەسێ بەیانی بیبەنە پای سێدارە دڵە تەپێم گرتبوو وەك سەماوەر هاتبومە جۆش.

کاتێ لەسەر جێگاکەم ڕاکشام بیری زیندانم کەوتەوە، ئەتوت ئلیهامم بۆ هاتووە بەم زووانە دەبێ پێخەفەکەم لە زیندان ڕابخەم.

دووچـاری وڕێنـە بـووم، وامـدەزانی سـەرجەم گوندییـەکان بـە ڕیـز وەسـتاون بـۆ وەرگرتنـی زەوی نۆبـەیان گرتـووە، کوێخـا لـە پێشی هەموویانەوە بوو فەرمانی دەدا:

– هێواش بن، بەڕیز بۆستن، مەیکەن بە هەراو زەنا، هەر کەس لە ڕیزدا نەبێ زەوی پێ نادرێ.

کەچی گوندییەکان بێدەنگ نەدەبوون، یەکێ هاواری دەکرد:

– من لە شوێنێکی باشدا زەویم دەوێ.

دووەم توندتر هاواری دەکرد:

– زەویەکەی من دەبێ لەکانیەکەوە نزیک بێت.

سێیەم:

– من زەوی دەیمم ناوێ.

– ئەوەی من دەبێ لە ڕۆخی ڕووبار بێت.

هەر کەسەو شوێنی زەوی بۆ خۆی دیاری دەکرد دواجار لە نێوانی خۆیاندا لێیان بوو بەشەڕ، پیاوو ژنو کوڕو کچ تێك بەربوون، بەپاچو پێمەڕە یەکتریان خەڵتانی خوێن کردبوو.

هاوارم کرد:

– بێدەنگ! گەر بێدەنگ نەبن هیچ کەسێ زەوی پێ نادرێ!

– من خۆم دەزانم زەوی لە کوێ‌و بەکێی دەدەم.–

لەو کەسەی لەبەر دەممدا وەستا بوو پرسیم:

– تۆ زەویەکی چۆنت دەوێ؟

– من هیچ جۆرە زەویەکم ناوێ!

– بۆچی؟

– دەترسم ئاغا گۆڕی باوو باپیرم دەربێنێ؟ ئەو کاتە ئەم تیکە نانەی ئێستاشم دەبڕێ‌و نەخێر من نامەوێ، نامەوێ، نامەوێ.

لە ناکاو هۆشم بە خۆمدا هاتەوە لەوە دەچوو ئاغام بیر چوبێتەوە دەمویست زەویەکانی ئاغا بدەم بە گوندییەکان!!

گیانم کەوتە لەرزین، ئەگەر ئاغا گوێی لەم قسانەم بێت چیم لیٚ دەکات.

نا... ئاوا بۆ چارەم چییە؟

لە ترس و نارەحەتیدا خەوم لیٚ زڕا، تابەیانی ساتێ چییە خەو نەچوە چاوم.

هێشتا دنیا تاریک و لێڵ بوو رۆژ تەواو دیاری نەدابوو بینیم لە دەرگادرا.

نازانم حاڵی ئەو زیندانیانەتان خوێندۆتەوە کە مەحکوم بەقەنارەن، بەیانی زوو قازی و سەربازو مەئمورەکان دێنە ناو زیندانەوە محکومەکە لەخەو هەڵدەسێنن کە هەستەو هەر وەسێتکت هەیە بیکە، دەزانی ئەو مەحکومە داماوە لە چ حاڵێکدایە من توشی هەمان حاڵەت بووم، ئەوەی لە دەرگای دەدا بەلای منەوە حوکمی پەیکی مەرگی هەبوو، بێگومان هەڵگری پەیامێکی ناخۆش بوو، ئەگینا وەك دەڵێن بەو بەیانی زووە خۆ باری ئاڵتون و ئەڵماسیان نەهێناوە.

هەر بەو حاڵەتەی ترس و بیمەوە وتم:

– کێیە؟ چی بووە بەم بەیانی زووە؟

یەکی لە خزمەتکارەکانم لەو دیو دەرگاوە وتی:

– قوربان، قوربان چەن سوارێك لەلایەن ئاغاوە هاتوون و کاری بە پەلەیان بە تۆ هەیە.

– چ باسە؟ بەم شەبەیخونە چی بووە؟ ئاغا چی لێمان دەوێ؟

خزمەتکارەکەم لەو دیو دەرگاکەوە وتی:

– ئاغا بەنیازە بچێت بۆ شار دەیەوێ پێش ئەوەی بڕوات ڕاوێژێك بە تۆ بکات.

خەیاڵم رۆشت بەلای مەسەلەکەی دوێ شەودا، ترسێك هەموو گیانی تەنیم وێنەی نەبوو، تەنانەت مردنیش هێندە مەترسیدار نەبوو.

"هەرچی بێ، خۆ لەمردن خراپتر نییە باهەستم بزانم چییە؟"

بەلاّم دەترسم هێندەم لێدات گیانم دەرچێت، هەرچۆنێ بوو هەستام:

"ئەم گەماڵ باوکە چۆن زانیویێتی کە من دەمەوێ موڵکەکانی دابەش بکەم".

ناشێ بیستبێتی لەگەڵ بورهان بەگدا پێکەوە دانیشتنمان کردووەو ئەو دڵی لەمە زویر بوبێ؟

پەردەکەم هەڵدایەوە سەیرێکی دەرەوەم کرد، وای چیم بینی!!

ژمارەیەکی زۆر چەکدارم بینی دەوری خانەقایان دابوو، زانیم ئەگەر بەخۆشی خۆم نەچم بە شەق دەمبەن.

بە پەلە خۆم گۆڕی و چوومە دەرەوە، نوێنەری ئاغا لەبەردەمی پلیکانەکاندا وەستا بوو، وەلێ، بە پێچەوانەی جارانەوە زۆر گرژو مۆن بوو ئەسڵەن لەجێی خۆی نەبزواو تەعزیمی بۆ نەکردم.

زانیم دۆخەکە نا لەبارە. وتم:

– بەخێر بێیت نوێنەری ئاغام!

کابرا وەکو مێخ چەقی بوو، زۆر بەساردی وەلاّمیدایەوە:

– سوپاس، ئاغا بە پەلە تۆی دەوێ.

– مەسەلە چییە، بەم پەلە پەلە؟ بۆستن تا نێویژەکەی بەیانیم دەکەم.

– ئاغا، زۆر پەلەیەتی وتی خێرا بکەونە رێ.

کەوابوو خەیاڵەکەی خۆم باشم پێکا بوو هەر بگەمە قەلاّ ئاغا چوار مێخەم دەکێشێتەوە.

دوو کەس هاتن و قاچیان هەڵبڕیم و سواری ئەسپیان کردم، من لە

ئەسپ سواریی زەندەقم چوو بوو، بەڵام، چرو چاوی پیاوەکان هێندە ترش و تاڵ بوو نەمویرا بڵێم: "من بەزەییم بە ئاژەڵدا دێتەوە دەمەوێ بە پێ ڕێبکەم دەمزانی لەکۆڵم نابنەوە".

بەدەم ڕێگاوە دڵنەوایی خۆمم دەکرد:

"کورە کێ ناڵێ مەسەلەیەکی دیکەیە من هەر لەخۆمەوە زیپڕەم بە خۆم کردوە".

"دەی باشە، ئەگەر مەسەلەیەکی دیکە لە گۆڕێیە بۆچی بەم بەیانی زووە ناردویێتی بەشوێنما؟"

هەتاکو گەشتینە قەڵای ئاغا ئارەقی مەرگ لە هەر حەوت کونەکەی گیانم هەڵچۆڕا!

کاتێ گەشتینە قەڵا بینیم ئاغا لە بەر دەرگادا وەستاوە هاتۆتە پێشوازیم، بەمەش کەمێ هۆشم بە بەردا هاتەوە.

قاچی راستم لەرکێفی ئەسپەکە دەرکردو بەڕێزێکی زۆرەوە بەدەنگی بەرز وتم.

– ئەستەغفیر الله، ببورە تکا دەکەم.

– جەنابی شێخ دیارە دەبێ ببەخشیت بەم بەیانی زووە زەحمەتم خستە بەر تۆ، دەمویست بچم بۆ شارو پێویست بوو خواحافیزییت لێ بکەم.

وتم:

– بۆچی بەم پەلە پەلە ئۆغر دەکەی؟

– باش نییە لە کاتی دەنگدانەکان من لێرە بم، ئاغا دەبێ بێ لایەن بێت و لایەنگیریی کەس نەکات.

بەدەم قسە کردنەوە چوینە ژوورەوە، پیاوەکان بەجێیان هێشتین و دوو قۆلی لەگەڵ ئاغا ماینەوە دیسان ڕیتمی قسەکانی ئاغا گۆڕا.

– باشە، هەی سەگە پیری سەگباب... بیستومە لەگەڵ بورهان بەگ کلکت گرێداوە؟

– نا، ئاغا بەگیانی تۆ ئەوە دەسیسەیەك بوو، تەنها تەمسیلێکم کرد.

– بەکورتی وریابە، نەکەی فریوی ئەمانە بخۆیت.

لەنێوانی دوو بەرداشـدا گیرم خواردبوو دەمزانی لایەکیان هەر دەمهاڕن.

ئاغا سەری شەرابەکەی باداو پێکەکانی لێوان کردو دایە دەستم.

– بیگرە نۆشیکە تاکو ڕاستیەکان بدرکێنی.

وتم:

– ئاغا، بەیانیان خواردنەوە بە سکی ناشتا باش نییە.

– بیخۆرەوە، سەگە پیر هیچ لۆتیەك جامی بەیانیان ڕەت ناکاتەوە.

– بۆ ئێوەش هەر باش نییە بەیانیان مەی بخۆنەوە!

– لێم مەبە بە دکتۆر فرییکە یالاّ.

ئاغا پێکەکەی فڕ کردو منیش بە نابەدڵی هەڵمدا، پێکی دووەمو سێیەمیش نۆشکرا، من زیاتر ئاگام لە قسەکانی خۆم بوو نەکا شتێکی خراپ بڵێمو چارەڕەش بم.

وەلێ بە پێچەوانەوە ئاغا کاتێ پێکی چوارەمی فڕ کرد وتی:

– خوا دەزانێ لەم بگرەو بەردەیە بێزار بووم، خۆزگە زوتر ئەو هەموو سەروەتو سامانەیان لێ دەساندمەوەو دڵم ئۆقرەی دەگرت، لەم کێشمە کێشی ئاغایەتیە دەکەوتم، ئەگەر ئەم دابەشکردنی زەویان زوتر دەست پێ بکات دڵم ئاسودە دەبێ، هەرکە ئەمەی وت من مەستیەکەم بەریدام: "ئاغا دەڵێ چی؟" باسی ریفۆرمی زەوی دەکا. چۆن ئەم لایەنگری دابەشکردنی زەویو زارە؟ بێگومان کەسێك قسەکانی دوێنێ شەوی منی بیستوەو هاتووەو بۆی گێڕاوەتەوە.

کەمێ چوومەوە دواوە وتم:

– خوا نەکات، ئاغا!ئەستەغفیراللە! ئەم قسانە چییە؟ دابەشکردنی زەوی‌و زار یانی چی، چۆن ماڵی کەسێك دەدرێت بەکەسێکی دیکە؟

ئاغا کەمێ تێم ڕاما.

– خوا چی نەکا؟

– تۆ نافەرموی زەوی دابەش دەکرێ؟ خوا نەکا زەوی‌و زار دابەش بکرێ!

ئاغا پەلەپیتکەیەکی لە ژێر چەنەمداو من سەرم هەڵبڕیی:

– ناپیاو... گوو بەڕیشی ئەو کەسەی تۆی کردە گەورەو گوخۆری ئێمە تۆ دەزانی دابەشکردنی زەوی یانی چی، ئەم قسانە لەکوێوە فێربووی؟

– ئاغا گیان بەقوربانت بم! خۆ ئەمە مەسەلەی بیرکاری نییە. دەیانەوێ ئەو موڵکەی بەمیرات بۆت ماوەتەوە دابەشی بکەن بەسەر ئەو کەسانەی هەمیشە نۆکەرو ڕەعیەتی تۆ بوون.

– دەی زۆر باشە لێگەڕێ با بیاندەنێ! مەگەر چارەیەکی دیکەمان نییە، ساڵانێکە من بەردی دیموکراتی لەسینەی خۆم دەدەم بۆ ڕۆژێکی وەهامە!

ئاغا پێی وابوو بەڕاستی من "گێلم" خۆیی لە پاپای ڤاتیکان بە کاتۆلیکتر نیشان دەدا دەیویست قسەم لێ دەرکێشێ، بۆ نمونە لەدەمم دەرچێ بڵێم بەڵێ ئەم گوندییانە زۆر ڕەش‌و ڕووتن هیچ دەرامەتێکیان نییە، وەلێ من هێندە کاڵفام نەبووم خۆم بدەم لەو قەرەو بەرەیە.

بە دەموچاوێکی ساختەوە کە یانی من ئەو پەڕی نارەحەتم وتم:

– شتی وا چۆن دەبێ؟ تۆیش بتەوێ ئێمە قبوڵ ناکەین، دیموکراتی‌و دادڤانی چ مانایەکیان هەیە، ئەمانە قسەی بێ دینەکانن!!

ئاغا زۆر بەجدی پێی ناخۆش بوو پەنجەی خستە سەر لێویی.

– وس س س، ناپیاوی ئەشکەوت نشین، تۆ هەقیی ئەم غەڵەتەت چییە دەم لەسیاسەت دەکوتیت، تۆ هەر لایەقی ئەوەیت قازو قەل بلەوەڕێنی، ئێستا لەگەڵ من مشتومڕی سیاسەت دەکەی؟

ئەم موڵکانەی بەمیرات بۆمان ماونەتەوە سوودیان چییە، ئەم کەژو کێوە بێجگە لە زەحمەت و ناڕەحەتی چ قازانجێکیان بۆ من هەیە، هەموو دەڵێن فلانی خاوەنی ٢٣ گوندە کەسێك نایەت حسابی قازانج و زیانیم بۆ بکات، من زیاتر لەوەی بێتە گیرفانمەوە خەرجی ئەم خزمەتکارو سوارانەی دەکەم.

ئەگەر دەمتوانی حەزم دەکرد قسەی زۆری پێ بڵێم:

"ئاخر لەقوڕی خەستت هەڵکێشم... ئەگەر ئەم گوندانە زیانیان بۆت هەیە ئەی بۆچی ڕاتکرتوون؟ بۆچی لەساڵێکدا دوو سێ مانگ کاتەکانی خۆت لێرە بەهەدەر دەدەی؟ ئەم هەموو پارەیە لەکوێ پەیدا دەکەی هەر خەرجیی سەگەگەت هێندەی بژێویی ماڵێکی پێنج سەر خێزانی دەبێ؟

بەڵام، کوا؟ کێ دەوێرێ چوار کەللە شەکری پیاوانە بشکێنێت! خوا شێتی نەکردووم من هەقم چییە؟".

تاکە شتێکی ناڕەحەتی دەکردم قسەکانی ئاغا بوو، دردۆنگی کردبووم تێ نەدەگەیشتم بەڕاستی بێت یان منی پێ تاقی دەکاتەوە.

وتم:

– ئاغا، وێڕای ئەمانەش سایەو سێبەری تۆ هەر لەسەر ئەم موڵکانە بێت باشترە.

– دەمەوێ باش نەبێت، بریا ئەو دابەشکردنە زووتر دەستی پێ دەکردو منیش ڕزگار دەبووم.

– ئاخر ئاغا، زەویەکانت لێ وەردەگرنەوە.!

– با لێم وەرگرنەوە، کێ ئەم زەوییانە بە قرۆشێ دەکڕێ؟ هیچ نەبێ خۆ دەوڵەت پارەکمان پێ دەدات، هەی لەعنەت لە باوکی من ئەگەر لە پێش هەموو ئاغاکانەوە ڕازی نەبم، پارەی خۆم وەردەگرم‌و دەڕۆم بۆ ئەستەمبوڵ‌و لەوێ سێی چل تاقم خانوی پێ دەکڕم، مەگەر ئەم ئاواییانە داهاتی ساڵانەیان چەندە؟ بەخوا ئەگەر ئەمانەم لێ وەربگرنەوە دەپانزە خانویەکم پی بدەن زۆر پێی ڕازییم.

وتم:

– ئاغا خۆ پارەی ئەو موڵکانەت بە کاش پێ نادەن!

– باشە خۆ پێشەکیم پێ دەدەن منیش بەسمە، کارێك دەکەم پارەی هەموو موڵکەکان بە ناوی پێشەکیەوە وەربگرم باقیەکەی لەسەر قازانج دەمێنێتەوە، ئەی تۆ وا دەزانی من بۆچی هێندە جەخت دەکەمەوە خۆم وەکیلی ئەم ناوچەیە بم، وادەزانی لەبەر چاوی کاڵیی حەمید ڕەسوڵی ئەم هەموو پارەیەی بۆ خەرج دەکەم‌و زەحمەت دەکێشم بۆ ئەوەی سبەی پارەی موڵکەکانم دوو بەرامبەر وەربگرمەوە.

وتم:

– ئەی بۆچی هەموو خاوەن موڵکەکان ڕازی نابن؟

– ئاخر، خۆ موڵکی ئەوان وەك ئەوانەی من نییە، هەمووی زەوی دێم‌و شاخ‌و کێو بێت؟ موڵکی ئەوان خوێنبایی بنیادەمە.

قسەکانمان گەرم بووبوو، زۆرمان لەو قسانە کردبوو، ئاغا تەواو مەست بوبو، لەپڕ قسەکە گۆڕی وتی:

– دەزانی بۆچی ئەوەندە بەپەلە ناردم بەشوێنتا؟ بڕیارە ئەمرۆ بچم بۆ ئەستەمبوڵ، مەسەلەی هەڵبژاردنی ئەمساڵ زۆر جەنجاڵە ڕەنگە خوێنی تێدا بڕژێ، مانەوەی منیش لێرە باش نییە، وەکیل‌و پیاوەکانم ڕاسپاردە کردوون، هەموویان لە بەردەستی تۆدان، ترسی هیچ شتێکت نەبێ،

بکوژو ببڕ خۆتبە، هەرچیت پێخۆشە بەدڵی خۆت بیکە پیاوەکانم ئەڵقە لەگوێن ئەمانە چ بنیادەم بکوژن چ مریشك سەربڕن بەلایانەوە یەکە، تەنیا هێندە ئاگات لەخۆت بێت نەخەڵەتێی، خۆم هەموو شتێکم تێگەیاندون، تا ئەو جێیە ملکەچی فەرمانی تۆ دەبن لەقازانجی من کار بکەی، ئەگینا بێتو بەلاڕێدا بڕۆی کارێکت پێ دەکەن با بەدەواری شڕی نەکات.

دەبێ حەمید ڕەسوڵی دەنگەکان مسۆگەر بکات، لەهاژەو هووژەی فەرماندەی پۆلیسش باکت نەبێت.

وتم:

– خاترجەمبە، هەرچیم لێ بوەشێتەوە درێغی تێدا ناکەم.

– چی، هەرچیت لێ بوەشێتەوە درێغی ناکەی؟ دەبێت ئەو دەنگەکان مسۆگەر بکاتو بڕایەوە.

ئاغا بەڕێی کردمەوە، بەڕێزو تەقدیرەوە بەهەمان ملکەچی جارانەوە لەبەر چاوی هەموویان دەستی ماچ کردم وتی:

– لە دوعای خێر بێ بەشمان مەکە جەنابی شێخ.

لەگەڵ سوارەکان گەڕامەوە، حاڵەتی کەسێکم هەبوو دەیبەنە پای سێدارە.

زۆر حەزم دەکرد سەری خۆم هەڵگرمو قازانجەکانی لەژێر پێ نێم، ئەو بڕیارەشمدا، لەدڵی خۆمدا وتم:

"کاکی خۆم، هەتا کار لەکار نەترازاوە تێی تەقێنە، شەوێك نیوەشەوێك پارەکەت هەڵگرەو بڕۆ، ئیدی مانەوەی ئێرە بۆ تۆ دەست نادات. ئاقیبەت لەم دووانە یەکێکیان سەرکەوتن بەدەست دێنێ و تۆش دەکەویتە داوای دووەمیان".

ئەم نەخشەیەم پەسەند دا، لە ڕێگاش لەدڵی خۆمدا هەر بیرم لەمە

دەکردەوە پلانی ڕاکردنم دەکێشا.

کاتێ گەیشتمەوە خانەقا سوپاسی وەکیلەکەی ئاغام کرد وتم:

– زۆر مەمنون خواحافیزتان بێت.

بەڵام وەکیل زۆر بەگرژو مۆنیەوە وتی:

– ئاغا فەرمانیداوە چەن کەسێ لەسوارەکان لەخزمەتی تۆدا بن تا دوای هەڵبژاردن پارێزگاریت لێ بکەن.

جەرگو هەناوم داتەپی، هەموو پیلانەکانم هەڵوەشا، ئاغا لەمن زرنگتر بوو.

وتم:

– نا، بابە گیان ئێمە ئازارمان بۆ کەس نییەو کەسیش کاری پێمانەوە نییە.

– ڕاستە، بەڵام کاری دەنگدانیش هەروا هەوانتە نییە، ڕەنگە خوانەکردە توشی جورتمێکت بکەن.

پاشان بێ ئەوەی چاوەڕوانی قسەی من بێت ڕوی کردە سوارەکان وتی:

– ئێوە لێرە بمێننەوە دەبێ شەوو ڕۆژ لەدەوری ئەم خانەقایە ئێشکچی بن، ئەگەر لێی غافڵ بن و موویەك لەسەری شێخ کەم بێتەوە گۆڕی باوو باپیرتان هەڵدەتەکێنم، خۆیشم هەموو ڕۆژێ سەردانتان دەکەم.

فەرمانی وەکیل، چەن و چوونی نەبوو، لەبەرچاوی هەموویان داوێنی ماچ کردمو خواحافیزیی کردو ڕۆشت، لەو ساتەوە خانەقا کەوتە ژێر ڕکێفی سوارەکانی ئاغاوە.

بەمشێوەیە بینیم هەموو پیلانەکانم هەڵوەشانەوە، بەهیچ جۆرێ لەدەست ئەم سوارانە دەرباز بوونم نییە.

چوومە ژوورەوە، کفتو کۆڵەوار لێی ڕاکشام:

"خوایە خۆت ڕەحمم پێ بکە" نەمدەزانی ئاخرو ئاقیبەتم بەچی دەگات.

بۆ بەیانی سەردەستەی سوارەکان بەخزمەتکارەکەی وتبوو کارێکی پەلەی هەیە پەیامێکی گرنگی لەئاغاوە هێناوە.

هیچ چارەیەکم نەبوو بێجگە لەوەی مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی بدەم.

کاتێ هاتە ژوورەوە تەعزیمی بۆ کردم وتی:

- قوربان جەنابی حەمید ڕەسولی پەیامێکی ناردووەو چەن سەعاتێکی دیکە دێتە دیدەنی جەنابتان، ئاغایش ڕاسپاردەی هەموو کوێخاکانی کردووە هاوکاری بکەن، بێگومان جەنابیشت لە لوتفی خۆت بێ بەشی ناکەیت.

سەرێکم بۆ ڕاوەشاند:

- دیارە ئەوان نوری چاومانن.

سەردەستە چویە دەرەوە منیش لە بیرو خەیاڵی خۆمدا نووقم بووم.

ئەگەر فەرماندەی پۆلیس بەمە بزانێ من ڕێگەم بە حەمید ڕەسولی داوە بێتە خانەقاوە چی دەقەومێ، حەتمەن دەشزانێ خۆ کابرا گەوج نییە، کەسێکە ئاسایشی ئەم ناوچەیەی پاراستووە هەزارن درو جەردەی ڕەوانەی ماڵی خۆیان کردۆتەوە من سەگی کوێم بتوانم ئەم قاچەو قوچە لەو بکەم، چی بکەم چی نەکەم... لە پڕ بیرۆکەیەکی خۆش خۆی کرد بەزەینمدا.

"زۆر باشە ڕێیەکی لەمە باشتر نابێ"

خێرا هەستامو خۆم گۆڕیی بانگی سەردەستەم کردو وتم:

- بۆ ئەوەی حەمید ڕەسوڵی لە هەڵبژاردندا سەرکەوتن بەدەست بێنێ من دەچمە گوندەکانی ئەم ناوەو هەوڵی کۆ کردنەوەی دەنگەکانی بۆ

دەدەم.

سەردەستە وتی:

- ئەی کاک حەمید چی لێ بکەین کەهات بۆ ئێرە؟

- پێی بڵێن بێت بۆ ئاوایی لەوێ چاومان بەیەکتری دەکەوێ ئەمە زۆر لەوە باشترە ئەو بێتە ئێرە.

ئەم فێڵەم هێندە لێزانانە بوو هیچ جێگەی شك‌و گومانی سەردەستە نەبوو.

- هەر چۆنێ جەنابی شێخ پێی باش بێت ئەوە باشە.

خێرا، چەن سوارێکی بانگ کرد پارێزگاریم لێ بکەن. وتم:

- ئەگەر ئەم سوارانەم لەگەڵ بێت خەڵکی باوەڕ ناکەن، وا دەزانن من بەراستی لایەنگری حەمید رەسوڵیم، دیار بوو تەواو لە قسەکانم خاترجەم بوو، بەڵام لەخۆی رانابینێ بەقسەم بکات، کاتێ دەرکم بە دودڵیەکەی کرد وتم:

- با شتێکی دیکە بکەین، سوارەکان ئەسپەکانیان لێرە بەجێ بێڵن جلەکانیشیان بگۆڕن‌و بەدوای مندا بێن.

ئەم پێشنیارەی پەسەند کرد، پێشتر ئاغا ئەمەی پێ وتبووم کە چوونە نێو خەڵکی وەك ئەوەیە لەوەرزی زستاندا بچیتە نێو دەریاوە، نابێ زۆر لەناویاندا بمێیتەوە هەروایش بوو ئەمە بابەتێکی دەورنی بوو.

خەڵکی هەر ئەوەندە رێز لەکەسێك دەگرن وابزانن ئەمە لەخۆیان نییە. وەلێ هەرکە زانیان ئەمیش کەسێکە وەکو خۆیان چیتر هیچ بایەخێکی پێ نادەن.

چوومە ئەو گوندەی نێوەندی ناحیەکە بوو.

ئەو رۆژە هەینی بوو، خەڵکی ئەوی کە هەواڵی هاتنی منی بیستبوو تا دەرەوەی گوندەکە هاتبوونە پێشوازیم.

ژن و پیاو گەنج و پیر، تەنانەت منالیش، ئەگەر پاشایەك لە هیندستانەوە بهاتبایە بەمجۆرە پێشوازییان لیٚ نەدەکرد، زانیم ناوی من لەو ناوچەیەدا تەواو دەنگی داوەتەوە.

پاش تەوقەکردن لەگەڵ چەن کەسێکی ناسراوی ناوچەکە بەرەو تەکیێ ئاوایی بەرِێکەوتین.

هەر کەویستمان بچینە ژوورەوە، بینیم کەسێك پاڵەپەستۆ بەو خەڵکە دەکات و بە پەلە خۆی بۆ پێشەوە دەکوتیٚ، زۆر ترسام، فریا نەکەوتم جوڵە بکەم کابرا گەیشتە سەرم خۆی خست بەسەر پێلاوەکانمدا:

– بە قوربانی خاك و خۆڵی بەر پێت بم... جەنابی شێخ من لە ئاسمان بە دوای تۆدا دەگەڕام تۆ لەزویدایت، هەموو شەویٚ دەهاتیتە خەونم، هاتووم دوعای خێرم بۆ بکەیت.

تا ئەو رۆژە من چاوم بە حەمید رەسوڵی نەکەوتبوو، بەڵام بە ئەداو رەفتاریدا بۆم دەرکەوت ئەم کەسە زمان لووسە خۆیەتی، بن باڵیم گرت و هەڵم ساندەوە وتم:

– ئەستەغیفرالله.

پاشان چوومە لای سەرەوە تەکیێکەوە لەسەر ئەو دۆشەکەی بۆم دانرابوو دانیشتم.

خەڵکی ئاوایی پۆل پۆل دەهاتن و منیش دوای تەوقەکردن دەمچپاند بەگوێیاندا دەمووت:

– نوێنەری ئێوە تاکە کەسێکە بتوانیٚ خزمەتتان بکات ئەم پیاوەیە دەنگتان بدەن بەو.

خەڵکەکە کەبیستبویان نوێنەری ئایندەیان هاتووەو لەتەکیە لەلای منەوە دانیشتووە کەوتبونە مقۆ مقۆ.

هەندێکیان دووسیٚ جارێك دەهاتنە تەنیشتم و دەیانپرسی:

– جەناب، ئەمە نوێنەرەکەمانە؟

– بەڵێ، موسڵمانان.

من دەمبینی سەرو چاوی هەندێکیان گرژ دەبوو، هەندێکیان پێیان سەیرە، وتم چونکە جارێکیتر پێمان وتوون بورهان نوێنەرتانە ئێستا قسەمان گۆڕیوە بەلایانەوە سەیرە.

مەخابن ئەم مێشکەی من تا ئێستا بە ساغی ماوەتەوە باشتر بوو مێشکیان داتەکاندمایەو گەچیان لە جیاتی تێ بکردبایە.

جەنابی نوێنەر بەمەش دڵی ئاوی نەخواردەوە داوای لێ کردم پێکەوە بەناو ئاواییدا بسوڕێینەوە، منی گەوجیش نەمزامی بۆچی بەقسەیی ئەوم کرد؟

نوێنەری بەڕێز، قۆڵی کرد بەقۆڵمدا بۆ ئەوەی خەڵکەکە بیبینن و متمانەی پێ بکەن، منیش لەبەر خاتری دڵی ئاغا وتم:

"باشە، با ئەم سەرکەتن بەدەست بێنێ ئاغام لێ نەڕەنجێ و هەرچی دەبێ قەیناکا".

لایەنگرانی جەنابی نوێنەر ئەو هەلەیان قۆستەوە بەدەهۆڵ و زوڕناوە هاتنە پێشوازیمان بەتایبەتی دەیانویست هەموو خەڵکی ئاواییەکە تێبگەن منش هەواداری ئەوم.

کار زۆر گەورە بوو بوو، دەمویست بە جۆرێ خۆم دەرباز بکەم، بەڵام خۆ نەیدەهێشت، وەکو زەرو پێمەوە نوسپا بوو، لێم نەدەبویەوە لەناکاو بیرۆکەیەکم بۆ هات:

وتم:

– من درەنگمە بۆ نوێژ دەبێ بڕۆم.

بەڵام، جەنابی نوێنەر دەستی کردە پاڕانەوە:

– بە قوربانت چەن خولەکێکی دیکەش لەگەڵم بمێنەوە!

دواتریش نەیهێشت قسە بکەم، بردمی بۆ بارەگای حیزبەکەی خۆیان خۆ نەشدەکرا لەناوەڕاستی ئەو کۆڵانەدا پەلاماری بدەم.

ناچار خۆمدا بەدەستەوە، چای تازەیان بۆ هێنایان و نێرگەلەیان هێناو چەن کەسێکیش بەزۆرو زەحمەت ئەو خەڵکەیان لێ دورخستینەوە.

راستیان وتووە: "مریشك خۆی خۆڵ بەسەر خۆیدا دەکات،" منی کلۆڵی لە دنیا بێ خەبەر بەدەستی خۆم چاڵێکی گەورەم بۆ خۆم هەڵکەندبو تێکەوتنم شتێکی حەتمی بوو.

لەبیرو خەیاڵی ئەوەدا بووم ئەمە حاڵەتە بکاتەوە دەمی فەرماندەی پۆلیس چیم لێ دەکات؟ لەم کاتەدا یەکێ لە نێو ئاپۆرای خەڵکەکەوە قیت بۆوە وتی:

- جەنابی شێخ ئەگەر ئێمە دەنگمان بدەین بەم بەڕێزە چیمان بۆ دەکات؟

نوێنەری گەل دیار بوو پێشتر خۆی ئامادە کردبوو بەبیستنی ئەم قسەیە چویە سەر نیشتۆکێك و وتی:

"لەسەر ئیزنی جەنابی شێخ دەمەوێ بەرنامەی خۆمتان بە درێژی بۆ باس بکەم."

-یەکەم کارێك دوای هەڵبژاردن بۆ ئێوەی ئەنجام بدەم دابەشکردنی زەوییە...تێکڕای ئەم خاك و کشتوکاڵە هی ئێوەی زەحمەتکێشە،

تا ئێستا کەس بیری لە ئێوە نەکردۆتەوە نەیانویستووە ئێوە لە هەژاری و برسێتی ڕزگار بکەن...ئاخر لە چ شوێنێکی دنیادا یەك کەس خاوەنی ٢٣ پارچە ئاوایی بێت و سەدان کەسیش لەم گوندانە لەگەڵ برسێتی و هەژاری دەست لەملان بن؟".

بینیم کابرا زۆر توند ملی ناوە خەریکە قسەکانی دەگەنە جێیەکی باریك، ویستم شتێکی وا بکەم زوو کۆتایی پێ بێنێ، وەلێ نوێنەری

گەل کوڵی نەدەدا، بەهەر مشتێك لەمێزەکەی دەدا دەتوت گۆڕی من هەڵدەکەنێ! بەتایبەت ئەو جنێوە تەڕو پاراوانەی دەیدان بە ئاغاو چەپڵە لێدانی گوندییەکان دوکەڵ لەچاوی منەوە سەری دەکرد.

وتم:

– جەنابی نوێنەر، خاترجەمبە، ئەمانە خۆیان خزمەتکارو خائین لێك جوێ دەکەنەوە.

گوندییەکان دەستیان کردە هاوارو چەپڵە لێدان، نوێنەریش یەك لەدوای یەك سوپاسی دەکردن‌و پاشان بە جۆش‌و خرۆشێکەوە وتی:

– زەویەکانتان لەچنگی ئەو ئاغا بێ ویژدانە بۆ دەردێنمەوە دیدەمەوە بە خۆتان بەڵێنیشتان پێ دەدەم هەمووتان دەبنە خاوەنی زەوی‌و زاری خۆتان.

گوندییەکان لەهەژیمەتی خۆشی خۆیان بە جۆرێ هاواریان کرد خەریك بوو کەڕ ببم، لەپێشنەی ئەو قسانەی لە ئاغاوە بیستبووم دڵنیا بووم ئەم قسانە لەسەر ڕەزامەندی ئاغاوە دەکات، بەڵام پاسەوانەکەم کە لەدوامەوە دانیشتبوو بەئەستەم چپاندی بەگوێمدا وتی:

– جەناب، ئاگاداربە ئەمانە زۆر قەرەباڵغی نەکەن ئاغا لەچاوی تۆی دەناسێ...ها! زانیم ڕاست دەکات، دامێنی عەباکەم کۆ کردەوە وتم:

– من بۆ نوێژ درەنگمە دەبێ بڕۆم.

کابرا لەئێمە زیرەکتر بوو وتی:

– قوربان لێگەڕێ لە خزمەتتدا بم.

دەمتوانی چ وەڵامێکی بدەمەوە؟ دووبارە پێکەوە کەوتینەوە ڕێ، لەڕێگا لێم پرسی:

– ئەگەر دەنگەکان مسۆگەر بکەی هەر یەکەیان چەندێك زەوی پێ دەدەیت؟

– بیست هێکتار.

لە دڵی خۆمدا وتم: "هەی سەگباب خۆ تێکڕای زەویەکان بەشی نیوەی ئەم خەڵکە ناکات ئەوەی دیکە لە گۆڕی باوکت دەردێنی".

بینیم بەم شێوەیە بردنەوەی ئەم کابرایە حەتمیە بورهان شەیپوریش با بۆخۆی سیر بخواو زوڕنا ..... دڵنیاش بووم فەرماندەی پۆلیس نایەڵێ هەروا بەسەرمەوە بچێ، هەرچۆنێ بووە ژەهری خۆییم تێدا بەتاڵ دەکاتەوە، بەڵام هەر چۆنێ بوو ڕازی کردنی دڵی ئاغام لە فەرماندە بەلاوە گرنگتر بوو.

ئاغا هەموو شتێکی لێ دەوەشایەوە، ئەو هەم دەسەڵاتی هەبوو هەم پارە، دڵخۆش بووم بەوەی لانیکەم ئەمەیانم ڕازی کردووە.

کاتێ خەڵکەکە ئەو ناوەیان چۆڵ کردو ئێمە بۆ شوێنی خۆمان گەڕاینەوە سەردەستەی سوارەکان هاتە پێشەوە وتی:

– جەنابی شێخ چی بوو ئەم دەسکە گوڵەت دایە دەم ئاو؟

ئەم ڕیتمی قسە کردنەیم گەلێ بەلاوە گران بوو بەتوڕەیی وتم:

– بۆچی، چی بووە؟

– ئەو کەسەی هێندە هەوڵت بۆدا کەسێکی فێڵبازو سەگو سەگبابە.

– بە من چی، من لەبەر خاتری ئاغا پشتگیریم کرد.

سەردەستە بە پێکەنینەوە جرتێکی بۆ لێدام وتی:

– تڕحێو! ئەمە حەمید ڕەسوڵی نەبوو، ئەمە یەکێ بوو لە دوژمنە سەر سەختەکانی ئاغاو هەمیشە شیرو تیر لەیەکتریی دەسوون.

ئەگەر بۆمبیان بکێشایە بەسەرما، هێندە ڕانەدەچڵەکیم؟

– بەڕاستیتە؟

– درۆی بۆ چییە؟

خەریك بوو بەسەر ئەسپەکەوە سەکتە بکەم، بەڵام مەخابن گیانی من لە

گیانی سەگ سەختترە، بریا بەڕاستی سەکتەم دەکرد، لەم هەموو بەدبەختیو نەگبەتیە ڕزگار دەبووم.

دەمزانی لەسەر ئەم ماستاو کردنەم لە هەردوولاوە تەمبێ دەکرێم، ئاغایشو فەرماندەیش تۆپ تۆپێنم پێ دەکەن، ڕێك وەکو تۆپی یاریی، وەلێ ئەمجارەیان یارییەکە لە نێوانی دوو کەسدا دەبێ، ئاغاو فەرماندە ڕێك دەکەونو پێکەوە گۆری بابم هەڵدەتەکێنن.

هەموو دەرگاکانم لێ داخرا بوو، تەنها مەگەر پەرجویەك ڕوویبدایە ئەگینا هەفتەی داهاتوو بەندەیان لەزیندان دەبینیەوە.

تا گەیشتمەوە خانەقا نیوەگیان بووم، هەرچی بیرم لێ دەکردەوە چۆن لەم داوە دەرباز ببم ئەقڵم هیچ شتێکی نەدەبڕیی.

ڕێی هەڵاتن لەهەموو لایەکەوە داخرابوو، دەمزانی لەمشەوەوە جگە لە پیاوەکانی ئاغا پۆلیسێکیش بۆ چاودێری کردنم دادەنێنو خوا دەزانێ بەچ پەندێکم دەبەن.

دەمەو ئێوارێ کفتو کۆڵەوار گەشتینەوە ماڵەوە، خێرا چوومە ژوورەکەی خۆم، بۆ ئەوەی پشوو بدەم بەو ئومێدەی لەشەڕی ئەو بیرو خەیاڵە ناخۆشانە ڕزگار ببم خوانی خواردنەوەم لێ ڕاخست.

هێندە حاڵم خراپ بوو مەستو بێ ئاگا لێێ کەوتم نەمزانی کەی خەوم لێکەوتووە، بەیانی زۆر زوو بوو، بەدەنگی کوترانی دەرگا لەخەو ڕاچەنیم.

دڵم دەیوت شتێکی ناخۆش بەڕێوەیە، هەستامو پەردەم هەڵدایەوەو سەیرێکی دەرەوەم کرد، بینیم سێ کەس لەلایەن بریکاری ئاغاوە هاتوون، دڵم داخورپا: "هەی دادو بێداد، ئاغا هەموو شتێکی بیستۆتەوە ئێستا بەدەست بەسراوی دەمبەنە لای ئەو."

ئەوەی لەو دیو دەرگاکەوە بوو توندتر لە دەرگای دایەوە، بەدەنگێکی

لەرزۆکەوە وتم:

– کێیە؟

سەردەستە لەو دیو دەرگاکەوە وەڵامیدایەوە:

– بریکاری ئاغا پەیامی ناردووە سوارەکان بە پەلە بەرەو قەڵا بەڕێکەون.

هەناسەیەکی ئاسودەییم هەڵکێشاو هاتمە دەرەوە:

– هەر فەرمانێکی بریکاری ئاغا بفەرموێ بەچاوان جێبەجێی دەکەم.

سوارەکان، وەکو سەربازی بەزیو کەل‌و پەلیان کۆ کردەوە تەنانەت هەندێکیان بەبێ خواحافیزیی کەوتنە ڕێ.

بە ڕۆشتنی ئەوان هەم دڵخۆش بووم هەم دەشترسام، یانی چی؟ بۆچی بریکاری ئاغا سوارەکانی بانگ کردۆتەوە، هەرچی هەیە بە جەهەننەم بەرۆحی بابی، دەبێ هەر ئەمشەو وابۆی دەربچم تا مردن چاوی بەچاوم نەکەوێتەوە.

دوای رۆشتنی ئەوان چوومەوە ژوورەکەم دەستم کرد بە کۆکردنەوەی ئەوە پارەو زێرو زیوانەی گوندییەکان بەدیاریی بۆیان هێنابووم، هەرچی بەوەزن سووك‌و بەقیمەت گران بوو کردمە دوو جانتاوە.

دەمەو نیوەڕۆ هەموو شتێکم ئامادە بوو بەو پەڕی بێ ئۆقرەییەوە چاوەڕوانی ئاوابوونی خۆر بووم تاکو بەبێ ئاگای خەڵکی‌و دوور لەچاوی پۆلیس بۆی دەرچم.

هەموو رۆژێ دوای نیوەڕوان کۆمەڵێ لە گوندییەکان دەهاتن بۆ دیدەنیم، ئەو رۆژە کەس دیار نەبوو،، زۆر دڵخۆش بووم، چیتر حەزم نەدەکرد چاوم بە چاوی ئەو خەڵکە بکەوێ، ئەم خامۆشیی‌و تەنیاییەم زۆر پێویست بوو، خەریك بوو خۆر ئاوا دەبوو.

لە نزیکی پەنجەرەکەوە دانیشتبووم ژنێکم بینی خۆی توند لە

عەباکەیەوە پێچابوو بەرەو لای من دێت.

لە هاتنی ئەو ژنە زۆر نارەحەت بووم، بەتایبەت لەم کاتە ناسکەدا حەزم نەدەکرد قسەیان لەگەڵ بکەم، بەر لەوەی نزیک بکەوێتەوە وتم:

– خوشکی خۆم هەر کارێکت هەیە سبەینێ وەرەوە ئەمرۆ حاڵم باش نییە.

کەچی ژنەکە شانەکانی جۆرێ هەڵتەکاند لەپشتێنە بەرەوخواری لەراندەوە شێتی کردم، بەتایبەت ئەو کاتەی درزی عەباکەی ترازاندو چاوم پێی کەوت دەمم پڕ بوو لە ئاو.

فەدیك، چیتان پێ بڵێم لەجوانیدا لە دنیادا هاوتای نەبوو، ئەندامی لەهەموو نەخش‌و نیگاری دنیا جوانتر بوو، هێندە جوان‌و نایاب بوو پەلەپیتکەت لە شوێنە هەستیارەکانی سەر سینەی بدایە وەك ئەوە بوو ناقوسی کەنیسەت زریگاندبێتەوە.

لەو جل‌و بەرگە دەڵپە لادێیەدا دیمەنێکی هەبوو پیاوی شێت‌و هار دەکرد، خاتوو فەدیك یەکێ بوو لە موریدە موخلیسەکانی خۆم، پێنج شەش مانگ دەبوو شووی کردبوو، بەڵام منداڵی نەدەبوو، دوو سێ جارێك هات بۆ لام دوعاو دەرمانی وەرگرتبوو، زۆر بەناز بوو زۆر خۆی ناسك دەکردەوە بەڵام هەر جارێ کە دەهات هێندە قەرەباڵغ دەبوو نەمدەتوانی دوو قسەی بەدەر لە مەسەلەی لەگەڵ بکەم.

خوا کوێری بکات، چاوەکانی وێنەی چاوی ئاسکی بیابان بوون، کاتێ سەری دادەخست بەشەرمێکەوە باسی پەیوەندی نێوان خۆی‌و مێردەکەی دەکرد خەریك بوو شێت دەبووم.

دواین جار پێم وتبوو ئەگەر ئەم نوشتەیە کاری خۆی نەکرد رۆژێك تەنگی بانگی مەغریب وەرەوە تاکو دوعات لەسەر ناوکت بۆ بنوسم، بۆیە ئەمرۆ فەدیك هاتبوو، هەرچی ویستم لەکۆڵ خۆمی بکەمەوە دڵم

نەدەهات، لەدڵی خۆمدا وتم: "ئەمشەو هەر کاتێ بێ هەر دەڕۆم بۆچی ئەم تیکە چەورە لەدەست خۆم دەربکەم".

وەکو ئیسپرینگ لەژێر فشارێکی زۆردا خڕ کرابێتەوە لەناکاو بەری بدەن دەرپەڕیم وتم:

– بەه بەه، فەدیك خاتون، بەخێر بێیت، بفەرموو.

پەردەکەم لاداو بانگم کرد، فەدیك خاتون وەکو مامز لەنجەی دەکرد، خوڵکیم کرد بێتە ژوورەوە.

فەدیك بەو ناسكو نازدارییەی کەمێ خۆی کێشایەوە:

– ببورە جەنابی شێخ من بێجا دەکەم بێمە بەردەمت من کەنیزی جەنابتم.

دەمم هێندە ئاوی کردبوو، ئەتوت شوشەیەك ترشیان نیشان داووم. پێکەنینێکی درێژم بۆ کردو چونکە باش نەبوو زۆر لەبەر دەرگا بمێنینەوە، چوینە ژوورەوە، فەدیك وەکو بەرخی دەستەمۆ بەدوامدا هاتە ژوورەوە، من لەسەر دۆشەکەکە دانیشتم فەدیك هەر لەبەر دەمی دەرگاکە دانیشت وتم:

– خانمی خانمان فەرموو وەرە پێشەوە.

فەدیك دیسان بەشەرمێکەوە وتی:

– لە ژێر سێبەری جەنابتدام.

– وەرە پێشتر...

هەروا بە دانیشتنەوە لەسەر ئەژنۆ خۆی خزاندە پێشتر عەباکەی کەوتە ژێر ئەژنۆی‌و لەسەری ترازا، ویستی بیداتەوە بەسەریدا بەڵام خراپتر بوو عەباکەی تەواو لەسەر کەوتە خوارەوە شان‌و گەردن‌و سەرو سینەی دەرکەوت.

من هێندە مەست‌و حەیرانی بووم دەتوت پەیکەرێکی بێ گیانت بەلای

دیواردا هەڵپەساردووە، بەددانی لێك گیرکراوو چاوی دەرپەڕیوەوە ماتو مەلول لەو خوای جوانیە ڕامابووم.

ئەقڵ، شەرافەت، ویژدان، هەرشتێکی باشی دیکە لە بنیادەمدا هەیە لەمندا وجودیان نەمابوو؟

بەدەنگێکی لەرزۆکەوە وتم:

– مەگەر تۆ موسڵمانیت؟

فەدیك خانم زۆر تێکچوو وایزانی لەبەر داخزانی عەباکەی من ناڕەحەت بووم، پرسیارەکەی منیش هەمان ئەم گومانەی دروست دەکرد.

خۆی تەواو داپۆشیەوە بەشەرمەوە وتی:

– ببورە جەنابی شێخ بەدەست خۆم نەبوو.

دووبارە بەهەمان شێلگیرییەوە وتم:

– کچێ، ئەوە چ موسڵمانەتیەکە بنیادەم هێندەش دڵڕەق بێت؟

بەواق بونێکی زۆرەوە وتی:

– بۆچی؟

– تۆ ئاگرت تێ بەردام، سوتاندمت، بومە خۆڵەمێش!

پێکەنینێکی عاشق کوژانەی کرد وتی:

– بۆچی لەئیسلامدا دروستە شتی وا بە ژنی خەڵکیی بڵێیت؟

– ئەمە کەی قسەیە؟ کچێ تۆ کافریت کافر.

خۆزگە زمانم لاڵ بوایەو بەم زمانە چەورو شیرینە خاوەن تۆپیوە ئەم ئاگرەم لەخۆم بەر نەدایە، بەڵام ئامان لەدەست ئەم شەیتانە چی بە بنیادەم دەکات هێندەم لەگەڵ ئەو گوڵە ناسك و نازدارەو وتو وتەوە کە بەخەیاڵی خۆم لە خشتەم برد.

بێ ئاگا لەوەی ئەم مارە خۆش خەتوخاڵە ئەسڵەن بۆ دیتنی دەوری خۆی و ئەرکێکی مەترسیدار هاتووە، ئەمە تەڵەی ئاغاو فەرماندەی

پۆلیسەو تالآوی ئەو شیرنکارییە دەکەنەوە بەگەروومدا.

بە ڕاستی فەدیك لە هەموو هونەرمەندەکانی دنیا باشتر دەوری خۆی دەبینی، بەنازو شەرمێکەوە خۆی دەنواند بەنزمکردنەوەو بەرز کردنەوەی ڕیتمی دەنگی خۆی زیاتر دەیورژاندم.

سەرەنجام وتی:

– بەڕاست، جەنابی شێخ نازانی لەو ڕۆژەوەی هاتومەتە خزمەتی جەنابت چاوم کەوتووە بەسیمای نورانیت چۆن شێت و شەیدات بووم؟

قسەکانی ورەیان دەدایەوە بەرم من ختوکەم دەداو ئەویش ختوکەی دەدامەوە سەرەتای یارییە پڕ مەترسیەکە دەستی پێ کرد، وەکو گورگی برسی بەرخێکی لێ هەڵکەوتبی توند لە ئامێزی خۆمم گوشی.

لەناکاو لە دەرگا درا، ئەگەر بە چەکوش لە سەرم بدرایە هێندە نەدەترسام.

کەچی فەدیك وەکو ژنە سۆزانی دەستی کردە پێکەنین.

– وای... گیراین..

من بە پەلە خۆمم کۆ کردەوە:

– عەباو پانتۆڵەکەی من لە کوێیە؟

فەدیك لەخۆشیدا سەمای دەکرد، من تازە دەمزانی کراومەتە چ مەسخەرەیەك، چۆن لەبەردەم کارێکی نەکەردنی دانراوم، بەڵام تازە چ سوودێکی هەیە؟ هێشتا پانتۆڵەکەم لە پێ نەکردبوو، هەردولای دەرگاکە دران بە دیوارەکەدا کۆمەڵێ لە گوندییەکان لەگەڵ کوێخا خۆیان بە ژووردا کرد، ویستم بێمە گۆ، بیانویەك بێنمەوە، بەڵام، دۆخەکە هێندە نالەبار بوو هیچ قسەو بیانویەك سوودی نەبوو، تەنانەت نەیانهێشت بە عەباکەم قاچیشم داپۆشمەوە.

یەخەیان گرتم و کێشمە کێش بردیانمە دەرەوە، هەرکەسەو هەرچی

بهاتبایە بەدەستەوە دەیکێشا بەسەرمدا، کەس گوێی بۆ هاوارو لالانەو پارانەوەم نەدەگرت، یەکێ بە قۆناغە تفەنگ، یەکێ بەقایش، یەکێ بەدار، یەکێ قامچی لێیان دەدام، بۆ هەر لایەك سەرم دەسوڕاند جنێوێکی تەڕو پاراوی پێشکەشە دەکردم.

"قوڕمساخ، بێشەرەف!"

"تففف، لەو ڕیشەت هەی ڕیاباز."

نەگبەتی ئەوە بوو خزمەتکارەکانی خۆم لە هەموویان خراپتریان پێ دەکردم، وەك بڵێی دوژمنی خوێنخواری خۆیان بەگیر هێنابێ.

لەهەمویشی خۆشتر داخی دڵی کوێخا بوو بەدار دەیکێشا بەتەوقی سەرمدا دەیوت:

- کوڕی سەگ، دەتەوێ موڵکەکانی ئاغا دابەش بکەی، ها بیخۆ ئەمە یەك ئەمە دوو ئەڵێی میراتی باوکە سەگت دەبەخشیتەوە؟

بێجگە لە مردن هیچ چارەیەکی دیکەم شك نەدەبرد، هێندەیان فەلاقە کردبووم لەهۆش خۆم چوو بووم.

لەم حاڵەدا گوێم لە پۆلیسێك بوو وتی:

- بەسیەتی، لەمە زیاتر لێی بدەن دەمرێت!

لە دڵی خۆمدا وتم: "چەن کەسێکی باشە".

پۆلیس کە بینی گوندییەکان دەسبەردارم نابن قیڕاندی:

- فەرماندە فەرمانیداوە، بە زیندویی بۆی ببەم.

من چیتر ئاگام لەخۆم نەمابوو، کاتێ بەهۆشی خۆم هاتمەوە بینم خەریکن بە سەتڵ ئاو دەکەن بەسەرو گوێلاکمدا سەرتاپام لەقوڕ گیرا بوو.

پۆلیسەکە فەرمانیدا:

-دەستەکانی ببەستنەوە.

ئەو بێ ویژدانانە تەنانەت نەیانهێشت پانتۆڵەکەشم لە پێ بکەمەوە، توند هەردوو دەستیان بەپەت بەستمەوە، پۆلیسەکان لەپێشەوە گوندییەکان لە دواوە بە کێشمە کێش بردیانم بۆ پاسگە.

قوڕاو لەسەرو گوێلاکمو خوێن لە قاچەکانم دەچۆڕان، گوندنشینەکان کە هیچ هۆکارێکی گەشتو سەیرانیان نییە، هەر کاتێ ڕوداوێکی لەو جۆرە بێتە ئاراوە دەست لە هەموو شتێ هەڵدەگرنو دێن بۆ تەماشا کردنی.

لە ڕێگا سێ چوار کەڕەت ئەو خەڵکە هێرشیان بۆ هێنام، بەڵام خوا ماڵی پۆلیسەکان ئاوەدان کات نەیان هێشت دەستی کەسم بگاتێ ئەگینا هەر لەوێدا تەواویان دەکردمو بەخاکیان دەسپاردم.

هەر بەو جۆرەی بەدەستی بەستراو و بەدیلیی بەرەو چارەنوسی نادیاری خۆم دەرۆشتم، لەخەیاڵی ئەوەدا بووم ئەو خەڵکە بۆچی شاڵاوم بۆ دێنن بۆ دەیانەوێ لە ناوم ببەن؟ ئەوانەی تا دوێنێ بوو ڕێزیان لێ دەگرتم چۆنە وا بەو خێراییە بەرامبەرم گۆڕان؟

خۆ من خراپەیەکم دەرهەق ئەوان نەکردبوو، ئەی بۆچی بە خوێنی سەرم تینوون؟

ئەو ڕۆژە وەڵامێکی ڕەهام بۆ پرسیارەکانم نەدۆزییەوە، بەڵام دواتر تێگەیشتم:

"ئەم خەڵکە چەندین ساڵە لە ژێر باری جەورو ستەمدا دەناڵێنن، بەبرسێتیو هەژاری ژیان دەگوزەرێنن، مەودای بیرکردنەوەی ئەوان بە جۆرێکە ناتوانن دەرك بکەن بەوەی هۆکاری بەدبەختیو هەژاری ئەوان کێیە، ژمارەیەکیان دەرکیان پێ کردووە، بەڵام نازانن بەسەر کێدا بتەقنەوە، خۆ ناشوێرن قسە بە مەئمورەکانی دەوڵەتو پۆلیس بڵێن، هەر لەجێی خۆیان ببزوێن داخیان دەکەن، بۆیە کاتێ کە ڕقیان لە

کەسێك هەستا هەموویان بێ ئەوەی هۆکارەکەی بزانن بێ ئەوەی بیری لێ بکەنەوە کە کابرا تاوانبارە یان بێ تاوانە دادەبارنە سەریی و تێی هەڵدەدەن و فەلاقەی دەکەن.

تەنانەت دەیکوژن، دوای ئەوەی ڕقەکەیان دامرکایەوە ئەنجا دەپرسن ئەرێ ئەو کابرایە چ کارە بوو؟".

داستانی ئەم خەڵکەش بەدەردی گورگە برسیەکان چووە، کە لە ناوەڕاستی زستاندا لە نێو بەفرو بەستەڵەکدا بە برسێتی دەمێننەوە، برسین، ماندون، خەریکە لەپەل و پێ دەکەون، وەلێ دەیانەوێ چاویان کراوە بێت لەجاران باشتر بیریسکێتەوە، دەزانن هەرکامێکیان چاوی لێك بنێت ئەوا مەرگی مسۆگەرەو ئەوانیتر نۆشی گیانی دەکەن.

ئەم گورگانە چەن سەعاتێ بەشێوەی بازنەیی ڕو بەڕوی یەکتری لەسەر بەفر ئەڵقە دەبەستن و ئێشك دەگرن تاکو یەکێکیان چاوی لێك بنێت و هەموویان تێێ بەردەبن و کەرت و پەرتی دەکەن، ئەمە یاسای گورگەکانە، هاوڕێکانی ئێمەیش بۆ دەربردنی گیانی خۆیان بە چوار چاو ئاگایان لە یەکتر بوو، لەنێویاندا هیچ کەسێك لە من نەگبەترو ماندوتر نەبوو.

لەبەر دەرگای پاسگەی پۆلیس کۆمەڵێکی زۆر ئاپۆرایان بەستبوو، هەر کە من بەدەستی بەستراوەوە گەشتمە ئەوێ ئەوەندەی بڵێی یەك و دوو پەلاماریان دام، تفیان تێدەکردم، وایاندەزانی بەم ڕەفتارەیان خۆیان ڕزگار دەکەن، ئەگەر پۆلیس بیهێشتایە گوندییەکان هەر لەوێدا کەرت و پەرتیان دەکردم.

نێوچەوانم شکا بوو، خوێنی زامەکەم بەر چاوی تاریك کردبووم،هەر دووسێ هەنگاوێ پێم هەڵدەنوتا و هاوسەنگیم لەدەست چوو بوو.

دووجار کەوتم بەزەویدا، بەڵام پۆلیسەکان بەتوڕەییەوە بەرزیان کردمەوە:

- هەستە، هەی سەگبابی دزی بێ شەرەف.
- خۆت مەکە بەمشکی تۆپیو، باوك سەگ.

بردمیانە ژووری پاسگەوە، لەسەر پلیکانەیەك ڕایان کێشام، ئاگام لەخۆم نەبوو بەر چاوم تاریك بوو، ئەو پۆلیسەی بەدیارمەوە بوو هەستاو تەعزیمێکی بۆ کردم.

سەرم هەڵبڕی پێڵاوێکی نوك تیژم بینی کە سەیرێکی سەرەوەم کردبینیم ئەمە فەرماندەی پۆلیسە لە ژوور سەرم وەستاوە، وامزانی ئەمە شاهێن چنگڵە لەم کاتە فریام دەکەوی.

وەکو تینویەك گەشتبێتە سەرچاوەی کانیەکی زوڵاڵ هاوارم کرد:

-فەرماندە توخوا فریامکەوە.

بەڵام ئەو مۆڵەتی نەدام پێی لەقەیەکی سرەواندە ناوشانم زانیم لەم هاوڕێ دێرینەشم نابێ هیچ چاوەڕوانیەکم هەبێ.

فەرماندە فەرمانیدا، بمبەن بۆ تەحقیق تاکو پەڕاوی لێکۆڵینەوەم بۆ ساز بکرێ، دوو پۆلیس بەکێشمە کێش بردمیانە ژوورێکی تاریك و دەستیان کردمەوەو دەرگایان لەدەرەوە لەسەر داخستم، لەسەر زەوی لێی کەوتم و سەرم خستە نێو ئەژنۆکانمەوە:

" خودایە من چیم کردووە، خراپەم بۆ کێ هەبووە؟"

خەریك بوو لەهۆش دەچووم، نەمدەزانی چەندێك لەو حاڵەتەدا بووم پۆلیسێك هاتە ژوورەوە بەپێ لەقە تێم کەووت:

- هەستە، هەتیو، خۆ ئێرە ماڵی پورت نییە، هەستە.

ویستم بەرز ببمەوە نەمتوانی، پۆلیسەکە بن باڵی گرتم بەرزی کردمەوە، بردمی بۆ ژوورەکەی جەنابی نەقیب شاهێن.

دوو بەدووماینەوە، جەنابی نەقیب لە کاتێکدا سمێڵەکانی بەددان دەجوویێن وتی:

– سەگی سەگباب گەشتیتە ئەوەی دەست بۆ ژنی خەڵکی درێژ بکەی؟

– لەگەڵ منتانە؟

– نا، لەگەڵ باوکم، کوڕی سەگ... هێشتا نکوڵیی دەکەی؟

– تۆبە، ئەستەغفیرالله، جەناب ئەم قسانە چییە؟

فەرماندە هێندە ڕقی هەستا وتم هەر ئێستە تەواوم دەکات، بەڵام بۆ من ئەو قسانە بایەخێکیان نەبوو، من کڵاوی کەچەڵیم دڕیی بوو بڕیارمدا بوو ئەگەر بەقیمەتی گیانی خۆیشم لەڕوی ئەویشدا بۆستمەوە.

جەنابی نەقیب قیڕاندی:

– سکاڵاکار بێنن.

فەدیك، هاتە ژوورەوە، نەمدەزانی لەکوێ دەرسی دادرابوو، وەك بولبول دەیچریکاند:

"جەنابی نەقیب، من بێ خەتام، چوزانم ئەمە گورگەو لەپێستی مەڕدایە، وتی من نوشتەت بۆ دەکەم منالّت ببێ. بەڵام..."

فەدیك قسەکەی بڕیو فرمێسك وەك لافاو بەچاوەکانیدا قەتارەیان بەست.

هێندە ئاسایی دەدواو دەگریا منیش دڵم بۆی دەسوتا خۆیشم کەوتمە گومانەوە، ناشێ بەڕاستی دەسدرێژیم بۆ کردبێ خۆیشم بەخۆم نەزانم. لەلایەکی دیکەشەوە بەخیلیم پێ دەبرد.

"هەندێك کەس چۆن دەتوانن هێندە ئاسایی ڕۆڵی خۆیان ببینن."

لە گریانو کڕوزانەوەکەی فەدیك سێ چوار پیاوی کەتە بۆم هاتنە ژوورەوە گوایە براو خزمو خوێشی فەدیك بوون.

یەکێکیان تێلایەکی بەدەستەوە بوو پەلاماریدام، ئەگەر پۆلیسەکان بیان هێشتبایە تەوقی سەری دەتەقاندم.

یەکێکی دیکەیان بە سەرو ڕیشێکی سپی و قەدێکی چەماوەوە

نەڕاندی:

-ئەمە شەیتانە، لەگەڵ یاسای کۆماریی ناکۆکەو جنێوی داوە بەسەرۆك کۆمار، لەم تۆمەتەی کابرا بەجۆرێ راچڵەکیم خەریك بوو دڵم لە لێدان بکەوێ. "ئێوە راستی بکەنەوە، من چ وەڵامێکی ئەم تۆمەتە بدەمەوە؟"

تف لە گەرومدا بوو بەکەتیرە، وەکو مەحکومێك چاوەڕێی ئێستا نا تۆزێکی دیکە لە قەنارەی دەدەن لەجێی خۆمدا وشك بووم، بەم حاڵە چیتر بواری قسەو رەخنەم نەمابوو، بەتایبەت کاتێ چوار پێنج کەسی گوندنشین گەواهییاندا من لەدژی یاسای کۆماریی قسەم بۆ کردوون چیتر بێگومان بووم کە هیچ تروسکایی دەربازبوونم نەماوە.

پەڕاوێکی تۆکمەیان بۆ ساز کردم چەن تۆمەتێکی وەکو جنێودان بەسەرۆك کۆمار دەسدرێژی کردنە سەر شەرفی خەڵکی، هاندانی خەڵکی گوند نشین بۆ بەگژدا چونەوەی یاسای دابەشکردنی زەوی پاکو پوختە دەستو پێیان لەخەنە بۆ گرتم.

گوندییەکان لەژێر دان پیانانو گەواهیەکانیاندا پەنجە مۆریان کردو چوونە دەرەوە، کاتێ منو فەرماندە دوو بەدوو ماینەوە، دۆخەکە گۆڕا، من کە مردنم بەسەر سەری خۆمەوە دەبینی وەك دەڵێن لەسەرو رەنگی رەشەوە هیچ رەنگێکی دیکە نییە، سەرە رۆییم کردو بەدەنگێکی بەرزو تۆکمەوە وتم:

- جوان سەیری من بکە شاهین.

جەنابی نەقیب لەم قسەی من واق وڕماو بوو هاواری کرد:

- هۆپ... ئەوە دیسان زمانت درێژ کردەوە؟

بەهێمنی و بی ئەوەی هیچ پێی تێك بچم وتم:

- گەر دەتەوێ من بترسێنی خەیاڵت خاوە، هەرچیت لەدەست دێت

درێغی مەکە بەخەیاڵمدا نایەت، تۆ دەزانی من فەرید پەتاتەمو منیش چاك دەزانم تۆ شاهین چنگڵیت هەردوو یەکتریی باش دەناسین ئیتر بگرەو بەردەی ناوێ.

– ئێمە پاشەڵی یەکتریی باش دەزانین، هەرچیت لەدەست هات درێغیت نەکرد چاوەڕێی کۆمەکیشت لێ ناکەم، تەنها دەمەوێ بزانم ئەم داوەت چۆن بۆ تەنییم؟ من خراپەم چی بوو، تووشی ئەم نەهامەتیەت کردم؟.

لە قسەکانم فرمێسك زایە چاوەکانی زۆری نەمابوو دەست بکاتە گریان،

بەدەنگێکی خەمبارەوە وتی:

– خۆیشت دەزانی من تۆم زۆر خۆشدەوێ.

– ئەگەر منت خۆشدەوێ ئەم مەسخەرەیە چییە؟ تۆ دەچێتە ئەقڵتەوە من دژایەتی یاسای وڵاتم کردبێ؟

– نا باوەڕ ناکەم.

– ئەی ئیتر بۆچی؟ شاهین قسەکەی پێ بڕیم...

– زۆر بەزەییم پێتا دێتەوە بەڵام، حسابی دۆستایەتی و هاوڕێیەتی لەگەڵ بەجێ گەیاندنی ئەرکێکی دەوڵەتدا جیایە، من راسپێردراوم بەدەر لەمەش ناتوانم هیچ بکەم، پێشینەی زیندانی تۆ دەمێکە گەشتۆتەوە بەردەستی من.

– هەر یەکەم رۆژ تۆم ناسییەوە، فەرمانم پێکرا بوو دەسگیرت بکەم، بەڵام خۆم حەزم نەدەکرد تووشی دەردە سەریت بکەم.

– ئەی باشە ئەم یارییە چی بوو بەمنت کرد، خۆ من نەمدەویست شێخایەتی بکەم؟

– براکەم! ئەمانە سیاسەتی دەوڵەتو بەرژەوەندی وڵاتەکەمان

دەخوازێت ئەم شتانەی هەبێت، نەدەبوو من ئەم شتانە بە تۆ بڵێم بەڵام، باوەڕم بەشەرەفی هاوڕێیەتی هەیە بۆیە ئەمانە دەڵێم، دەزانم تۆ نایدرکێنی بۆیە ئەمانەت پێ دەڵێم.

ئەو کاتە ئێمە شێخێکمان پێویست بوو، کاتێ ئاغا پێشنیاری تۆی بۆ کردم دەرکم کرد لە هاوڕێی دیرینەکانی خۆمیت منیش ڕەزامەندیم دەربڕی تەنانەت بورهانیش تۆی ناسیەوە وتی کەسێکی گونجاوە، وەلێ تۆ نەدەبوو فێڵ لە ئێمەش بکەی.

– ئاخر، من چ فێڵێکم لە ئێوە کردووە؟

– لەمە زیاتر دەتویست چی دیکە بکەی؟ تۆ بورهانت ڕیسوا کرد، ئەو داماوە کۆڵێ پارەی خەرج کردبوو، تاکو توانیبوی ڕەزامەندی سەرەوە بەدەست بێنێ، تۆیش لەخوتو خۆڕایی ژیانی ئەوت فەوتاند، چیتر لەم ناوچەیە هیچ کەسێ دەنگ بەو نادات.

– منیشت ماڵ وێران کرد... تۆ بەسەرو سیمای من...

جەنابی نەقیب تا دەهات زیاتر تورە دەبوو:

– بۆچی بە گوندییەکانت دەووت: "زەویتان بەسەردا دابەش دەکەین... گوندەکانتان بەسەردا دابەش دەکەین؟"

– بۆچی، قسەیەکی خراپم کردووە؟

– من نەمدەزانی تۆ هێندە گەوجیت... ئاخر تۆ دەتویست ماڵی کێ بدەیت بەوانە؟

– ئاغا خۆی وتی: "من ئامادەم موڵکەکانم دابەش بکەم" ئەو خۆی وتی: "دەوڵەت دەیەوێ ئەم کارە بکات."

– ناپیاوی، سەگباب... ئاغا وایزانی تۆ پیاویتو نهێنی خۆی لای تۆ باس کرد... دیارە لە بەرژەوەندی خۆیەتی گوندەکانی بفرۆشێت بڕوات بۆ ئەوروپا بەپارەکانی ڕابوێرێت بەڵام، نەك بەو ئاسانییە، تۆ نەدەبوو

ئەو نهێنیە بدرکێنی.

لە قسەکانی جەنابی نەقیب وڕو کاس بوو بووم، سەرم لەو کارە دەر نەدەکرد وتم:

- باشە ئەم ڕۆژنامانە چی دەنوسن؟ هەموو شەوێ یەکەم لاپەڕەیان بەم قسانە ڕەش دەکەنەوە؟

- لە ڕۆژنامەکان گەڕێ... هەرچیەکیان پێخۆشە با بینوسن، لەم دنیایەدا هەر کەسەو لەڕێگەیەکەوە نان دەخوات، ڕۆژنامە نوسەکانیش کاریان ئەمەیە کێچێك بکەن بە گایەك، دەربڕینی بیروڕایش ئازادە، ئەسڵەن دیموکراتی مانای ئەمەیە، یەکێ دەڵێ دابەشکردنی زەوی کارێکی باشەو یەکێکی دیکە دەڵێ خراپە، ئەمانە هیچیان هەقیان بەسەر دەوڵەتەوە نییە.

- کوڕی باش! تۆ لەقوتابخانە کەسێکی زیرەك بویت بۆچی ئێستا وا کەللە پووت بویت، من سەیرم لێ دێت تۆ چۆن بەم ئەقڵە ناتەواوەتەوە خەڵکی دەگەوجێنی، ئەسڵەن چۆن ئەم هەموو کارە سەیرو سەمەرانەت کردووەو بویت بە فێڵبازێکی ناودار؟

پەیتا پەیتا خەریك بوو شتم بۆ دەردەکەوت، ئەنجا تێگەیشتم بۆچی کاتێ بەگوندییەکانم دەوت: "ئەگەر ئەم فلان کەسە دەنگەکان مسۆگەر بکات‌و ببێتە نوێنەر زەویەکان بەسەر ئێوەدا دابەش دەکات." ئەوان مۆڕەیان لێ دەکردم‌و دەرکیان بە هەمووشتێ لە من باشتر کردبوو.

سەرێکم ڕاوەشاندو وتم:

- بەڕاستی ئەمە مەتەڵە.

- هەڵبەت، تۆ وادەزانی هەروا بەئاسانی بنیادەم دەبێتە فەرماندەی پۆلیس، دەزانی من لێرە خەریکی چ گیرو گرفتێکم؟

وتم:

- ئێستە چارەی من چییە؟

- تۆ چیتر ڕێگەی دەرباز بونت نییە، خۆتت ماڵوێران و منیشت سەرگەردان کرد.

لەو کاتەدا لەدەرگا درا، جەنابی نەقیب گەلێ خۆمانە بەرامبەرم دانیشتبوو، دەردە دڵی خۆی بۆ دەکردم، لەجێی خۆی ڕاپەڕی و قایشەکەی لەدەستیەوە پێچاو تێی خوڕیم:

- هەستە، هاوڕێیەتی شتێکەو بەجێ گەیاندنی ئەرکی دەوڵەتیش شتێکی دیکەیە.

من لەجێی خۆم هەستامەوە، جەنابی نەقیب زۆر بە پتەوی و جدیی بەو کەسەی مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی دەخواست وتی:

"وەرە ژوورەوە."

پۆلیسێك هاتە ژوورەوە:

- قوربان پەڕاوی لێکۆڵینەوە ئامادەیە.

جەنابی نەقیب زۆر بەجدی خۆی فەرمانی دا.

**********

ئەم فەرمانە وەکو فەرمانی لەسێدارە دانی من وابوو، زۆر زۆریش خاتریان بگرتمایە زیندانی هەتایی یان پانزە ساڵێکم بەنێوچەوانەوە بوو.

بۆیە بیرم لە هەڵاتن کردەوە، بەڵام چۆن و بە چ فێڵێك بتوانم لەچنگی ئەم پۆلیسانە دەرباز ببم نەمدەزانی.

لەپڕ بیرۆکەیەك وەکو بروسکە خۆیکرد بەزەینمدا:

"سوێند دەخۆم ئەوە یەکەمجارم بوو بە ویستی خۆم بڕیار بدەم کارێکی نایاسایی ئەنجام بدەم".

چارەیەکم نەبوو، بۆ دەربردنی گیانی خۆم ئەگەر بەقیمەتی گیانی کەسانی تریش بووە خۆم رزگار بکەم.

وتم:

– جەنابی نەقیب هیچ نەبێ مۆڵەتم بدەن سەرێك لەماڵەوە بدەمەوە کەل و پەلی پێویستی خۆم بێنم.

جەنابی نەقیب زۆر بەکرچ و کاڵی وەڵامیدایەوە:

"نابێ".

بەم تاقە وشە کورتە خەریك بوو سەرلەبەری پیلانەکەم هەڵوەشێتەوە، ئەگەر بمتوانیبا خۆم بگەیاندایە ژوورەکەم ڕێگەی دەرباز بوونم سەد لەسەد مسۆگەر دەبوو، وەلێ بە بیستنی ئەم وشەیە هەناسەم سارد بوو، بەڕاستی گۆڕام و دەستم کردە پاڕانەوە.

– قوربان تکات لێ دەکەم، سەردانێکی سەرپێی ماڵەوە دەکەم و بە پەلە

دەگەڕێمەوە.

جەنابی نەقیبە هەر بەو زبریەوە وەڵامیدایەوە:

– نابێ.

ئەمجارە بە تووڕەییەوە هاوارم کرد:

– بۆچی نابێ؟!

فەرماندە دەنگی نزم کردەوە وتی:

– ئاخر سەگباب، گوندییەکان کەرت و پەرتت دەکەن...

پێکەنیم وتم:

– ئەگەر بڕیار بێ گوندییەکان پەلامارم بدەن، ئەو کاتەی دەمبەن بۆ شار تیماری دەردم دەکەن.

– لێرە مەئموری زۆرمان هەیە، تا سەر جادە پێنج شەش مەئمورت لەگەڵ دەنێرم.

– باشە... ئێستا هەر وابکە.

جەنابی نەقیب وچانێکی گرت و کەوتە دەریای بیر کردنەوە، من کە مردن و ژیانی خۆمم لەو کەمە خامۆشیەدا دەبینیەوە بەدەنگێکی بەزەیی ئامێزەوە وتم:

– تکات لێ دەکەم، لەبەر وەفای هاوڕێیەتی ئەوەم لەگەڵ بکەن من جلم نییە، پارەم نییە، خۆیشت دەزانی من دەبێ بچمە زیندان.

بەزەیی پێمدا هاتەوە وتی:

– زۆر باشە هەستە و خۆم دێم لەگەڵت.

بەندی جگەرو هەناوم بچڕا، دوای ئەم هەموو پاڕانەوەیە تاکو ڕازی بووە کەچی خۆی دێت لەگەڵم، بەم شێوەیەش هەموو پیلانەکەم هەڵدەوەشێتەوە دەمتوانی بەپۆلیسەکان بڵێم لەدەرەوە بۆستن، وەلێ نەقیب بەو هەموو تایبەتمەندییەی لەگەڵ مندا هەیبوو هەرگیز بۆ ساتێ

لێم جیا نەدەبویەوە، هەرچۆنێ بوو چارەیەك نەبوو، لەگەڵ جەنابی نەقیب‌و سێ پۆلیس بەرەوە ماڵەکەی من بەڕێ کەوتین.

ژمارەیەك لە گوندنشینەکان لەبەردەمی پاسگەکەدا دەستیان کرد بەهات‌و هاوارو خۆ پیشاندان، هەندێکیان پەلاماریان دەدام، بەلاّم فەرماندە ئاماژەیەکی بۆ پۆلیسەکان کردو من لەدوایانەوە دەنگی خرم‌و هوڕی میل هێنانەوەی تفەنگەکانیانم دەبیست.

هەر کە گوێیان لەخرمەی میل هێنانەوەی تفەنگ بوو دوو پێیان هەبوو دووەکەی دیکەشیان قەرز کرد وەکو بیسمیلا لە جنۆکە بکەن گۆڕیان ون بوو.

لە ڕێگا هیچ کاممان قسەمان لەگەڵ یەکتر نەکرد، جەنابی نەقیب لەپێشەوە دەڕۆشت منیش بەدوایدا، پۆلیسەکان قەرەوڵی تفەنگیان گرتبوو تاکو من ڕا نەکەم.

لە دوورەوە کەچاوم بەماڵەکە کەوت چاوم چوە پشتی سەرم، هەموو دەرگاو پەنجەرەکانیان شکاند بوو، ئەو خانەقایەی چەن سەعاتێ پێشتر زیارەتگای خەڵکی ئەو ناوچەیە بوو دیمەنی شارێکی وێرانەی بەخۆیەوە گرتبوو، پێکەنیم دەهات بیرم لە دیکتاتۆرو حکومەتە بێ پشتیوانەکان دەکردەوە، هەر ئەوانەی چەن سەعاتێ پێشتر تەعزیمیان بۆ دەکردم تەنانەت درەختەکانی دەوربەری خانەقاکەیان لە بن‌و بێخ دەرکێشا بوو، دڵنیابووم بەو حسابە پارەو کەل‌و پەلیش هیچی نەماوەتەوە.

هەموو ئەمانە قەیناکا! لە دڵی خۆمدا دەپاڕامەوە ئەوەی دەیتوانی لەم چاڵە قووڵە دەرمبێنێ‌و لە شوێنی خۆیدا مابێتەوەو دەستی تالاّنچیەکانی پێ نەگەیشتبێ.

نەقیب پۆلیسەکانی لەدەرەوە وەستان تاکو چاودێری دەور پشتمان بکەن خۆیشی لەگەڵ من هاتە ژوورەوە.

هەموو شتێ ژێرەو زەبەر بوو بوو، گوندییەکان تەنانەت پەردەی ژوورەکانیان بۆ تەبەڕوك پارچە پارچە کردبوو.

پارەو ئەو شتە گرانبەهایانەی وامدەزانی دەمکرنەوە لە سنوقێکی ئاسنیدا بوو، خۆشبەختانە نەیانتوانی بوو بیبەن.

کلیلەکانی لە نێو جلەکانمدا بوو، سنوقەکەم کردەوە پارەکانم لەبەر چاوی فەرماندە دەرهێنا بۆ ئەوەی زیاتر باوەڕم پێ بکات سەرنجی لەسنوقەکەوە بۆ لایەکی دیکە بچێت هەموویم بۆ ڕاگرت.

- هەرچی هەیەو نییە دەیکەین بە دوو کەرتەوە.

پارەکە گەلێ زۆر بوو، بۆ ئەوە دەشیا شەرمو شکۆ بخاتە ئەولاوە، بەلاّم بەوپەڕی جوامێرییەوە سەری بەئاماژەی نا ڕاوەشاند:

- نامەوێ، خۆت زیاتر پارەت پێویستە، ئەو پارەیە دەتوانێ سەرفەرازت بکات، زۆر خۆشحالّ بووم کە وەرینەگرت ڕاستیشی دەکرد، ئەو پارەیە گەلێ شتی پێدەکرا تەنانەت بەسێ یەکی ئەو پارەیە دەکرا پۆلیسەکان قایل بکەمو بۆی دەرچم.

چەن پارچە جلێکی ژێرەوە پانتۆلێکی پینە کراو لە سوچێکی ژوورەکە کەوتبوو، بۆ ئەوەی فەرماندە خولەکێ بڕواتە دەرەوە پیلانەکەم جێبەجێ بکەم یەکێ لە دەرپێ کورتەکانم گرت بەد دەستمەوە بەپێکەنینەوە وتم:

- دەکرێ یەك خولەك بچیتە دەرەوە؟ دەمەوی دەرپێ کورتەکەم بگۆڕم... نەقیب پێکەنی:

- زۆلێتی مەنوێنە، ئەو کاتەی منالّ بویت هەزارجار سەرو ژێرم بینیوە، پێکەنینەکەی خەمگین بوو، منیش پێکەنینم.

- ئەو ڕۆژەم کەتەوە بیر لەگەلّ هەمان ئەم جەنابی نەقیبە زۆرانمان گرتبوو کوڕەکان شۆرتەکەیان لە پێم داکەند.

نەقیب تێکەشت خەیالّی چی دەکەم وتی:

- بیرتە؟

- سەرێکم ڕاوەشاند!

- بەڵێ وەلێ، ئیستا گەورە بوین، ئەو ڕەفتارانە عەیبە.

ڕووی کردە ئەولاوە وتی:

- ها... ئەوە ڕووم کردە ئەملاوە ئەوەش لەبەر خاتری تۆ، خێراکە.

تەنها ساتێك دەرفەت بەس بوو، بە پەلە ئەو پریاسکەیەی لە سوچی سنوقەکەدا بوو هەڵمگرت و دوایی دەرپێ کورتەکەم گۆڕی و وتم:

- تەواو بووم.

کاتێ گەڕاینەوە پاسگە نەقیب پێش هەموو شتێ وتی:

- پارەکانتم بدەرێ.

راچڵەکیم... چونکە سێ پۆلیس لە ژوورەوە بوون، زانیم مەسەلەی هەق و حساب و بەرتیل لە گۆڕێ نییە حەتمەن نەخشەیەکی گرنگی پێیە، کەمێ دوو دڵ بووم بەڵام، جەنابی نەقیب بە تورەیی وتی:

- خێراکە، ئەگینا فەرمان دەکەم گیرفانیشت بپشکنن.

زانیم کارەکە گەنتر دەبێ بێت و بمپشکنن پریاسکەکەش دەدۆزنەوە.

خێرا بەستە پارەکەم خستە سەر مێزەکەی، جەناب نەقیب فەرمانیدا:

- هەژماری بکەن بزانن چەندە؟

پارەکە هەمووی درشت بوو، خێرا لە هەژمار کردنی تەواو بوون، سەدو چل و یەك هەزارو چوار سەد لیرە بوو.

جەنابی نەقیب زۆر بەجدی وتی:

- چوار سەد لیرەکەی پێ بدەنەوە سەدەو چل و یەك هەزارەکەش دەنێرمە سنوقی دادگای ئەستەمبوڵ.

بەخێرایی پسوڵەی پارەکەی نوسی و دایە دەستم.

زانیم کارەکە زۆر گەن بووە وتم:

- قوربان توشی ئەم گێرە کێشەیەم مەکە ساقەسەری منالەکانت توشی دەردەسەریم مەکە.

نەقیب ئاماژەیەکی بۆ پۆلیسەکان کرد:

- بچنە دەرەوە تاکو خۆم بانگتان دەکەم...

پۆلیسەکان پێکەنینێکی توێکلٚداریان کرد چوونە دەرەوە، نەقیب لە پێکەنینی پۆلیسەکان ڕقی هەستا بوو داخی دلّی خۆی بەمن ڕشت:

- ئاخر کوڕی سەگ، من تۆ چاك دەناسم، تۆ بەم پارەیە دەتوانی سەد پۆلیس قایل بکەی، من چۆن بهێلّم تۆ ئەم پارەیەت پیّ بێت؟

بەقوربانی مێشکی خۆم بم وەك مەکینەی ئەلیکترۆنی لەماوەی چرکەیەك کەمتر ڕێچاری کێشەکان دەدۆزێتەوە .

وتم:

- جەناب، گەلیّ ئاسانە، پارەکە بدە بەپۆلیسەکان ئەوان لەویّ بمدەنەوە.

پێکەنینێکی درێژی کرد:

- بەخوا چاکی لیّ دەزانی دەتەویّ دووگ بخەمە بەردەمی پشیلە؟

- ئەی چارە چییە؟

- هیچ، لەڕێی بانکەوە بۆت حەوالّە دەکەم.

وتم:

- جەناب، بیدە بە پۆلیسەکان، با ئەوانیش لە ئەستەمبولّ بیدەن بە سنوقی زیندان، ئەگینا پارەکەم دەفەوتیّ و دەستم ناکەوێتەوە.

جەنابی نەقیب دەیویست بیسەلمێنیّ کە هیچ شتیّ نابێت منی دایك مردویش بەهەزار سوێندو ئایەت دەمویست بیسەلمێنم قسە قسەی منە، خۆزگە زمانم دەقرتاو هێندە لەسەری نەدەچووم، ڕاستیان وتووە زمانی سوور سەری سەوز دەداتە بەر با.... لەسەر شێلگیریی من جەنابی

نەقیب وتی:

– تاقە ڕێگەیەك هەیە.

– ها بەقوربانت بم کامە ڕێگە؟

– خۆم لەگەڵت دێم و لەوێ پارەکەت پێ دەدەم.

ئەگەر کوتەکی ئاسنیان بکێشایە بەسەرمدا هێندە وڕو کاس نەدەبووم:

"ئەی دادو بێدا هەموو ڕیسەکەم بویەوە بەخوریی."

من بۆ پۆلیسەکان پلانێکی جوانم داڕشتبوو، سەد لەسەد سەرکەوتوو دەبووم، وانەزانن بەپارە بیان خەڵەتێنم؟

نا، ئەم ڕێگایە لە سەدا سەد تەواو نییە، لە نێو پۆلیسیشدا پیاوی بێخەوش و بەرتیل نەخۆریش هەیە، بەڵکو پلانەکەم زۆر لەو کارە بتەوتر بوو، وەلێ جەخار.

تێکڕای کارەکان هەرەسیان هێنا، نەقیب پارەکەی خستە جانتایەکی بچوك و گرتی بەدەستیەوە، لەگەڵ دوو پۆلیسی تر بەڕێ کەوتین.

لە ڕێگا بە هیچ جۆرێ حەوسەڵەی قسە کردنم نەبوو، تەواو ڕێگای دەرباز بوونم لەم داوە لێ بەسرا بوو، لەڕێگای بەندیخانە زیاتر هیچ تروسکاییەکم بەدی نەدەکرد، بەندیخانەیەك هیچ نەبێ دەبوو ١٥ ساڵ ئاوی ساردی لێ بخۆمەوە.

جەنابی نەقیب لەپێشی جێبەکەوە دانیشتبوو، من و پۆلیسەکان لە دواوە کزۆڵەمان کردبوو.

هیچ کاممان قسەمان نەدەکرد، هەموو سەرمان کردبویەوە بە بن هەنگڵی خۆماندا.

دەمەو نێوەڕۆ گەشتینە بەردەم چایخانەیەك، بە هەر نرخێك بوایە دەبوو بەرنامەکەم لێرە بخەمە گەڕ، ئەم هەلەم نەقۆستایەوە جەنابی نەقیب ڕاستەوخۆ دەیبردمە بەردەمی گرتوخانەو تەسلیمی دەکردم.

کاتێ لە جێبەکە پیادە بووین وتم:

– ببورە جەنابی نەقیب ئیزنم دەدەی بچمە تەوالێت؟ دەمزانی دەبی بۆ ئەمە ئیزنم بدات، ڕازی بوو.

چوومە تەوالێتەوە دەرگام قایم کرد، گومانم کرد ڕەنگە لە درزی دەرگاکەوە چاودێریم بکەن، بە پەلە ئەو پریاسکەی لە پەزوی شەرواڵەکەمدا شاردبومەوە پڕ بوو لە حەشیشی پاڵفتە دەرم هێنا.

ئەم حەشیشە هەمان ئەو دەروێشە بۆی هێنا بووم جار جارێک دوکەڵێکم لێ ساز دەکرد، ئێستا دەبوو لەم کاتە ناسکەدا بێت بە هانامەوەو لەم داوە مەترسیدارە ڕزگارم بکات.

لەو دیو دەرگای ئاودەسەکەوە لێی دانیشتم، دوو سێ جگەرەم هێناو بە پەلە توتنی ئەوانم بەتاڵ کردو یەکی تۆزێ حەشیشم تێکردن‌و توتنەکەی خۆیانم کردەوە بەسەریاندا.

خەریکی دروستکردنی جگەرەی سێیەم بووم پۆلیسەکە لە دەرگایدا:

– چییە؟ تەواو نەبویت؟

– تەواو وا هاتم.

دەستەکانم وەکو ژێی کەمان دەلەرزین، چارەنوسم بەمەوە گرێ درابوو.

هەرچۆن بوو جگەرەکانم تەواو کرد، پاشماوەی حەشیش‌و توتنە زیادەکانم ڕشتە ئاودەسەکەوە، جگەرە دروستکراوەکانم کردە قوتوی جگەرەکەو هاتمە دەرەوە.

جەنابی نەقیب کەیفی گاڵتەو گەپ گرتبوی، دەستی کردە رابواردن، بەو هەموو بێ تاقەتیەمەوە دەستم کرد بە پێکەنین، بۆ نانخواردن داوای مریشکی سورەوە کراویان کردبوو، بەخەیاڵی خۆیان دەیانویست لەسەر حسابی من بخۆن.

وتم:

- جەناب، لێگەڕێ با دوایین ئارەقیش پێکەوە بخۆینەوە.

ڕازی نەبوو، زۆر پێم ناخۆش بوو، چونکە ئەگەر مەشروبی بخواردبایە کارەکەی من ئاسانتر دەیدا بە دەستەوە، چاوم لە پۆلیسەکانیش داگرت ئەوان حەزیان لێی بوو بەڵام ترسی نەقیبیان هەبوو.

دووبارە جەختم کردەوە:

- خۆت باش دەزانی لە زیندان ئەم شتانە نین، لێگەڕێ با سەرێك گەرم بکەین.

ڕازی بوو وتی:

- بەو مەرجەی کەم بخۆنەوە.

- بە چاوان، تەنها دوو پێك.

چایچییەکە لەوەی موشتەری باشی دەسکەوتبوو زۆر کەیفی ساز بو، دوای نانخواردن جگەرەکانم پێدان نەقیب وەرینەگرت:

- حەزم لە جگەرە نییە.

دڵم داتەپی، خەیك بوو هەموو ڕیسەکەم ببێتەوە بەخوریی، پێداگریم لێکرد:

- دوای خواردنەوە جگەرەیەك زۆر خۆشە.

بە نابەدڵی جگەرەکەی وەرگرت و دام بە پۆلیسەکانیش خۆیشم جگەرەیەکی ساغم پێ کرد، کاتێ سێ چوار مژیان لێدا، دڵم ئارام بویەوە.

دەستیان کردە باوێشك لێدان، چاویان لەگێژەوە چوو، چایچییەکەم بانگ کردو سەد لیرەم پێدا.

- وەرە بابە ئەمە وەرگرە هەمووی بۆ خۆت، چایچی لە خۆشیانا چاوی بوو بووە چوار... قوتوی جگەرەکەم بۆ ڕاگرت.

- جگەرەیەك بکێشە.

ئەویش جگەرەیەکی پێ کرد، هێندە قسەم لەگەڵ کرد تاکو جگەرەکەی تەواو کێشا.

جانتاکەم هەڵگرت و سویچی جێبەکەم لە گیرفانی شۆفێرەکە دەرکرد بەشێنەیی لەچایخانە هاتمە دەرەوە، دەمزانی ئەگەر بەرەو ئەستەمبوڵ بەڕێکەوم دەگیرێم.

بڕیارمدا بگەڕێمەوە بەڵام، دەبوو شوێنی تایەی جێبەکە دەر نەکەوێ، کەمێ چوومە پێشەوە بەدەوری قیرەکەدا گەڕامەوە بۆ ئەوشوێنەی لێی هاتبوین بەخێراییەکی تەواو پێم لێ داگرت.

دە پانزە کیلۆ مەترێ بەولاترەوە لەسەر کەندەلانێك ڕامگرت، پاڵێکم بە جێبەکەوە نا بەرەو خوار ڕەوانەم کرد، خۆم و جانتا ئازیزەکەم چوومە نێو دارستانێکی چڕی ڕۆخی جادە، دارستانێکی چڕوو پڕ لە درەخت بوو، گەر سەد سەر وشتری تێدا ون بوایە نەدەدۆزرانەوە، ئەو شەوەم بەسەر درەختێکەوە بردە سەر.

سبەی تا دەمەو نیوەڕۆ هەر لەوێ مامەوە، ماندوێتی و ناچاری کردم بێمە خوارەوە وەلێ، زۆر دەترسام، لەهەموویشی خراپتر ڕدێنە ڕەش و پڕەکەم بوو، دەبوو هەرچی زووترە بیتاشم دەستێ چاکەت و پانتۆڵ ئامادەکەم، ئەگینا هەر کەس بەو سەرو سەکوتەوە بیدیتبام دەیناسیمەوە.

لەو دارستانەدا کوخێکی جوتیاریم دۆزییەوە... لە دەلاقەوە سەیرێکی ژوورەوەم کرد دیار بوو کەسی لێ نەبوو.

بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا بڕیارمدا بە ئەنقەست دزیی بکەم، هیچ چارەیەکی دیکەم نەبوو، ئەمانە تێکڕایان یاریی چارەنوس بوون، من کە ئەوەندە قێزم لە دزیی و کاری نەشیاو دەهاتەوە کارم بەم حاڵە گەیشتبوو.

لە نێو کوخەکەدا دەستێك چاکەت و شەروالی لادێیانە کۆنە گوێزانێکی جولێت مەکینـە تەراشـێکی دەم لـچ شـکاوم هـەڵگرت، بـەڵام هەرچـەن بەدوای ئاوێنەدا گەڕام نەمدۆزییەوە، جلەکانم گۆڕی و دووبارە چوومەوە نێو دارستانەکە، لە ڕۆخی جۆگەو ئاوێکدا دانیشتم بەهەر کولەمەرگیەك بوو ڕدێنم تاشیی.

ئەگەر گایەکم بەو گوێزانە کۆنە سەر بڕیبا ئاسانتر بوو تاکو ڕدێنی خۆم، تا مردن کزانەو ئازارەکەیم بیر ناچێتەوە.

کاتێ کاری تاشین تەواو بوو، ئەنجا کەوتمە بیرو خەیاڵی ورگم، تا ئەو کاتە هێندە شپرزەو نارەحەت بووم بیری برسێتیم نەبوو، بەڵام ئێستا تەواو تینی بۆ هێناوم.

کە دنیا تاریك داهات کەوتمە ڕێ، لەوەش دەترسام پۆلیسەکان لەو دەورو بەرە بن، لەوەش زیاتر بەرگەی برسێتیم نەدەگرت.

دوای چەن سـەعاتێ ڕێکـردن بـەپێ لەدارسـتانەکەوە تیـشکی لایتـی ئۆتۆمبێلەکانم بەدی دەکرد.

کاتـێ گەیشتمە سـەر جادە نـەمتوانی بـزانم ئێرە کوێیـەو دەبـێ بـەرەو کوێ بڕۆم:

"نەوەك قسەیەکی غەڵەت لـەدەمم دەرچێت و شۆفێرەکان لـێم دردۆنـگ بن."

تاوێـك لـە ئەسـتێرەکانم ڕوانـی، بـەڵکو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئـاوای خـۆم بدۆزمـەوە، بـەڵام سـوودێکی نـەبوو، لۆریـەك بەلایتـە بەهێزەکانیـەوە لـە دورەوە دەرکەوت دەستم بۆ هەڵبڕیی.

کاتێ ڕاوەستا وتم:

– هاوڕێ ئەم چەن کیلۆمەترە بەچەن دەمگەیێنی؟

شۆفێرەکە بە مۆنی و خەواڵویی وتی:

– سەرکەوە پێکەوە ڕێگا دەبڕین.

سوار بووم... شۆفێر تەنها بوو، دوای ئەوەی چۆنی و چاکیمان کرد پرسی:

– بۆ کوێ دەچیت؟

– لەو گوندانەی لای خواروو کەمێ کارم هەیە.

کابرا پێکەنینێکی درێژی کرد:

– دێهات لەسەر ڕێمان نییە، تاکو "ئەرزنجان" هەمووی دارستان و چیاو چۆڵەوانیە.

زانیم خراپم لێداوە، کابرا بەرەو شارە زەردەواڵەم دەبات، حەتمەن پۆلیسیش لەو سەر جادەیە ئێشکچین.

وتم:

– براکەم! من بەهەڵەدا چووم... ببورە... تکایە ڕایگرە پیادە دەبم.

شۆفێرەکە وەستا و بەدەنگێکی گڕو گیراوەوە وتی:

– بۆچی منالییت مالی خۆتان لێ ون ببێت؟

وەلامێکم بۆی نەبوو پێکەنیم وتم:

– ببورە... دەرگام کردەوە خۆم هەڵدایە خوارەوە.

ئێستا دەمزانی ڕێگاکەم بەرەو کوێیە، بەلام نەڕۆشتم لەکەناری جادەکەو لەپەنای درەختێکدا وەستام.

خامۆشی دارستان و ئەو دەنگە سەیرو سەمەرەیەی لە دورەوە دەمبیست ترسێکی فرەیان لەدڵمدا بەرپا کردبوو، نەمدەزانی چی بکەم؟ ڕوناکی لایتی ئۆتۆمبێلێك لە دورەوە تاریکیەکەی شەق کرد و گەیشتە پێشەوە.

خۆم کۆ کردەوە، ویستم بچمە سەر جادەکە، بەلام نازانم چی بوو قاچم لەدوام نەدەهات، ئیلهامێکم بۆ هات ئاگام لەخۆم بێت، تا ئەو ساتە

هەرگیز نەدەهات بەخەیاڵمدا ڕەنگە پۆلیسەکان بەو ڕێگایەدا بەدوامدا بگەڕێن و هاتوچۆ بکەن.

ئۆتۆمبێلەکە بەخێرایی هاتە پێشەوە، بەڵام من لەشوێنی خۆم جوڵەم نەکرد، کاتێ بە بەردەممدا تێپەڕێ کرد سەرو گوێلاکی چەن پۆلیسێکم لە جیێبێکدا بۆ دەرکەوت.

خوا ڕەحمی پێکردم نەچوومە پێشەوە، حاڵەتێکی سەیرم هەبوو ئەمە یەکێ بوو لەو ساتانەی مردن و ژیانی بنیادەم بەسراوە بەموویەکەوە، ئێستە ئەم شتانە لە دەسەڵاتی کێدایەو چارەنوسی بەشەر لە کوێ دیاری دەکرێ؟ ئەمە بۆ خۆی مەسەلەیەکە زۆر کەس لە ئاستیدا دەستەوسانە.

لە قەراخی جادەکە دانیشتبووم بیرم دەکردەوە، لایتەکانی ئۆتۆمبیلێکی دیکە لە دورەوە دەرکەوت، دووبارە پێشبینیم کردەوە، کاتێ نزیک بویەوە لۆریەك بوو.

هەستام و دەستم بۆ هەڵبڕیی، چەن هەنگاوێ لەولاترەوە وەستا و چوومە پێشەوە.

– براکەم، تاکو ئەنقەرە چەندم لێ وەردەگری؟

شۆفێر بەدەنگێکی گڕو گیراوەوە وتی:

– دیمانەت بەخێر، فەرید بەگ، چۆنی؟

لە بەر تاریکی نەمتوانی دەم و چاوی بەجوانی ببینم بەڵام، دەنگیم ناسیەوە، "ژەنراڵ نیازی" یەکێ بوو لەهاوڕێ دیرینەکانی زیندانم، ساڵانێك پێکەوە لەژێر سەقفێك و لە پێخەفێکدا دەمانخواردو دەخەوتین، بۆچی ناومان لێ نابوو ژەنراڵ نیازی، دەزانن هەندێ کەس ویردی سەر زاریان ئەمەیە هەرکەس دەبینن پێی دەڵێن: "کاکە، ئازیز، براگیان، ئاغاو ئەمجۆرە شتانە".

ئەم هاوڕێیەمان بەگەورەو بچوک بگەشتبایە دەیوت ژەنراڵ، لەبەر ئەمە بوو لەزینداندا ناومان لێ نابوو ژەنراڵ نیازی، لەوەی کە بەو جلانەوە بینیمی زۆر ناڕەحەت بووم، حەزم نەدەکرد کەس بمناسێتەوە، بەڵام چار نەبوو بزەیەکم کردو وتم:

– موخلیستم. ژەنراڵ، ئەی تۆ چۆنی؟

– من باشم، وەرە سەرکەوە.

لە تەنیشتیەوە دانیشتم، پرسی:

– ئەم قەدو قەوارەیە چییە دیسان چ بەزمێکت لە ژوور سەردایە؟

– هیچ، بابە من چیتر پیاوی بەزمو ڕەزم نیم.

ژەنراڵ نیازی مشتێکی توندی دا بەشانمدا:

– کوڕە عەیبە هەتیو درۆمان لەگەڵ مەکە؟

– نا بەگیانی تۆ.

ڕیتمی دەنگی خۆی گۆڕیو پرسی:

– بەڕاست خەریکی چیت؟

– ئێستا بە کشتوکاڵەوە خەریکم.

بەدەمو چاویدا تێگەشتم باوەڕی نەکرد شانەکانی هەڵتەکاند:

– زۆر باشە، شوکر بۆ خوا کارو بارت لەبەر دەڕوات؟

– ئەرێ خراپ نییە!

– ئەی تۆ چۆنی؟

– باشم نانو ئاوێك پەیدا دەکەین!

من زۆر حەوسەڵەی قسەم نەبوو، خەیاڵم لای جادەکە بوو دەترسام تووشی جێبی پۆلیسەکان ببین.

وەلێ ژەنراڵ نیازی بەردەوام قسەی دەکرد، لە بیرەوەری ئەوسای زیندان، شیرینکارییەکانی ئەم دواییانەی بۆ باس دەکردم جار

جــارێکیش پێکــەنینێکی توێکڵــداری دەکــرد، گەشــتینە بــەردەمی چایخانەیەك، نیازی دەیوست ڕاوەستێت‌و چایەك بخۆینەوەو ماندومان بسێتەوە.

بەڵام من بەدڵم نەبوو، دەمویست هەتا دنیا تاریکە لەم ناوچە پڕ مەترسیە دورکەومەوە.

وتم:

– بابە، لێخوڕە بڕۆین یەکسەر بۆ ئەنقەرە.

– مەگەر سەردانی گۆڕستان دەکەین.

– خواردنەکانی ئەم ناوە خۆش نین.

نیازی، دایە قاقای پێکەنین:

– یانی لە خواردنەکانی زیندان پیسترە، ئەمە دەمێکە وا ناسك‌و نازدار بویت؟.

نەمدەویست لەمە زیاتر مشتومڕی لەگەڵ بکەم، بەڵام لەناکاو لەبەر دەمی چایخانەکەدا چاوم بە جێبی پۆلیسەکان کەوت هێندە شپرزە بووم نزیك بوو زراوم بتەقێ، نیازی خەریك بوو بچێتە بەردەمی چایخانەکە.

وتم: "بێت‌و بڕۆین پۆلیسەکان دردۆنگ دەبن‌و دوامان دەکەون،" بە پەلە وتم:

– نیازی گیان باش نییە بۆ من بێمە چایخانەوە، دەچمە سەر جادەکە لەوێ چاوەڕێت دەکەم، گەر پۆلیسەکان پرسیاریان لێ کردیت بڵێ من کەسم نەدیوە.

نیازی خۆیشی وەستای ئەو شتانە بوو، بە دووسێ قسە هەموو شتێ تێگەیشت چاوەکانی دەرپەڕاندو تێم ڕاما:

– کوڕی سەگ، ئەی تۆ وتت خەریکی کشتوکاڵم! ئەی ئێستا چی؟

بە پاڕانەوە وتم:

– قوربانت بم جارێ تۆ بڕۆ چایخانەکەوە تا پۆلیسەکان نەهاتوون، دوایی هەموو شتێکت بۆ دەگێڕمەوە، تەنها وریابە، بۆن نەکەن!

بە پەلە لە لۆریەکە دابەزیم وەکو تانجی بەو دارستانەدا بۆی دەردەچووم، دووسەد سێ سەد مەترێ بەرەو خوارتر چوومە سەر درەختێك و لەدوورەوە سەیری چایخانەکەم دەکرد.

نازانی چ حاڵێکم هەبوو، تاوانباران و فێڵبازەکان ئەگەر شیریشیان بگاتە ئەوجی ئاسمان هێشتا هەر کەسانێکی کلۆڵ و نەگبەتن.

ملیونان پارەو ساڵانێك خۆشی و رابواردن یەك سەعاتی دڵە ڕاوکێ ناهێنێ، ئەو دۆزەخەی بۆ تاوانباران ساز کراوەو بەڵێنیان پێدراوە لەوە ناچێ لەم ساتانەی چاوەڕوانی سەختتر بێت وەکو دەڵێن ترس لەنەخۆشی لەخودی نەخۆشیەکە خراپترە، هێندە شێواو بووم لەناخەوە حەزم دەکرد پۆلیسەکان بێن و بمبینن و دەسگیرم بکەن... تاکو لەم دڵە ڕاوکێ و نیگەرانییە بکەووم... دوای سەعاتێ نیازی هاتەوە... سوار بوین و بەڕێ کەوتینەوە.

وتی:

– دەی شازادە، بڵێ بزانم مەسەلە چییە؟

ناچار بووم کە ئێستا وای لێ هات هەموو شتێکی هەر لەسیر هەتا پیواز بۆ بگێڕمەوە.

بەسەرهاتەکەم تاکو ئەنقەرە درێژەی کێشا... کە تەواو بووم نیازی وتی:

– دەی باشە ئێستا بەتەمای چی بکەیت؟

– ئەوی راستی بێ خۆیشم نازانم.

نیازی زۆر دڵی بۆم دەسوتا بزەیەکی کاڵوکرچی کردو وتی:

– ئەگەر بەگوێی من دەکەی وەرە لۆریەك بکڕەو خۆت لەم دەربەدەری و

نەهامەتیە دەربێنە...

بیرۆکەیەکی خراپ نەبوو، وەلیّ ئەم پێشینە لەعنەتیە چی لێبکەم؟

وتم:

– بۆ مەگەر ئەم پۆلیسانە لێدەگەڕێن بنیادەم بە سەر راستی ژیان بکات؟

– خەمت نەبێ... ئەمانە کاریان بەو کەسانەوە نییە واز لە فێلّو تەڵەکەبازی بێنن.

من نوقمی بیرکردنەوە بووم، بزانن ڕێکەوت لە ژیانی بنیادەمدا چەن رۆڵێکی مەزنی هەیە، ئەم پێش هاتانە هەندێجار پێدەچێ بنیادەم بگەیێنێتە تەختی پاشایی و هەندێجاریش توشی نەهامەتی و فەلاکەتباریی بکات.

هەمیشە لەهەمبەر روداوەکاندا لە سەرەتاوە باش بووم، کەچی دوایی بەڵاو وەیشومەی وەهام بەسەر دەهات مەگەر هەر خودا بۆخۆی بیزانێ،

بۆیە هەر کاتێ بەخت یاوەرم دەبوو بیرم لەئاقیبەتەکەی دەکردەوە، ئەمجارەشیان کەوا بەئاسانی لەچنگ ئەو پۆلیسانە دەرباز بووم بەخت یاوەرم بوو، کە گەیشتینە ئەنقەرە قەول و قەرارمان کردو لێك جیا بوینەوە.

بڕیارمدا بوو بەو پارەیەی کە هەمە لۆریەك بکڕم، بۆ سبەی بەیانی یەکەم کارێك کە کردم ئەوە بوو چەن رۆژنامەیەکم کڕی.

دەمزانی رۆژنامەکان دووبارە سەبارەت بە من شتی سەیرو سەمەرە دەنوسن، ئەگەر ئەو هەواڵانەم کۆ کردبایەوە کە رۆژی یەکەمەوە رۆژنامەکان دەربارەی من نوسیبویان کتێبێکی گەورەی لیّ دەردەچوو، لە ئەسڵی بەسەر هاتی من گەلیّ خۆشتر بوون.

شتێکی سەیر بوو، ئەمجارەیان رۆژنامەکان دەربارەی من هیچیان

نەنوسی بوو، ئەو رۆژە زۆر سەرسام بووم بەلاّم دواتر هۆکارەکەیم زانی...

جەنابی نەقیب و پۆلیسەکان کاتێ بەهۆشی خۆیان هاتبونەوە سەیریان کردبوو من کلاّوم لەسەر ناون، وایان بەباش زانیبوو پەڕاوو مەڕاو بدڕێنن و سەری لێ بنێنەوە.

بەو جۆرەش کاری من گەلێ ئاسانتر بوو، هیچ نەبێ دەمتوانی تا بەسەرهاتنی بەدبەختیەکی دیکە بەئاسودەیی بژیم بەو پارەیەی پێم بوو قاتێك جلی رێك و پێکم لێ کڕیی.

بڕیارمدا بەرنامەی ژیان بەشێوەیەك هەموار بکەمەوە جارێکیتر نەکەومە هیچ داوێکەوە، بەلاّم مەخابن ئەم بڕیارەم زۆر زوو شکستی خوارد.

وەك یاسایەکی کتوپڕ کە ٢٤ سەعات دەخایێنێ، هێشتا شەوو ڕۆژێك بەسەر ئەو بڕیارەمدا تێپەڕی نەکردبوو ڕوداوێکی سەیرو چاوەڕوان نەکراو بەرۆکی گرتمەوە.

دەمویست پێش دەستبەکار بوونم سەرێك لە دایك و باوکم بدەمەوە. بزانم ماون مردون؟ چ بەلاّیەکیان بەسەر هاتووە ئێستا باری دارایم کەمێ باشە هیچ نەبێ دەسگرۆییەکیان بکەم.

لە بانك حسابێکم کردەوە هەندێکم داناو ئەویتریشم کردە تەنکەی باخەلّم لەگەلّ نیازی بەرەو ئەستەمبولّ بەڕێ کەوتم.

دەمەو ئێوارێ بوو گەشتینە ئەستەمبولّ، کەشێکی خۆشی هەبوو، دیمەنی دەریا ئارامیەکی تەواوی بە رۆحی بنیادەم دەبەخشی.

نیازی پێشنیاری کرد: "ئەمشەو بچین کەیفێك سازکەین"

بەدەست خۆم نەبوو ڕاچەنیم، دەمزانی خۆشگوزەرانی بۆ من حەرامە کەچی ئەو دلّە خاوەن تۆپیوەم ئارەزوی شەوێکی خۆشی و رابواردنی

دەکرد.

وتم:

– لێیدە، با بڕۆین خۆ شەوێك هەر شەوێکەو نابێتە هەزار...

– چوینە دورگەی "بیوك ئادا" لەوێ کافێی گەلێ خۆشی لێیە، هەڵبەت جێگەی ئێمەمان نییە، وەلێ ئێمەش ئەو شەوە سەرو گوێلاکمان گەلێ ڕێك و پێك بوو، من جلەکانم سەرتاپا نوێ بوون نیازیش بەو بەژن و بالایەوە هەیبەتێکی تایبەتی هەبوو.

چوینە کافێکەوە، یەکی لەشاگردەکان بەڕاکردن هاتە بەردەممان.

– بفەرموون.

خۆی پێشمان کەوت بەرەو مێزێکی بردین بەسەر دەریادا دەیڕوانی، من تەواو خۆمم لێ گۆڕا بوو، خۆمم وەکو کەسێکی ناودارو بەشان و شکۆ دەهاتە بەر چاو وامدەزانی بومەتە پیاوێکی عەییار پیاو!

نیازیش هیچی لە من کەمتر نەبوو، هەردوکمان بە خۆفشینێکەوە لەو دیوی مێزەکەوە دانیشتین.

شاگردەکە چاوەڕێی داوای ئێمە بوو، بەئەدەبێکەوە لە تەنیشت مێزەکەوە وەستا بوو وتی:

– حەز لە چی دەکەن؟

ڕووم کردە نیازی هەوەکو جاران و تۆزێ جدیتر وتم:

– ژەنراڵ، چیمان بۆ بێنێ؟

نیازی ئاگای لە مەسەلە نەبوو، نەمدەزانی ئێمە لە شوێنێکی گشتیداین و ئەم ناوە خوازراوە کەسێ بەناوی ژەنراڵەوە خۆی بداتە قەڵەم کارێکی هەوانتە نییە، زۆر بە جددی بە شاگردەکەی وت:

– کوڕی باش تێکەڵەی گۆشتمان بۆ بێنە.

شاگردەکە وتی:

- قوربان... حەزتان لە چ مەشروبێکە؟

من دووبارە ڕووم کردەوە نیازی:

- حەزرەتی ژەنراڵ چی ئەمر دەفەرموون؟

نیازی ماڵکاولیش وەك ئەوەی ژەنراڵی ڕاستەقینە بێت گۆشەی برۆکانی هەڵتەکاند زۆر بەکەمتەرخەمیەوە وەك کەسێك پەرداخێ ئاوی خواردنەوە داوا بکات وتی:

- بتلێك ویسکی بێنە.

ئەمجارە شاگردەکە تەعزیمێکی هێندە خەستی کرد خەریك بوو سەری خۆی بکێشێ بە مێزەکەدا، وتی:

- بە چاوان حەزرەتی ژەنراڵ هەر ئێستە، سەهۆڵیشتان بۆ بێنم حەزرەتی ژەنراڵ؟ ئەمر دەفەرموی حەزرەتی ژەنراڵ...

شاگردەکە پاشەو پاش گەڕایەوە، هێندەی نەمابوو بدەم لە پرمەی پێکەنین، داماوە وای دەزانی نیازی بەڕاستی ژەنراڵە،با ئەوەش بڵێم ئەو سەردەمە ژەنراڵەکان زۆر بەسام و هەیبەت بوون.

شاگردەکە یەکڕاست دەچێتە لای خاوەن کافێ و بەهەژینێکەوە بۆی باس دەکات کە ژەنراڵێك هاتۆتە ئێرە؟

بە ڕێکەوت خاوەن کافێ کارێکی لە یەکێ لە فەرمانگەکانی دەوڵەت گیری خواردووەو دەمێکیشە بەدوای دەسەڵاتدارێکدا وێڵە تاکو کارەکەی بۆ مەیسەر بکات، هەرکە ئەم هەواڵە دەبیستێ واز لەهەموو کارێك دێنێ و بەڕاکردن بەرەو مێزەکەی ئێمە خۆی دەکوتێ، هێشتا پێنج شەش هەنگاوێکی مابوو بمانگاتێ بە ورگە زلەکەیەوە دەستی کرد بەمەرایی و ماستاو کردن.

- بە خێر بێی جەنابی ژەنراڵ... پیت و فەڕت هێنابێ ڕوناکت کردینەوە.

نیازی زۆر بەکەمتەرخەمیەوە سەری بۆ دەلەقاند:

– سوپاس.

پاشان ئاماژەیەکی کرد خاوەن کافێ بگەڕێتەوە سەرکاری خۆی کەچی کابرا کۆڵی نەدەدا.

– قوربان ئەمری چ خواردنێکتان فەرمووە؟

– هەرچیمان حەز لێ بووە داوامان کردووە، سوپاس هەموو شتێ هەیە، بەڵام کابرا ئەمانەی نەدەبیست بەدەوام فەرمانی بە شاگردەکان دەدا.

– کوڕە ، برۆ جگەرو دڵ بۆ جەنابی ژەنراڵ بێنە، برۆ خێراکە کەبابی بەرخ ئامادە بکە.

نیازی لەم مەرایی کردنەی کابرا زۆر ڕقی هەستا، شاگردەکەی بانگ کرد:

– وەرە بزانم کوررە.

شاگردەکە گەڕایەوە، نیازی بەخاوەن کافێکەی وت:

– من پارەکەی دەدەم یان تۆ؟

– ئەم قسانە چییە قوربان، پارەی چی؟

– سایەی جەنابت بۆ ئێمە لە ئاڵتون بەنرختره.

پاشان ڕوی کردە شاگردەکە.

– بۆ وەستاوی... گەوجە... خێراکە برۆ.

خاوەن کافێکە کە ڕوی کردە شاگردەکەو فەرمانی پێدا نیازی چاوێکی لێ داگرتو تێی گەیانم کە کابرا وادەزانێ ئێمە ملیۆنێرین.

منیش شانەکانم بۆ هەڵتەکاندو هێواش وتم:

– واز لەم قسانە بێنە خەمی چیتە دنیایەك پارەمان پێیە.

خاوەن کافێ گەڕایەوە بۆلای ئێمە:

- قوربان ئێمە هەرچیتان بۆ بکەین هێشتا کەمە، دەفەرموون "ئەترۆکاتف"ێك بێنینە خزمەتتان؟

- من هەرگیز ئەو خواردنەم نەخواردبوو کەچی نازانم بۆ لەخۆمەوە وتم:

- نا.

کابرا وتی:

- با گونی برژاوی مەڕتان بۆ بێنین؟

- نا، بابە ئەمانە چییە؟

هەرکە ئەم قسەیەم لەدەم دەرچوو نیازی بە ڕیتمێکی تایبەتەوە وتی:

- بەڕاستی ژەنراڵ زادەیت.

ئەمجارە ئاغا هاتەوە سەر من بەڕێزێکی زۆرەوە تەعزیمی بۆ کردم:

- بێگومان جەنابی ژەنراڵ زادە حەزی لە مریشکی برژاوە.

وتم:

- بەڵێ با بێت.

- شاگردەکان بەراستو چەپدا تەعزیمیان دەکرد، هەر یەکێکیان دەیانویست خزمەتێکی زیاترمان بکەن... هێندە خواردنو مەشروبیان هێنا لەسەر مێزەکە جێگەی نەدەبویەوە من بە نیازیم دەوت ژەنراڵو ئەویش بەمنی دەووت ژەنراڵ زادە.

سەرەنجام بەهەر دەردەسەریەك بوو کابرامان لە کۆڵ خۆمان کردەوە، بەڵام سێ شاگرد بەرامبەرمان وەستا بوون چاوەڕێی فەرمانەکانی ئێمەیان دەکرد، ئێمەش بێ وچان دەمانخواردەوە، دەریا دیمەنێکی نایابی هەبوو، نەوایەکی دڵڕفێن لە بڵنگۆکانەوە پەخش دەکراو ئێمەی خستبویە ژێر کاریگەریەکی بەتینەوە، نەشئەی مەستی وردە وردە خەریك بوو بەڕەگو ڕیشەماندا ڕۆ دەچوو، لەم کاتەدا ژنێك چویە سەر

ستەیج و دەستی کردە ئاواز چڕین.

ڕەنگە ئەگەر کاتێکی دیکە بوایە بنیادەم بەو دەنگەی ئەو سەر ئێشەی بگرتبایە، کەچی ئەو کاتە ئاوازی ئەو بەلای ئێمەوە نەغمەیەکی ڕۆحپەروەر بوو، خۆیشی لەبەر دیدەی ئێمە هێندە قەشەنگ بوو وامانزانی پەرییە، ئەنجا نۆبەی سەما کردن هاتە پێشەوە، چەن سەمازانێك بە لەشی نیوە ڕووت و هەوەس بزوێنەوە لەسەر ستەیج دەرکەوتن... هەموویان چاویان لەسەر ئێمە بوو، بزەی ناسك و شیرینیان بۆ دەناردین.

ئەتوت بێجگە لە ئێمە کەسی دیکە لەو کافێیە نییە، ئیلهامێك بە دڵمدا هات شتێکی خراپ ڕوو دەدات. وتم:

– ژەنراڵ، خوا ئاقیبەتی ئەم کارە بەخێر بگێڕێ.

– ئاقیبەتی کام کار؟

– ئاقیبەتی ئەم بەزم و ڕەزمەی ئەمشەومان!

– لەبەرچی، بەپارەی خۆمان ڕادەبوێرین چ عەیبێکی هەیە؟

هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا وتم:

– ژەنراڵ من تاکو ئێستا زۆرم لەمانە تاقی کردۆتەوە، هەرکاتێ کەیفەکەم ساز بێت دەزانم بە زوخاو لەکونە لوتمەوە دێتەوە دەرەوە، هەمیشە بۆ ساتێك خۆشی عومرێك ڕەنجم کێشاوە، ئەمشەو دڵم خەبەری داوە.

– دانیشە، پێدەچێ حاڵت باش نەبێ، بۆ نمونە ڕەنگە چی ڕوو بدات؟

ئەمەی وت و پێکەکەی هەڵدا، بەخۆشیت، منیش ناچار پێکەکەم هەڵدا بەخۆشیت.

نیازی چاوێکی لە یەکێ لە سەمازانەکان کە سەمای ئیسپانی دەکرد داگرت، خاوەن کافێ وەك جنۆکە کەمووی بۆ هەڵ دەکزێنن هاتە

تەنیشت مێزەکەی ئێمەوە:

– جەنابی ژەنراڵ مۆڵەت دەفەرموی بێتە سەر مێزەکەتان؟

من هێندە مەست بووم لەقسەکەی کابرا تێنەگەیشتم وامزانی داوای خواردنمان بۆ دەکات وتم:

– چیتر خواردنمان ناوێ با بتڵێك ویسکی دیکەمان بۆ بێت.

بەڵام نیازی تێگەشتبوو دەڵێ چی وتی:

– خۆی باشە، بەس لە زمانەکەی نازانم.

– جەنابی ژەنراڵ، ئەو زمانی ئێمە دەزانێ هەر خەڵکی ئێرەشە.

دوای ئەوەی سەما تەواو بوو، کابرا هێنای بۆ سەر مێزەکەی ئێمە، کە جوان دیقەتمدا زانیم هاوشاری خۆمانە، دووبارە پێکەکانمان پڕ کردو هەڵماندایەوە، پەیتا پەیتا پڕ بوو بووین نەماندەتوانی خۆمان جڵەو بکەین.

نیازی حاڵێکی سەیری هەبوو، دەتوت خۆیشی باوەڕی بەخۆی کردووە وایدەزانی بەراستی راستی ژەنراڵە، دەنگی خۆی گڕ دەکرد تاك تاك برۆکانی هەڵدەتەکاند، سەری قنج ڕادەگرت، لەپڕ بەدەنگێکی سەیرەوە ئاماژەی بۆ تیپی مۆسیقاکە کردو قیڕاندی:

– بێدەنگ بن، ئەم شتە قۆڕانە چییە دەیژەنن، خێرا سەمایەکی شاتری بژەنن.

ژەنیارەکان خێرا فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد، دانیشتوان خەریك بوو بیکەنە ژاوە ژاو، بەڵام خاوەن کافێ چپاندی بە گوێیاندا:

– ئەوە ژەنراڵە.

ئەو سەردەمە کەس جەسارەتی ئەوەی نەبوو، لەگەڵ سەربازییەکان قسە بدا بەزۆران، دەبوو بێ چەن و چوون فەرمانەکانیان جێبەجێ بکرایە.

ئێمە بێ ئاگا بووین لە هەموو شتێ نەماندەزانی بەدەستی خۆمان چ خاکێك بەسەر خۆماندا دەکەین؟

هەموو موشتەریەکان بێزار بوو بوون، مقۆ مقۆیان بوو، نەگبەتی لەوەدا بوو دوو ئەفسەر بەژن و منالەکانیانەوە لەوێ بوون.

لەم کەش و فشەی ئێمە گەلێ ناڕەحەت بوو بوون، بەڵام چونکە وایاندەزانی نیازی بەراستی ژەنراڵە قسەیان نەدەکرد.

ئۆرکستراکە ئاوازی شاتریيان دەست پێکرد و نیازی بە پەلە خۆی هەڵدایە ناوەڕاست و دەستی کرد بەسەمای شاتریی، پاشان فەرمانیدا ئاهەنگی قەساب بژەنن.

سەمایەکی کرد میزاجی هەموو لایەکی شێواند، بۆ ئەوەی پێ نەکەنن ژەنراڵ تەریق نەبێتەوە هەموو یەکە یەکە ڕایان کردە دەرەوە.

نیازی کە تەواو لە کەللەی دابوو، دەستی برد بۆ پەردەی سەر مێزەکەو ڕایکێشا هەرچی قاپ و شوشەیەکی لەسەر بوو هاڕەی کردە خوارەوەو شکا، کەچی نیازی بەسەر خۆی نەهێنا پەردەی مێزەکەی بەستە پشتی و دەستیکرد بەسەمای عەرەبی.

ئێمە کە ئاگامان لە خۆمان نەبوو، بەڵام ئەو دوو ئەفسەرەی لەوێ بوون کاسەی سەبریان سەر ڕێژ بوو بوو، تەلەفۆنیان بۆ دژبانی کردبوو.

نیازی کە لەسەما کردن ماندوو بوو هەناسەبڕکێی پێ کەوتبوو گەڕایەوە بۆ سەر مێزەکەو هاورای کرد: "ئەو حسابە بێنن" شاگردەکە ڕایکرد لای خاوەنی کافێکەو، ئاغا بەپێکەنین و مەرایی کردنەوە هاتەوە پێشەوە:

- ببورن جەنابی ژەنراڵ، عەیبە پارەی چی، من چۆن پارەتان لێ وەردەگرم؟

لەم کاتەدا فەرمانەدەی دژبان بەچەن مەئمورێکەوە خۆیان کرد

بەژووردا، ئێمە ئاگامان لە هیچ شتێ نەبوو هەر گوێشمان پێ نەدەدا.

نیازی حاڵی زۆر تێکچوو بوو، سەری خستە سەر مێزەکە، منیش چاوم لە کەشتیەك بڕی بوو بە بەردەمی "داردانێل"دا تێدەپەڕیی ئەو کەشتیە دیمەنێکی نایابی هەبوو، کەشتیەکەم نیشانی نیازیدان نیازی شەلاڵەی ئارەق بوو بوو، دەسڕەکەی دەرکرد خەریکی سڕینی ئارەقی نێوچەوان و پشتە ملی بوو، هەوەسی شعر وتن گرتی و ڕوی کردە کەشتیەکە وتی:

"ئەی کەشتی نەناسراو، بۆ هەر کوێیەك دەڕۆی منیش لەگەڵ خۆت ببە، بۆ بەندەرە نەناسراوەکان، بۆ ئەو شوێنەی بنادەمی لێ نییە".

زانیم نیازی حاڵی تەواو نییەو هەڵیت و پڵیت دەڵێت، بە شاگردەکەم وت تاکسیەك بانگ بکە تا کار لەکار نەترازاوە با لێرە بیبەمە دەرەوە.

شاگردەکە ڕۆشت، من گەڕامەوە بۆ لای نیازی ئەو هێشتا خەریك بوو شیعری دەوت و ئارەقی دەسڕیی.

ویستم قسەی لەگەڵ بکەم یەکێ لە دواوە وتی:

– ناوت چییە؟

ئاوڕم دایەوە بینیم دوو ئەفسەری دژبان لەتەنیشت مێزەکەوە وەستاوون زۆر گوێم پێنەدان ناوی خۆمم وت.

نیازی هێشتا خەریکی خواحافیزیی کردن بوو لە کەشتیەکە دەستی بۆ هەڵدەبڕی، بەئەستەم وتم:

– وریای خۆتبە.

یەکێ لەئەفسەرەکان وتی:

– ئێوە پاشای کوێن؟

ئەو کاتە بە ژەنراڵیان دەوت پاشا، نیازی بێ ئەوەی ئاوڕێك بداتەوە وتی:

- محمود پاشا، حەیدەر پاشا.

ئەمانە ناوی دوو گەڕەکی بەناو بانگی ئەستەمبوڵن، ئەفسەرەکە لەم وەڵامەی نیازی کە زیاتر لە رابواردن دەچوو زۆر ڕقی هەستا لە ژێر لێوەوە سێ چوار جنێوی تەڕو پاراوی بۆ ڕەوانە کرد، ئەنجا فەرمانیدا بە ئینزیباتەکان دەسگیرمان بکەن و بمانبەن بۆ ئینزیباتخانە.

خاوەن کافێکە تا ئەو وەختە دەستەو نەزەر وەستابوو هاتە پێشەوە بە ئەفسەرەکانی وت:

- قوربان ئەی کێ حسابەکەی ئێمە دەدات؟

کابرا کاتێ زانی ئێمە ژەنراڵ نین، پسولەیەکی ناسك و جوانی بۆمان نوسی و کە تاك مردن بیرم ناچێتەوە.

دوایی چی ڕویدا؟ چیمان وت؟ چۆن بوو؟ جوان لە بیرم نییە هەر ئەوەندە دەزانم سبەی کاتی چێشتەنگاو بەهۆش هاتمەوە نازانم خەتای مەشروبەکە بوو یان ئەو تێ هەڵدانەی شەوی پێشوو خواردبووم هەموو ئازای ئەندامم ژانی دەکرد، نێوچەوانم لە دولاوە تەقی بوو، نیازی لە من خراپتر، ئەو تەنانەت نەیدەتوانی خۆی بە پێوە ڕاگرێ.

هەر ئەوەندەی هاتینەوە سەرخۆ لیکۆڵینەوە دەستی پێکرد، لە جۆری ئەو پرسیارانەی لێکۆڵەرو ئەو هەموو کاربەدەستانە کە بە دیقەتەوە لێمان ڕامابوون دەرکم کرد مەسەلەکە زۆر قووڵ بۆتەوە هەروا هەوانتە نییە، ڕاستیەکەشی هەروا بوو.

ئەو ناوە خوازراوەی ژەنراڵ شتێکی ئەوتۆ نەبوو، بەتۆمەتی سیخوڕی کردن تاوانبار کرابوین، ڕۆژنامەکانیش هێندەیان قەوارە دابویە هەموو کەسێ وایدەزانی هەردوکمان دوو سیخوڕی ناپاکین و دەبێ بەبێ مەحکەمە کردن لە سێدارە بدرێین، کاتێ مانشێتی ڕۆژنامەکانم بینی هێندەی نەمابوو شاخم لێ دەربێت.

دوو سیخوڕی مەترسیدار کەخۆیان کردبوویە ژەنراڵی سوپا، لەکاتێکا لەسەر داردانێل لەگەڵ کەشتیەکی ڕوسی خەریکی ئاڵوگۆڕ کردنی ئامارژەو نهێنی بوون، دەسگیر کران.

وەرە ئەم کەرە لە قووڕ دەرکە، توخوا سەیرکەن قسە لەمە مەسخەرەتر دەبێ، نیازی بەدبەخت مەست بوو بەمەستی شیعری دەوت، کەچی وەرە سەیری رۆژنامەکان چ شاخ و گوێیەکیان لێ ڕواندووە.

لێکۆڵەر وەك ئەوەی من دوژمنی باوەکوشتەی بم زۆر بەگرژو مۆنیەوە پرسی:

– بۆچی دەستتان بۆ ئەو کەشتیە ڕوسیە هەڵتەکاندووە؟

– بەخوا من دەستم هەڵنەتەکاندووە نیازی بوو.

– بۆچی دەستی هەڵتەکاند؟

– خۆ ئەو نەیدەزانی ئەو کەشتیە ڕوسیە، گەر بیزانیبا وای نەدەکرد، وایزانی کەشتی خۆمانە.

– ئەگەر وایە ئەو قسانە چی بوو کە دەیوت: "ئێمەش لەگەڵ خۆت ببە بۆ بەندەرە نەناسراوەکان" بۆچی لای ئێوە ئەستەمبوڵ بەندەرێکی نەناسراوە؟

– جەناب، هاوڕێکەی من مەست بوو، ئاگای لەخۆی نەبوو چ هەڵیت و پەڵیتێك دەڵێ.

– کەسێ مەست بێت دەڕشێتەوە، نەوەك دەستی هەڵتەکێنێ!

– ئاخر هێندە حاڵی تێك نەچو بوو تاکو بڕشێتەوە.

– باشە بێجگە لەدەستی چیتری ڕادەوەشاند؟

– بەخوا هیچیتر.

– ئەی بۆچی دەڵێن ئاڵای ڕاوەشاندووەو بەداری ئاڵاکە ئامارژەیداوە؟

– نا، جەناب ئاخر ئەم ئاڵای لە کوێ بوو؟

– بەڵێ پێی بووە ئەویش ئاڵای سپی کەنیشانەی تەسلیم بوونە، چەن کەسێك بینوویانەو گەواهیشیان لەسەر داوە.

– ئاڵا نەبوو جەناب، دەسرەکەی بوو، ئەویشی رانەوەشاند گەرمای بوو ئارەقەکەی پێ دەسڕیی و خۆی باوەشێن دەکرد.

– ئەی تۆ چیت راوەشاند؟

– من هیچم ڕانەوەشاند.

– چۆن، چۆن، تۆیش شتێکت ڕاوەشاند چەن کەسێکیش تۆیان بینیوە ئاڵایەکی شینت راوەشاندووە.

بەدەست خۆم نەبوو دەنگم هەڵبڕیی و وەلامم دایەوە:

– جەناب، بەو تاریکە شەوە سەرنشینی کەشتی ڕەنگی سپی و شین چۆن لێك دەکاتەوە؟

– ئەی ئێوە لەو تاریکیەدا چۆن ئەو کەشتیەتان بینی؟

– ئاخر کەشتی لایتی هەیەو بە لایتەکانیدا زانیم کەشتیە.

– ئەو ئاڵا شینەی ڕاتدەوەشاند لە کوێیە؟

لەپڕ کەوتەوە یادم:

– جەنابی بەڕێز، ئەوە ئاڵا نەبوو، ئەوەتا بۆیناباخەکەم بوو سەیرکە ڕەنگی شینە حەتمەن با ڕایوەشاندووە.

ویڕای ئەم هەموو قسانە لێکۆڵینەوەی ئێمە چەن مانگێکی خایاند.

ئێمە پەتی سێدارەمان لە ژوور سەری خۆمانەوە هەست پێ دەکرد، ڕەهابوون لەم داوە بە هیچ جۆرێ نەبوو، تەنها ڕودانی پەرجویەك دەیتوانی دەربازمان بکات، من تەنها خەمی ئەو پارانەم بوو کە لەبانك دامنابوون.

دەمزانی بێت و بەمە بزانن کارەکە قووڵتر دەبێتەوە چونکە نەمدەتوانی شوێن و ڕێگەی ئەم هەموو پارەیە بکەمەوە کە لەکوێم هێناون.

ئاقیبەت وەکو دەڵێن چەوری ژێر ئاو ناکەوێ، قۆپیی کارەکە ئاشکرا بوو، دادگا سەنەدی پارەکەی دۆزییەوە، ئەمەش خۆی بویە گەورەترین بەڵگەی تۆمەتی سیخوڕیەکەمان.

هەرچەن تۆمەتەکەمان گەلێ گەورە بوو، بەتۆمەتی سیخوڕیی و پەیوەندی لەگەڵ بێگانەکان و ناردنی هەواڵی نهێنی تۆمەتبار کرابوین، بەڵام چونکە داوەرەکان دەیانزانی ئێمە پیاوی ئەو کارە نین شایستەی ئەم کارە پۆخڵانە نین، بەو مەرجەی باسی پارەکە دیزە بەدەرخۆنە بکەم منیان بەناوی هاوبەشی تاوان بەساڵێك زیندانی و نیازیش بەناوی تۆمەتباری سەرەکی بە چوار ساڵ زیندانی مەحکوم کرد.

لەوەی کە لەبری سێدارەو گوللەباران بکرێین بەو تۆزە ڕزگارمان بوو ئەمە شایی دەوێست، بەڵام دوای ئەوەی بردینیانە زیندانی دژبان لە سەگ زیاتر پەشێمان بوین، بریا پەنجا ساڵ لەزیندانی گشتیدا مابواینەوە نەك یەك مانگ لەو زیندانە نەبوینایە.

چونکە لە بەندیخانەی گشتیدا دامو دەزگایەکمان هەبوو ڕێزێکمان لێ دەگیرا، بەڵام لەم زیندانە نەفرەتیە ئەو شتانە نەبوو.

بەتایبەت ئێمە کە لە ناوی ژەنراڵ و ژەنراڵ زادە کەڵکی خراپمان وەرگرتبوو، زۆربەی زیندانیەکان و تەنانەت زیندانوانەکانیش بەچاوی دوژمنەوە سەیریان دەکردین.

نیازی ماڵ کاول لەوێش دەیوست پێم بڵێ ژەنراڵ زادە ئەو زمانە خاوەن تۆپیوەی منیش زۆرجاری ئەوی بە ژەنراڵ نیازی بانگ دەکرد.

وردە وردە دۆخەکە جۆرێکی لێ هات کە زۆربەی زیندانیەکان بە ژەنراڵ زادە بانگیان دەکردم ئەو ناوەم بەسەردا بڕا.

زۆر بیرم کردەوە بۆچی ئەو هەموو ناوەی هاوڕێکانم لێیان دەنام هیچیان وەکو ئەم ژەنراڵ زادەیە بەمنەوە نەچەسپا؟

دوایی دەرکم کرد مەسەلە چییە، ئەوانەی دوچاری ژێر دەستەیی و چەوسانەوە بوون لەژێر کۆت و بەندی کۆمەڵگەدا پلیشاونەتەوە حەز دەکەن کەسانی چینە باڵاکانیش لەگەڵ خۆیان ببەنە ئەو گۆماوە تاریک و ڕەشەوە.

دڵخۆشی ئەوەن ئەگەر ئەوان ئازار دەچێژن و بێبەشن چەن کەسێکی نازپەروەردەش ئەو ژیانە تاڵە دەچێژن، وادەزانن بەو شێوەیە تۆڵەیان کردۆتەوە و هەندێ لەئازارەکانیان دەدەن بە کۆڵی ئەواندا.

ناوی ژەنراڵ زادەی منیش یەکێ بوو لەو تۆڵە کردنەوانە، کاتێ ژمارەیەك لە زیندانیەکان بە ژەنراڵ زادە بانگیان دەکرد، وایان دەزانی هەر بەڕاستی ژەنراڵ زادەیەك لەنێویاندایە بەمەش دڵیان تەسکینیی دەهات.

هەروەکو بنیادەمە سیلدارو نەخۆشەکان حەز بەوە دەکەن خەڵکیش وەکو ئەوان دەردەدار بێت، ئەمانیش پێیان خۆش بوو هیچ نەبێ دووسێ نمونە لەوانە لە زینداندا بێت، هەندێجار هێندە بە ڕق و کینەوە ناوی منیان بانگ دەکرد دەترسام لەوەی دابارنە سەرم بمکوتن.

هەرچەن دەموت: "بابە وەڵلا بیللا من ژەنراڵ زادە نیم." وەلێ سوودی نەبوو.

هەر کەس دەیبردمەوە سەر ئەو پاشا و ژەنراڵە کۆن و تازانەی خۆی دەیناسین، هێندە درۆی شاخداریان بەدەم منەوە هەڵدەبەست وێنەی نەبوو، ئەم نەگبەتیە لە لایەك و بێ پارەیی لەلایەکی دیکە، بەجارێ لەبن و بێخیان دەرکێشا بووم، نەمدەزانی چارەم چییە؟ هێندە زیندانیم چەشتبوو تا ئێستا وەکو ئەمجارە سەرم لە قوڕ نەچەقی بوو.

جاران ئەگەر بەگیرفانی بەتاڵیشەوە بچومایەتە زیندانەوە بەدەر لەوەی بە ئاەزوی خۆم پارەم خەرج دەکرد و کە بەریش دەبووم بڕێك پاشەکەوتم

پێ بوو، ڕەنگە ئێستا بڵێن لە کوێ‌و چۆنت پارە پەیدا دەکرد؟ ئەمە ئیدی پیشەیەکی تایبەت بە خۆمەو نامەوێ بیدرکێنم.

تاقە جارێك لەزیندان بەربوومو پارەم پێ نەبووە ئەویش زیندانی سوپا بوو، زۆر بەزەییم بەو نیازییە داماوەدا دەهاتەوە، هەرگیز هێندە بەزەییم بەکەسدا نەهاتۆتەوە، ئەو نەگبەتە بەبێ تاوان دەبوو سێ ساڵی دیکە پاڵی لێ بداتەوە ئەویش تاکو تەنها بەبێ هاودەمێك.

بەڵام چار چییە؟ خواحافیزیەکی ساردو سڕمان لەیەکتریی کردو هاتمە دەرەوە ئەوەی لەخوا شاراوە نەبێ چۆن لە بنیادەم شاراوە دەبێ؟ هێندە حاڵم خراپ بوو ئامادە بووم هەموو کارێك بکەم.

تەڵەکە بازیی بێ، کڵاو لەسەرکردن بێ، جەردەیی... هەرچی... من سەرباری ئەو هەموو ڕەنج‌و نارەحەتییە، هەوڵم دەدا ڕاست‌و خاوێن بمێنمەوە چ قازانجێکم دەسکەوتبوو؟ لەوەش زیاتر پێم بڵێن "گێلە" ئیدی چی تێدا ماوەتەوە؟

ئەی دادو بێداد بۆچی من ئەم ماوەیە داردەستی دەستی خەڵکی بووم، لەبەر بەرژەوەندی خەڵکی لە قوڕ هەڵچەقیووم!

ئێستا کەوایە بڕیارە ڕۆژی شەممە ئازاد بکرێم‌و یەکشەممە دیسان دەسگیر بکرێمەوە ئەی بۆچی بەڕاستی دەست نەدەمە فێڵبازیی؟ بەدبەختیش لێرەدا بوو نەمدەزانی چی بکەم!! بڕیارێکی یەکلاییم دابوو، لەمەودا بەزەییم بەگەورەو بچوکدا نەیێتەوە، هەر کەسێکم بۆ هەڵکەوت کڵاوێکی ناسك‌و نازداری لەسەرکەم‌و کڵاوی هەر کەسێکیشم دەسکەوت بیفڕێنم.

یەکەم کارم ئەوە بوو پارەیەك پەیدا بکەم، دەمزانی کە فێڵبازیش پێویستی بەدەستمایە هەیە، بینادەمی بێ دەستمایە هەمیشە مایە پووچە.

هەروا بێ ئامانج و سەرگەردان لە "بی ئۆغلی" دەسوڕامەوە وەکو ڕاوچی بەشوێن نێچیردا وێڵ بووم، لەناکاو توشی یەکێ لەهاوڕێکانی قوتابخانەم بووم، ئەو ئاشنا دێرینە هەر ئەو بەصری کەتفیە بوو ئەگەر بیرتان بێت بوویە هۆی دەرکردنم لە قوتابخانەی سەربازی.

لەو ڕۆژەوەی دەرکرابووم نەمدیتبویەوە، نەمدەزانی بۆتە ئەفسەر یان نا، چ کارەیەو چ پلەیەکی هەیە؟ بەصری لە قوتابخانە قوتابیەکی ڕێك و پێك و زیرەك بوو، بەڵام مەخابن دوو زمان بوو بۆیە هیچ کەسێ خۆشی نەدەویست ئەویش چارەی کەسی نەدەویست.

بۆیە هەر کەبینیم ڕووم لێ وەرگێڕا دەمویست خۆمی لێ گێل بکەم کەچی ئەو باوەشی بۆ گرتمەوە نەیهێشت بڕۆم هاواری کرد.

– پەتاتە.

زۆرم پێ سەیر بوو، چۆن دوای تێپەڕینی ئەم هەموو ساڵە ناسیمیەوە، چونکە سەرو سیمای من زۆر گۆڕا بوو ئەو فەریدەی ئەوسا نەبووم.

وەختێ دەزانی بنیادەم سیمای، ڕەفتاری، سەرو سەکوتی، بە تێپەڕینی زەمەن دەگۆڕێ و دەبێتە شتێکی دیکە، شوێنی کارو ژیان لەو گۆڕانەدا کاریگەری بەتینی هەیە.

ئەگەر کەسێك چل ساڵ لە کتێبخانەیەکدا بەسەر بەرێت هەرچەن قەڵەوو بەخۆوە بێت پاش تێپەڕبوونی ئەو ماوەیە ڕەنگی کتێبەکان وەردەگرێ، ڕوخساری وەکو لاپەڕەکانی کتێبەکە زەرد هەڵدەگەڕێ.

هەروەها ئەو کەسانەی ساڵانێکی دوورو درێژ لەگەڵ پیاو کوژو دزو جەردە هامشۆو ڕەوتیان هەیە ئەگەر پێشتر فریشتەی ئاسمان بووبن ئەو هامشۆو ڕەوتە دەیانگۆڕێ و سەرو سەکوتیان دەخاتە سەر شێوەی ئەوانە.

منیش کە ساڵانێك ئاوی زیندانم خواردبویەوە، هەموو شتێکم وەکو پیاو خراپەکانی لێ هاتبوو، تەنانەت چاو تێبڕینی من کەسی بەرامبەری دەترساند، هەندێجار کە کە سەرو ڕیشم دەتاشی خۆیشم لە سەرو پۆتەڵاکی خۆم دەترسام.

هێندە سیمام گۆڕا بوو زۆرێك لە هاوڕێ نزیکەکانیشم نەیان دەناسیمەوە نەخوازەڵا بەصری کە هەر لەسەرەتایشەوە هێندە دانومان پێکەوە نەدەکولا، بۆیە هەڵوەستەیەکم کردو بەگەرمیەکەوە هاوارم کرد:

- بەصری، هەردوکمان باوەشمان بەیەکتردا کردو یەکتریمان ماچ کرد، بەصری چاوەکانی فرمێسکیان تێزا وتی:

- چۆنی فەرید؟

- سوپاس، باشم، تۆ چۆنی بەصری؟

هەر لەوێدا سەر پێیی کەمێ قسەمان کرد، دەمەو نیوەڕۆ بوو بەصری وتی:

- با بڕۆین جارێ شتێك بخۆین دوایی قسە دەکەین.

بە بەردەمی ڕیستۆرانەکاندا تێپەڕین، نەچوە هیچ کامێکیانەوە، تاکو لەبەردەمی ڕیستۆرانێکی دەرەجە یەکدا وەستا.. چوینە ژوورەوە. خواردنی گرانبەهای داوا کرد، شەرابمان خواردەوە، سەری قسەمان دامەزراند، من هەموو ژیانم هەر لەسیر هەتا پیواز بۆ گێڕایەوە، زۆر پێی تێکچوو نارەحەت بوو بە داخەوە سەری راوەشاند:

- کەمێکم دەبیست، لە ڕۆژنامەکاندا باسی فێڵبازیەکانی تۆم دەخوێندەوە باوەڕم نە دەکرد، دیار بوو هەموو داری ئەمو ئەو بوو لە ڕۆحت دەدراو خۆت هەرگیز ئەو کارانەت لێ نەدەوەشایەوە.

سوێندم خوارد هەموو قسەکانم ڕاستن.

- پێویست بە سوێند خواردن ناکات، بەسەرو چاوتدا دیارە

ڕاستگۆیت هەرکەس لەبری تۆ بوایە ئێستە خاوەنی لانیکەم ملیۆنێك پارە بوو، پاشان باسی قسەی جۆراو جۆرمان کرد، لەرابردوو، لەیادەوەری سەردەمی قوتابخانە، زۆر هەوڵمدا بزانم بەصری خەریکی چ کارێکە، کەچی ئەو هەر جارێ دەهاتینە سەر ئەو باسە بەلایەکی دیکەدا قسەکەی دەبرد، سەرو سیمای گەلێ شیك بوو، لەوەی کە لە ریستۆرانێکی گرانبەهادا نانمان خواردبوو دیار بوو کارو باری لە باشیدا بوو.

دوای ئەوەی نانمان خوارد، شاگردەکەی بانگ کردو پسوڵەی حسابەکەی بۆ هێنایین، بەصری لەژێرەوە لە حسابەکەی ڕوانی و وتی:

- وەستاکەت بانگ بکەم بزانم.

- شاگردەکە ڕۆیشت، بەڵام بەصری نەوەستا تاکو وەستاکەی بێت دەستی گرتم و بردمی بەرەو شوێنی چێشت لێنانەکە.

ئاشپەزو شاگردەکان کە چاویان بە ئێمە کەوت زۆر شپرزە بوون. بەصری یەکسەر چوە سەر مەنجەڵەکان سەری مەنجەڵەکانی لاداو سەیری کردن و بۆنی پێوە کردن:

- ئەمە چ پۆخڵەواتێکە؟

ئاشپەز تەواو شپرزە بوو زمانی گۆی نەدەکرد، بەئەستەم و بچڕ بچڕ شتێکی دەوت، بەصری نەڕاندی:

- مەگەر ئاگادار نەکراونەتەوە لە شارەوانیەوە لیژنەی پشکنین سەردانتان دەکات؟

لەم کاتەدا خاوەنەکەی هاتە ژوورەوە لە دورەوە تەعزیمێکی بەرز بڵندی کێشا:

- قوربان بۆ خۆت ببینە چێشتخانەکەمان هەمیشە پاکو خاوێنە.

بەصری بەتوڕییەوە نەڕاندی:

– ئاخر ئەمە کوێی پاکو خاوێنە، پاکو خاوێنی ئەمەیە؟

دەستی درێژ کردو سیسرکێکی نیشاندا بە مەتبەخەکەدا ئەمسەرو سەری بوو.

– فەرموو ئەمە نمونەکەیەتی.

ئەتوت فیل لە حەمامدا دۆزراوەتەوە، ئاشپەزو وەستاکەی چاویان دەرپەڕی بوو.

لە دڵی خۆمدا وتم جا توخوا سیسرکێك ئەم هەموو ترس و لەرزەی ئەوێ؟ بەصری بەو ڕق و تورەییەوە وتی:

– دەبێ بیکەنە راپۆرتی لیژنە.

– جەنابی پشکنەر... تکات لێ دەکەم... جەنابی حەزرەتی پشکنەر.

بەصری وەك ئەوەی جنێوی پێ بدەن هاواری کرد:

– پشکنەرو ژهرەمار، پشکنەر چ کەرێکە؟ دەبێ هەم سزا بدرێن هەم ریستۆرانەکەش دابخەن.

– قوربان، پارە بایەخێکی نییە، بەڵام ریستۆرانەکەمان دامەخەن، ئەم هەواڵە بگاتە گوێی موشتەریەکانمان زۆر خراپ بە سەرماندا دەشکێتەوە، یارمەتیمان ... بەصری نەی هێشت کابرا قسەکەی تەواو بکات وتی:

– تەلەفۆنەکەتان کوا؟

چویە لای تەلەفۆنەکەو ژمارەیەکی لێدا:

– بەڕێوەبەرایەتی دەستەی پشکنینی شارەوانیە؟

دەستی کرد بە گێڕانەوەی ڕوداوەکەو وتی با زوو زوو پشکنەرێك سەردانی ئێرە بکات، پاشان دایخستەوە بە کابرای وت:

– وادەزنی دنیا بەرەڵاخانەیە هەرچیەکتان پێ خۆش بێ بە دڵی خۆتان بکەن؟

کابرا تەواو شپرزە بوو بوو، بە ڕیتمێکی پاڕانەوەو دەستەو دامێن بوونەوە وتی:

– جەنابی پشکنەر.

بەصری قیڕاندی:

– وتم من پشکنەر نیم.

کابرا لەوە دەترسا موشتەریەکان گوێیان لە قسەکانی بێت قۆڵی بەصری گرت و بردییە پەنایەك و دەستی کرد بە چپە چپ.

پاشان هاتینە دەرەوە، کابرا تا بەردەرگا بەڕێی کردین.

بەصری لەبەر خۆیەوە هەر قسەی دەکرد من تاقەتی ئەوەم نەبوو بپرسم مەسەلە چی بوو چونکە وا تێکچوو بوو بنیادەم لێی دەتۆقا دەست وەرداتە کارو باری.

لەڕواڵەتی کارەکەدا دەرکەوت کە بەصری یەکێکە لە کاربەدستە باڵاکانی شارەوانی، دیارە لە پشکنەر گەلێ باڵاترە، ڕەنگە سەرۆکی دەستەی پشکنین بێت، یان سەرۆکی شارەوانی.

بەصری وتی:

– ئەگەر کارێکت نییە با بڕۆین بۆ نوسینگەکەی خۆم.

زیاتر واق بووم، خودایە! بازرگانە؟ نوێنەری پەرلەمانە؟ پارێزەرە؟ داوکاری گشتیە، ئەمە چ کارەیە وا نوسینگەی هەیە؟

سواری تاکسیەك بوین ڕۆشتین لەبەردەمی گوزەرێکی گەورەدا پیادە بووین.

نوسینگەکەی بەصری ژوورێکی زۆر نایاب بوو، فەرش و تاقمی دانیشتنی زۆر جوانی تێدا بوو، کچێکی ناسك و نازدار لە ژووری پێشەوە دانیشتبوو لەسکتێرەکەی دەچوو.

بەصری بە ڕیتمێکی سەرۆکانەوە لە کچەکەی پرسی:

– کەس داوای منی نەکردووە؟

کچەکە پەڕاوی یاداشتەکەی بۆ ڕاگرت.

– دوو کەس داوای دیمانەیان کرد، شەش کەس تەلەفۆنیان کرد، چوار بروسکەش هاتووە.

بەصری بروسکەکانی وەرگرت و چووین بۆ ژوورەکەی ئەو دیو، ژوورەکە زۆر نایاب بوو، من لەدڵی خۆمدا وتم: "بەخوا یەکێکە لە بازرگانە بەناو بانگەکان."

بەصری چاوێکی بە بروسکەکاندا خشاند وتی:

– سبەینێ لە ئیتالیاوە میوانم دێت.

وتم:

– میوانەکانت کێن؟

– شاندێکی چوار کەسین.

زۆر لە نوسینگە نەماینەوە هاتینە دەرەوە، بۆ هەر شوێنێکی دەچووین سواری تاکسی دەبوین.

بەصری وتی:

– هەرگیز حەزم لەوە نییە ئۆتۆمبێلی تایبەتی خۆم هەبێ.

سەرێکم بە ئاماژەی بەڵێ بۆ لەقاند.

– دەستت خۆش بێ ئۆتۆمبێلی تایبەتی دەردەسەری زۆرە، شۆفێریی کردن دەردەسەرییەو خراپ بوون و تێکچونی ئۆتۆمبێلەکەش دەردەسەریەکی دیکەیە.

– نەخێر، مەسەلەکە ئەوە نییە، لەبەر ئەوەیە من زوو لە مۆدێل بێزار دەبم، کەچی تاکسی وانییە، هەر مۆدێلکم بوێت سواری دەبم، لەراستیدا هەموو تەکسیەکان هی خۆمن هەر ڕەنگ و هەر مۆدێلێکم بوێ سوار دەبم.

ئەسڵەن لەو بەصریەی سەردەمی قوتابخانە نەدەچوو تەواو گۆڕا بوو،

شەو چووینە چەن گازینۆ بارێکەوە، خواردمانەوە رامان بوارد، لەبارێکدا سێ ژنی جوانی بیانی لامان دانیشتبوون، من بۆ چەن خولەکێ خۆمم بیر چووەوە کە من کێم و لە کوێم، بەراستی بنیادەم چەن فەرامۆشکارە.

دەمێک بوو دەمزانی خۆشی و لەزەت لە من حەرامە، دەمزانی هەرکاتێکی خۆش بەسەر بەرم خێرا لەکونە لووتم بە زوخاو دێتەوە دەرەوە بەم حاڵەش لەو چەن ساتەدا هیچم بیر نەمابوو چارەنوسی خۆمم لەبیر کردبوو.

نزیکی نیوەشەو رۆشتینەوە بۆ ماڵی خۆیان، لە ئاپارتمانێکی سێ ژووریدا لەگەڵ ژنێکی یۆنانیدا دەژیا، کاری ناو ماڵیش هەر ئەو ژنە بوو، کاتێ دەرگامان کردەوە ژنەکە هاتە رارەوەکەوە، خەواڵوو بوو بە ریتمێکی تایبەت پرسی:

- جەنابی بەصری! ئەمرۆ تەلەفۆنت کرد هیچ حاڵی نەبووم چیت دەوت! لە شارەوانی بویت! خەریکی پشکنینی کوێ بویت؟

هەردوکمان مەست بوین، بەصری پێکەنی وتی:

- دایە، قاوەیەکمان بۆ دروست بکە.

سەرم لەو مەتەڵە دەر نەدەکرد خەریك بوو شێت دەبووم:

- ئازیزم بەصری، تۆ بە چ کارێکەوە سەرقاڵیت؟

بە قاقای پێکەنینەوە وتی:

- هێشتا تێنەگەیشتوی؟

- نە بەخوا..

- هەردوکمان هاوکارەین، تەنها جیاوازیمان ئەمەیە تۆ پێشینەت هەیەو من نیمە، خۆ ئەمرۆ نیوەڕۆ نمونەم نیشاندایت مەگەر نەتبینی پێنج سەد لیرەم لەو خاوەن ریستۆرانە وەرگرت؟

– نازانم چۆن لێت وەرگرت؟

– ئەی نەچوینە ئەولاوە، ئەی ئەو چپەو سرتەیمان چی بوو؟

– بە گیانی تۆ من وامزانی کاربەدەستێکی پایە بەرزی شارەوانیت، وەك بەڕێوەبەری دەستەی پشکنینەکان.

– باشە، جیاوازی نێوان منو فێلبازێکی پێشینەدار ئەمەیە، ئەو دەچێ خۆی بە پشکنەر دەناسێنێو قوڕ بەسەریدا دەکرێ، بەڵام بینیت من چۆن ئەو دەورەم دەبینی.. من جنێویشم بە پشکنەر دەدا چونکە ئەو وایدەزانی پشکنەرم، بۆ ئەوەی هەرگیز بەخەیاڵیدا نەیەت سکاڵا لەدژم تۆمار بکات بۆ وا تێبگات هەر سکاڵایەك بەرز بکاتەوە هەر دێتەوە بەردەستی خۆم.

ئەگەر ڕاستت دەوێ ویستم دەرسێکت دا بدەم کە تۆ فێڵبازێکی خاوەن پێشینەیت.

لە سەرەتای ژیانمەوە ئەو هەموو زینداننو گرتنو کەسانی جۆر بەجۆرەم دیتبوو، هەر لە پیاو کوژو دزو فێڵبازەوە، بەڵام لە کلیکسۆنی فێڵبازیدا هیچیان وێنەی ئەو بەصریە نەبوون.

بە بەصریم وت:

– ئەگەر لە چێشتخانەکەدا ئەو سیسرکەت نەدیتبایە چیت دەکرد؟

وەك ئەوەی نوکتەیەکم کردبێ قاقایەکی هێندە قایمی لێدا ئاو لەچاوەکانی دەرپەڕین.

– مەبەست ئەمەیە هەندێ لە میوانخانەکان پاكو خاوێننو سیسرکیان تێدا نییە؟

– بەڵێ، ئەگەر شانس نەیگرێو سیسرك نەبێ چار چییە؟

بەصری دەستی برد بۆ گیرفانی چاکەتەکەی وتی:

– بنیادەم هیچ کاتێ نابێ کاری خۆی بداتە دەستی شانسو ئیقباڵ

پاشـان دەسـتی کـرد بـە گیرفـانی چـاکەتەکەیداو قوتویـەك شـقارتەی دەرهێناو نیشانیدام.

– سەیری ئەم قوتوە بکە، هەمیشە پڕە لە سیسرك، هەر ئەو کاتەی سەری مەنجەڵەکانم لادان و سەیرم کردن دوان لەمانەم لەسەر وەجاخەکە بەرەڵا کرد، ئێستا تێگەیشتی فێلبازیش ڕێ و شوێنی تایبەت بەخۆی هەیەو دەبێ بە دەرس بیخوێنیت؟ ژنەکە قاوەی بۆ هێناین خواردمانەوە تا دەمەو بەیان بەقسەو گاڵتەو گەپ ڕامان بوارد.

بەصری کاری وای کردبوو من شەرمەزار دەبووم، شەیتان ڕێی پێ نەدەبرد، بەصری دەیوت، ئەگەر تۆ بەقسەم بکەی ژیانت زامن دەکەم، قەول و قەرارمان کرد پێکەوە کار بکەین.

بۆ سبەینێ بە دوو ئۆتۆمبێلی ئاخر مۆدێلەوە گەشتینە فڕگە بۆ پێشوازی میوانە ئیتالیەکان، ئەو ئۆتۆمبێلانەمان لە نوسینگەیەك بەکرێ هێنا بوو.

من و سکرتێرەکەی لە ئۆتۆمبیلێکدا بوین و خۆیشی بەتەنها لەویتریان. کاتێ میوانەکان پیادە بوون، بەصری بەخێرهاتنی کردن، ئەوەندە زمانە فەرنسیەکەی پاراو بوو، سەرم سوڕما بوو.

منی وەك بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە پێ ناساندن و دیارە کچەکەش سکرتێر.

لە نوسینگە میوانداریەکی سەیری لێکردن، سەرەتا دوو سێ بتڵ ویسکی کرد بەگەرویاندا پاشان وتی:

– فەرموون کۆمپانیاکەمان ببینن، خۆی کەوتە پێشیانەوە، دەرگای کرچیەکانی گوزرەکەی دەکردەوە یەکی دوو سێ قسەی لەگەڵ دەکردن و ئەحواڵپرسی دەکردن ئەنجا دەرگای دادەخستەوە دەچوە شوێنێکی دیکەوە.

بە کورتی وای دەرخست ئەو گوزرە هەمووی موڵکی ئەوەو خاوەنی ئەم داموو دەزگایانە سەرجەمیان لەبەر دەستی ئەودان.

تەنانەت دووسێ دوکانی بەرگدووری تێدا بوو، ئەوانیشی نیشانی میوانەکاندا وتی ئەمانە جلو بەرگی فەرمانبەرو کرێکارەکانی خۆمان دەدوورن.

میوانەکان ماوەی دوو رۆژ لە ئەستەمبوڵ مانەوە، بەصری هێندە بەجوانی ئەو پلانەی کێشا بوو ئەو داماوانە گرێبەستێکی بازرگانی زۆر قورسیان لەگەڵ بەستو پێشەکی یەك ملیۆن لیرەیان پێدا کە کالآی بازرگانیان بۆ هەناردە بکات.

من لەگەڵ زۆر کەسی فێڵبازدا تێکەڵ بووم، هەموو یان دەکۆشن پاساوێك بۆ کارەکەیان داتاشنو ویژدانی خۆیان ئاسودە بکەن کەسی وەك ئەم بەصرەییەم نەدیبوو، به ئاشکرا شانازی دەکرد بەوەی کە خۆڵ دەکاتە چاوی خەڵکیەوە.

رۆژێکیان پێم وت:

– تۆ کە ئەو هەموو گەندەڵکاریەت ئەنجامداوە چۆنە پێوە نەبویت؟

– ئەمە هۆکاری زۆری هەیە، من کارەکانی خۆم وا ئاڵۆز دەکەم کەس سەریان لەبەر دەرناکات، هەمیشە سێ کەسی دیکەش تێوە دەگلێنم تا ئەگەر پێوە بووم چوار پێنجێك لەو مل ئەستورانەش لەگەڵ مندا بێ بەش نەبن، بۆیە کەس کاری بەکاری منەوە نییە.

هۆکارێکی دیکە ئەمەیە من هەرگیز کارێك دووجار دووبارە ناکەمەوە. بەردەوام شێوازی کارەکەم دەگۆڕم، ئەوانەی تێوە دەگلێن هەمیشە بەیەك جۆر کار دەکەن، ئەو کاتەی لە زیندانیش بەردەبن دووبارە دوای کارەکەی پێشویان دەکەونەوە.

هۆکاری سێیەمیش ئەمەیە من لە ئەوەڵەوە تاکو ئێستا هەر بەتەنیا

کارم کردووه کەسم نەکردۆتە هاوبەشی خۆم، لە وڵاتی ئێمە هێشتا پەروەردەی کۆمەڵایەتی نەگەشتۆتە ئەو ئاستەی خەڵکی کاری بە کۆمەڵ ئەنجام بدەن.

لە سەرجەم ئەو دامەزراو کۆمپانیایانەدا کەسێك نابینی سێ ساڵ بێت کار بکات، چونکە هەموویان هەر بیر لەوە دەکەنەوە چۆن چاڵ بۆ هاوبەشەکەیان هەڵکەنن، بۆیە بنیادەم ناتوانێ هیچ کارێك بە کۆمەڵ بکات، ئەویش دزیی کردنی بە کۆمەڵ، ئێوەی پێشینەداریش بۆیە تێوە دەگلێن متمانەتان بە خۆتان نییە بارو دۆخی وڵاتی خۆتان بە باشی ناناسن.

بەصری هەموو فەلسەفەی درێژی خۆی بۆ هەڵرشتم ئەنجا وتی:

- خێرا ئامادەبە با برۆین.

- بۆ کوێ؟

- بچین بۆ ئەنقەرە.

- بۆچی بچینە ئەنقەرە.

پێکەنی وتی:

- ئێستا دەزانیت چەن کاڵو کرچیت، گەوجە گیان مەگەر نازانی بنیادەم دەبێ پارە لە شوێنی پەیدا بکاو لە جێیەکی دیکە خەرجی بکات.

ئێمە دەبێ هەرچی زوترە بگەینە ئەستەمبوڵ تاکو ئەو میوانە ئیتالیانە نەتوانن بماندۆزنەوە.

بە دوو جانتا پارەوە کەوتینە ڕێ، پرسیم:

- باشە ئەم کەل‌و پەلەی نوسینگە چی لێ بەسەر دێت؟

- لێگەڕێ بابە، ئەوە پشکی سکرتێرەکەمە بەو مەرجەی ئەقڵی بخاتە گەڕ بەر لەوەی حکومەت زەوتیان بکات ئەو بیان فەوتێنێ.

مــن دەربەدەریــەکی فــرەم چەشــتووە، ئــەم شــارو ئەوشــارێکی زۆرم کردووە، وەلیٚ هەرگیز هێندەی ئەو رۆژە خەگین نەبووم.

حــەزم نــەدەکرد ئەســتەمبولٚ بــەجێ بــێلٚم، دلٚــم دەیــوت تووشــی نەهامەتییەکی دیکە دبمەوە.

بەلاٚم چارە نەبوو لەکاتێکا سەرم لیٚ شێوا بوو نەمدەزانی بەصری چۆن ڕەفتارم لەگەلٚ دەکات، سواری شەمەندەفەر بووین و بەرەو ئەنقەرە بەڕیٚ کەوتین.

لەبـەر پەنجـەرەی شـەمەندەفەرەکە وەسـتا بـووم، لـەدەرەوەم دەڕوانـی و نوورقمی دەریای خەیالٚ بووم.

پـێش هـات و کارەسـاتی ڕابـردوو وەکـو دارتێلـەکان بـەخێرایی بـە بەرچاومدا تێدەپەڕین، لە دلٚی خۆمدا وتم:

" تــۆ کەســێکی پێــشینەداریت، ڕێگــەی دەربازبونــت نییــە، هــەموو ڕێگاکان بە ڕوی تۆدا داخراون، تاکە ڕێگەی کراوە تەنها زیندانە. "

بڕیارمدا خۆ بدەم بەدەم ئاوەکەوە، چیتر نەمدەویست بیٚ ئامـانج خۆم ماندو بکەم و پێچەوانەی ئاڕاستەی لافاو پەلو بالٚ بکوتم.

هیچ باوەڕێکم بە قەزاو قەدەر نییـە، نـازانم بۆچـی ژیـانم هێنـدە سـەیرو سەمەرەیە و جلٚەوی هیچ کارێك بەدەست خۆمەوە نییە.

بەصری پلانە نوێیەکەی خۆی پیٚ وتم، فێلێکی پڕ مەترسیی بوو گیانم دەلەرزی، ئەگەر لەبەر تەماکاریی ئەو پشکە نەبوایە کە دەیویـست بیـدات بەمن هەر لەوێدا لێـی جودا دەبومـەوە بەدوای کـاری خۆمدەکەوتم، بـەلاٚم چاوی تەماح پڕ نابێتەوە هەر ئەوەشە زۆر کەسی بەدبەخت کردووە، ئـەو پلانـەی بەصـری داڕشـتبوو داهـاتێکی زەقـی هـەبوو زوو پێـی دەبوومـە ملیۆنێرو ئەو خەونە دێرینەم دەهاتە دی.

هەر کە گەیشتینە ئەنقەرە بەصری وتی:

- دەبێ بەپەلە دەسبەکار بین.

- بابە دوو سێ ڕۆژ مۆڵەت بدە هەناسەیەك بدەین.

- نا، گیانەکەم کات زێڕە، نابێ فرسەت لەکیس بدەین، ئەو کارە نوێیەی دەستمان پێ کردبوو گەلێ مەترسیدار بوو،"چاپکردنی پارە!!"

ترس و بیمێکی بە تین؟ هەقی خۆتانە، بەڕاستی کارێکی گاڵتە نییە.

ئەگەر بنیادەم پێوە بێت..تەوقی عەزازیل دەکەنە گەردنی بەلایەکی بەسەر دێنن حەوت پشتی دێننە بەرچاوی.

جا خۆتان چاك بیری لێ بکەنەوە منی بێچارە کە دەبوو ئەو پیلانە بڤەیە بخەمە گەڕ چ حاڵێکم هەبوو؟ دوو سێ کەڕەت نزیك بوو دەسبەردار ببم، بڕۆم بەشوێن کارێکی دیکەدا، خۆ تیکە نانێك قات نەبووە! وەلێ دیسان ئەم تەماحە نەفرەتیە نەی هێشت پەشێمان ببمەوە.

بەصری بە خێرایی کەرەسەی کارەکەی ئامادە کرد، مەکینەی چاپ و ڕەنگی پێویست و ئامرازی پێویست، هەمووی کڕی و خانویەکی دورە دەستی لە دەرەوەی ئەنقەرە بە کرێ گرت.

ئەم خانووە لەنزیکی ڕێگەی هێڵی شەمەندەفەر بوو، دوو وێستگە لە ئەنقەرەوە مەوداکەی دوور بوو، هەموو شتێك بە پێی نەخشەیەکی ورد ئەنجام دەدرا.

کاتێ مەکینەو ئامێرەکانمان بردە خانوەکەو کارە سەرەکیەکەمان دەستی پێ کرد... بەڕاستی وا نەزانن کە دەمانویست پارە چاپ بکەین نا، ئەوە کارێکی زۆر سەختە زەحمەتێکی فرەی هەیەو کاری هەموو کەسێك نییە، پلانەکەمان لەمە ئاسانترو بێ دەردەسەریتر بوو.

بۆ بەیانی بەصری چوە لای سەڕافێکی گەورە کە یەکێ بوو لە جولەکەکانی ئەنقەرەو پیاوێکی خاوەن پارەو ناسراو، ئەسکەناسێکی پێنج هەزار لیرەیی نیشانداو پێی وت:

- ببورە دەکرێ ئەمەمان بۆ ورد بکەیتەوە، ئەو ماڵوێرانە دەسبەجێ قاسەکەی کردەوە پارەکەی ورد کردەوە.

دەمەو نیوەرۆ دیسان رۆشتەوە بۆ هەمان شوێن و ئەمجارە ئەسکەناسێکی هەزار لیرەیی پێدا.

- زۆر ببورە، ئەمەش ورد بکەرەوە هەقی زەحمەتەکەی خۆتی لێ هەڵگرە.

کابرای جولەکە بە بیستنی هەقی زەحمەت دەمی ئاوی کرد، پێکەنینێکی وەهای کرد هەموو ددانە ڕزیوەکانی دەرکەوتن.

- تکا دەکەم، ئەم قسانە چییە؟

چونکە جاری پێشوو سەرنجی دابوو کە بەصری پارەکەی هەژمار نەکرد هەروا خستیە گیرفانیەوە بە ئومێدی ئەوەی کورە حاجیەکی دەسکەوتووە، لە جیاتی هەزار لیرە نۆسەد لیرەی بۆ هەژمار کردو دایە دەستی.

- بفەرموو قوربان.

بەصری دووبارە هەژماری نەکردو خستیە گیرفانی و سوپاسی کرد.

- سوپاست دەکەم.

ئێوارە دووبارە چووەوە لای کابرای جولەکەو ئەسکەناسێکی سەد لیرەیی پێدا.

- کاکە ببورە توخوا ئەمەش...

- تکا دەکەم براکەم، ئەمە کاری خۆمانە

- رۆژی دە کەڕەت تەشریف بێنن کێشەمان نییە.

کابرا ئەمجارەیان هەشتا لیرەی هەژمار کردو دایبە بەصری.

سەعات هەشت و نۆی شەو کە وەختی داخستنی دوکان و گوزەر بوو.

دووبارە بەصری رۆشتوە بۆ لای، سەڕاف کەئەم موشتەرییە گەوجەی

بینی پێکەنی:

– ئەمر فەرموو؟

بەصری لە کاتێکا وای دەردەخست ترسی لەشتێك هەیە، سەیرێکی دەورو بەری خۆی کرد پاشان سەری لیَ بردە پێشەوە بە ئەستەم پێی وت:

– ئەو پارانەی بەتۆمداوە ساختە بوون.

وەك بە کوتەك بکێشریَ بەسەری کابرای سەڕافدا، وا راچڵەکی هیچی نەمابوو سەکتە بکات.

– چی کاکە؟ راست دەفەرموون؟

– بەڵیَ.

سەڕاف خەریك بوو هاوار بکاتو کارەکە قۆڕ بێت.

بەصری زۆر هێمنو لەسەرخۆ وتی:

– کاکە، ئابڕومان مەبە من بۆیە هاتومەتەوە پارەی ئەسڵت پیَ بدەم ئەوانەی دیکەت لیَ وەربگرمەوە، فەرموو.

خێرا سیَ هەزار لیرەی دەرهێناو خستیە سەر مێزەکەی.

کابرای جولەکە، کەدەستو پێی وەکو داربی دەلەرزی هەستی دەکرد ئەم کاسیە بیَ ژێر کاسە نییە، نەکا ئەم موشتەرییە بیەویَ کڵاوی بکاتە سەر، دڕودۆنگ بوو لە کردنەوەی قاسەکەی، ئیدی نەیدەزانی کە بەصری گەلیَ لەو زۆڵترو سەگو سەگبابترە.

بەصری کەمیَ کشایەوە بۆ دواوە وتی:

– کاکە ئەم پارەیە با لەخزمەتی تۆدا بێت، تۆ لە دەرفەتێکی دیکەدا پارەکەی من بدۆزەوەو بیخەرە لاوە، سبەی دێمو وەریدەگرمەوە، بەڵام تکا دەکەم لەبەر خۆیشت بێت لای پۆلیسو کەسیتر باسی مەکە، ئەگینا خۆت تێوە دەگلێیت.

بەصری ڕۆشت و کابرای سەڕاف تا نیوەشەو ئەو پارانەی ئەو ڕۆژە لەخەڵکی وەرگرتبوون هەمووی خستە ژێر زەرەبینەوەو دیقەتی دان بەڵام نەیتوانی پارە ساختەکان بدۆزێتەوە.

بەصری بەیانی زوو دیسان ڕۆشتەوە:

– کاکە پارەکانت دۆزینەوە؟

– نەخێر، نەمتوانی.

بەصری پێکەنی وتی:

– دەمزانی کە بۆت نادۆزرێتەوە، نەك هەر تۆ گرەوی لەسەر دەکەم هەموو پسپۆڕەکانی دنیا ناتوانن لە نێو ئەو پارانەی من چاپیان دەکەم لەگەڵ پارە ئەسڵیەکاندا لێکیان بکەنەوە، بەو مەرجەی لای هیچ کەسێك باسی نەکەیت شتەکە لەنێوان خۆماندا بێت، من ئامادەم مانگانە سەد هەزار لیرەی لەمجۆرەت بۆ بێنم.

کابرا وایدەزانی ئیزرائیل هاتۆتە سەری تاکو ڕۆحی بکێشێ، مات و مەلول پاڵی دابوو بەنیشتۆکەکەوەو گوێی لە قسەکانی بەصری دەگرت، هێشتا نەیدەوانی باوەڕ بە ڕاستی ئەو قسانە بکات.

بەصری بۆ ئەوەی گورزی دووەم بوەشێنێ و دووم بەشی پلانەکە جێبەجێ بکات وتی:

– هەر ئێستا هەستەو وەرە با بچین بۆ کارگەکەم، لەو پارە چاپکراوانە چەندەت پێخۆش بوو بیهێنەو بە وردی تاقییان بکەرەوە ئەگەر قسەکەم ڕاست دەرچوو ئەوا مامەڵەی لەسەر دەکەین.

بەصری و کابرای جولەکە هاتن بۆ کارگە، من لەوێ وەکو کرێکارێکی هونەری خەریکی کارکردن بووم.

لە یەکێ لە ژوورەکانی پشتەوە مەکینە چاپکردنەکەمان دانا بوو، پارەیەکی کاغەزی زرۆیشمان بە پرژو بڵاوە پێکراویی لە سەر تاق و لە

زەیدا هەڵرشتبوو.

بەصری منی پێ ناساندو پارەکانی نیشانی کابرای سەڕاف دا.

– هەر کامێکیانت دەوێ بیبەو تاقی بکەرەوە.

کابرا چەن پارەیەکی لەوردو درشت هەڵگرت و ڕۆشت.

سەڕاف بەو مەرجە بەو مامەڵەیە قایل بوو ئێمە هەموو پارەکان لە ماڵەوە هەژمار بکەین و بۆی هەنارده بکەین، پاشان ئەو پارەکەی خۆی لەکاتی گەڕانەوە لە شەمەندەفەردا بدات بەئێمە.

بەصری بەم مەرجە قایل بوو، ئێمە دەبوو سەد هەزار لیرە لە پارانەی کە دەمانوت خۆمان چاپمان کردوون هەر بەڕاسیش پارەی ئەسڵی بوون بیدەین و پەنجا هەزار لیرە لە کابرای سەرراف وەرگرین.

دیارە سەیرە بەلاتانەوە، مانای چی؟ مەگەر ئێمە مێشکی کەرمان خواردبوو، بەڵام کەمێ خۆتان بگرن تاکو نەخشە ئەسڵیەکەتان بۆ ئاشکرا بکەم.

بڕیاری ئێمە ئەوە بوو کاتێ من لە شەمەندەفەرەکەدا پارەکە وەردەگرم لە وێستگەی یەکەمدا پیادە بمو یەکڕاست بچمە فڕگەو لەوێ چاوەڕێی بەصری بکەم.

کارەکەی بەصریش ئەمە بوو دوای بەڕێکەوتنی شەمەندەفەرەکە تەلەفۆن بۆ وێستگەکەی دیکە بکاو پۆلیسی هێڵی ئاسن تێبگەێنێ کە جانتاکەی بە بڕی سەد هەزار لیرەوە لە فلانە واگۆن لێ بەجێ ماوە بە پێدانی ناونیشانی ورد پێیان بڵێت دەست بەسەر ئەو جانتایەدا بگرن تاکو خۆی دەگاتە جێ.

نەخشەکە تەواو ڕێك و پێك بوو، دڵنیا بوین ئەو کاتەی پۆلیس بچێتە واگۆنی کابرای سەڕافەوەو لێی بپرسێت کێ خاوەنی ئەم جانتایەیە، کابرای سەڕاف لەترسی ئەوەی پارەکان ساختەن خۆی لە گێلیی و

نەبانی دەدات.

بەمجۆرەش بە چەقەنەیەك دەبوینە خاوەنی پەنجا هەزار لیرەو دەتوانین بە ئاسانی ڕوو بکەینە یەکێ لەوڵاتانی دراوسێ و لەوێش شانسی خۆمان تاقی بکەینەوە.

سەڕاف هاتە ماڵەوە، بەصری سەد هەزار لیرەی خستە جانتایەك. لەبەرچاوی کابرا هەژمارمان کردو دامانە دەستی.

منیش لەگەڵ کابرای سەڕاف چووم سواری شەمەندەفەر بووم تاکو پەنجا هەزار لیرەکەی لێ وەربگرم.

لە شەمەندەفەرەکەدا کوڕی کابرای سەڕاف چاوەڕێی دەکردین، جانتایەکی دایە دەستم کە پەنجا هەزار لیرەی تێدا بوو، پارەکانم بە دیقەتەوە هەژمار کرد، پەنجا هەزار لیرەی تەواو بوو.

بەم شێوەیە بە دڵنیاییەوە چوومە دەرەوە.

لە وێستگەکەی دواتر پیادە بووم، چەن هەنگاوێ ڕۆشتم دەستی قورسی کەسێك لەسەر شانەکانم دانران، ئاوڕم دایەوە پۆلیس بوو.

وتی:

– بەدوای مندا وەرە.

ترسام بەڵام زۆرنا! لەدڵی خۆمدا وتم: "ئەمجارەیان لەهەڵەدایت!"

لە ژووری نوسینگەی پۆلیس دوای لێکۆڵینەوەیەکی کورت جانتاکەیان کردەوە.

ئەفسەری پۆلیس وتی:

– فێڵ مەکە، ڕاستی بڵێ، ئەم پارانەت لە کوێ هێناون؟ ئەمانە پارەی ساختەن...!

قەڵەمی دەست و پێم شکاو زمانم لاڵ بوو، تازە تێگەیشتم کابرای سەڕاف چەن کڵاوێکی نازداری لەسەر ناوین، دوای ئەوەی من پیادە

دەبم ئـەویش پیـادە دەبـێ و جانتـا پارەکـەش دەبـات، بەصـریش هیـچی دەسگیر نەبوبو.

برایان! لەخۆڕا پێم پێ مەکەنن بەپەرۆشیش مـەبن بـۆم، خۆیشم نـازانم چ ناوێکی لێ بنێم: قیسمەت، چارەنوس، یان هەر ژەهرە مارێکی دیکە؟

وەلێ، هەرچی بێ ئەمجارەیان هیچ کەسی بە خـەتابار نـازانم، ئـەمجارە نەبوومــە داردەســتی هــیچ کەســێ، لەســەر هــیچ کەســێکیش ناچــمە زینـدانـەوە، دەچـم سـزای کـارە خراپـەکانی خـۆم وەردەگـرم، سـزای ئـەو فێڵبازییـەی بەدەسـتی ئەنقەسـت دەمویـست ئـەنجامی بـدەم، هـەر بۆیـە بێگومـان لـەوەی ئـەمجارە زینـدانی کـردنم زۆر دەخـاێنـێ و بـە پێـچەوانەی جارانەوە چونکە بێ خەتا زیندانی دەکرام زوو بەرەڵا دەبووم.

ئەمجارە بەخەیاڵی ئاسودەوە دەبێ پاڵی لێ بدەمەوە ئەگـەر دادگـایش زۆرخـاترم بگـرێ بیـست سـاڵ کـەمتر نـادات بەکۆڵمـدا تـا بیـست سـاڵی دیکەش خوا دەمێنێ و موڵکی.

ڕەنگـە قیـسمەت جـارێکی دیکـە رۆژێـك هـەوای دەرەوەی زینـدانم پـێ هەڵمژێتەوە، ڕەنگە بمێـنم دووبـارە شـاهێدی کارەسـات و ڕوداوی سـەیرو سەمەرەتر بم کێ دەزانێ چارەنوسی چییە؟!

کۆتـایی........



# AZIZ NESIN

## TRANSLATED BY KAMIL MHAMMAD

هەندێ جار وا بیر ئەکەمەوە مرۆڤ لە ڕێڕەوی ژیانیدا تەنها
ڕۆڵ دەگێڕێ، دەنا هیچ کاریگەرییەکی نییە.
بزانە چەندین جار بەرنامە دا ئەڕێژین
کەچی ژیان بەپێچەوانەوە ئەڕوات.
ڕۆمانی گێلە پیاو ڕاستی ئەو قسەیە ئەسەلمێنێ
چونکە تەماشا دەکەی ڕەوڕەوەی ژیانی کەسێك
تەنها بەخواردنی چەن کەبابێك،
یان پۆشینی دەستیك جل بەتەواوی پێچەوانە دەبێتەوە
ئیدی تا کۆتایی تەمەن باجی ئەو هەڵەیە ئەدات.

بەرگ: ابراهیم صالح

نرخی ( ٥٠٠٠ ) دینارە

خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوار چرا
سلێمانی سەرەتای شەقامی مەولەوی
فەرعی سەعید تەها کۆیی
٠٧٥٠١١٢٨٣٨٨ - ٠٧٧٠١٥٧٥٠٦٧
Ktebxanai chwarchra